# گوارەی کوردەواری

## پەند و قسەی پیشینیان

امثال و حکم کُردی

دکتر علی رُخزادی

# گوارەی کوردەواری

## پەندی پێشینان

## امثال و حکم کُردی

دکتر علی رُخزادی
استاد دانشگاه

انتشارات کُردستان
سنندج - ۱۳۸۵

رخزادی، علی، ۱۳۲٤ _
گوارەی کوردەواری (پەند و قسەی نەستەق): امثال و حکم کردی / تألیف: علی رخزادی _ سنندج: علی رخزادی، ۱۳۸۱.
٤۳٤ص.
ISBN: 964 - 06 - 1707 - 5
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
ص.ع. به انگلیسی:
Gwara-i kordawari
Kurdish proverbs
کردی _ فارسی.
۱. ضرب‌المثلهای کردی. ۲. ضرب‌المثلهای ایرانی. الف. عنوان. ب. عنوان: امثال و حکم کردی.
PIR۳۲٥٦آ۲٥ر۳ ۳۹۸/۹۹۱٥۹
کتابخانه ملی ایران ۱۹۱۱٦ _ ۸۱ م

**انتشارات کردستان**
سنندج، پاساژ عزتی ☎ ۲۲۶۵۳۸۲

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | گوارەی کوردەواری (امثال و حکم کردی) |
| ✓ دانراوی (تألیف): | دکتر علی رُخزادی |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | دورهەم (دوم)؛ ۱۳۸۵ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۳۰۰۰ دانه ( جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۴۳۶ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | انتشارات کردستان با همکاری مؤلف |

شابک: ۵ _ ۱۷۰۷ _ ۰۶ _ ۹۶۴
ISBN: 964 - 06 - 1707 - 5

نرخی:
۳۶۰۰ تمەنە

# پێرست

**پێشکەشە بە :**

- زمان وئەدەبی مێژینە و دەوڵەمەند وپاراوی میللەتی کورد.
- پێشینانمان کە ئەم پەند وقسە نەستەقە بەنرخانەیان بۆبەجێ هێشتوین و ئێمەش پێی ئـەژین و وەکـوو گـوارەیـەک لەگـوێماندایـە و لاپـەرەیەکـە لە نـاسنامەی میللەتەکەمان لەم جیهانە بەرینەدا.
- امیرامجد، اسعد، افشین ودایکیان کەیاریگەر وهاندەری من بوون بۆپێک هێنان و ئاراستەکردنی ((گوارەی کوردەواری)).
- ((تۆ)) خوێنەری ئازیزی کوردزمان کە ئەگەرچی ناوت نازانم، بەڵام ئـەت نـاسم، چونکە لە بنچینەیەکین وخوێن و هەست وئەوینمان یەکە.

لەنـــێو دەریـــای مـــەندی ژیـــندا
لە ســـەر لووتـــکـــەی ئـــاگریندا
لە ئـــاسمانی بـــــەرز وشـــیندا

لە خـــۆرهەڵات تـــا خـــۆرنشین
لە بـــاکـــوور و بـــاشـــووری ژیـــن
بـــــە دەنگـــێکی پـــڕلـــەئەوین

دەچـــریکێنین مـــیللەتی کـــورد
مـــیللەتێکی مـــێژینە وگـــــورد
ئـــاڵای دۆســتی بـــە دەست وبـــرد

هـــەڵی ئـــەدەین پـــیر وجـــــوان
لە ســـەر هـــەورازی کـــوردستان
پـــێشکەش بـــە خـــاکـی نیشتمان

## سەرەتا

خوێنەری بەرێز!

ئەوەی لەم دەفتەرەدا وەبەرچاو دەکەوێ،کۆمەڵێک پەندومەسیلەوقسەی نەستەقی مێژینەی کوردەواری‌یە کە بەرهەمی چەندین ساڵ هەوڵ و تەقالای نووسەرە و چەند تایبەت‌مەندی‌یەکی تێدابەدی ئەکرێ :

١ـ ئەم کۆمەڵەپەندانە کەبریتین لە (٢٦٦٣)دانە، هەموو پەندو قسە نەستەقەکانی زمانی کوردی بەتەواوی نین، چونکە بەدەس هێنانی هەموو پەندەکانی یەک زمان نەکاری یەک کەسەو نەلەچەندساڵی کورتی تەمەنی یەک کەسیش دا کۆئەبێتەوە؛ کەوابوو ئەوەی لەم بوارەدا بەدەس دێ، بێ ئەوەی ماتڵ بکرێ‌و لە بیرەوەبچێ ئەبێ وەکوو ئەرکێکی فەرهەنگی نەتەوایەتی بۆلەچاپ دانی هەوڵ بدرێ. جا لەسەر ئەوباوەرە، نووسەر ئەم پەندانەی لەچاپ داوپێشکەشی فەرهەنگی کوردەواری کرد وهیوادارەلە داهاتوودا کەسانێکی‌تر ئەم ڕێگە درێژەپێ بدەن.

٢ـ هەندێ لەم پەندانە بە زاراوەی سنەیی واتە ئەردەڵانی‌یە، لەحاڵێکدا لە ناوچەکانی‌تری کوردستانیش دا بەکارئەبرێ وئەگەر کورتە جیاوازی‌یەکیان لە بەین‌دابێ، هەوڵمان داوە هەر لەو بەشەداشیوازەکانی تریش ئەگەر زۆر بەرچاوبن، بیاننووسین.

٣ـ پەندەکان لە پێشدا بە زمانی ساکارو ئاسایی ناوچەیی نووسراوەو دوای ئەوە

وەرگێراوی ئازاد یا وشە بە وشەی فارسی پەندەکان هاتووە ؛ ئەوسا مانایاجێگەی بەکار هێنانی پەندەکان بە زمانی یەکگرتووی کوردی نووسراوە.

٤ـ ئەگەر پەندێ یا قسەیەکی نەستەق لەحیکایەتێ یان لەسەرگوزەشتەیەک وەرگیرابێ، تا ئەوجێگایە توانیێتمان حیکایەتەکەشمان کەسەرچاوکەی ئەو پەندەیە،بەزمانی ساکار نووسیوە.

٥ـ ئەگەر لەنێو قسەو پەندێکدا وشەیەکی نەناسراو یان کۆن هاتبێ، مانای ئەو وشەمان نووسیوە تاخوێنەر زوو لەو قسەو پەندە تێبگا.

٦ـ لە وەرگێرانی قسەو پەندەکان بۆ سەر زمانی فارسی، بیری نووسەر بە لای تێ گەیشتنی خوێنەرەوە بووە،هەر لەبەر ئەوە زۆربەی وەرگێراوەکە بە شێوازی ئازاد ئاراستە کراوەو وەرگێرانی وشە بە وشە بە دەگمەن هاتوە.

٧ـ نووسینی قسەو پەندەکان بە شێوازی لاتین واتە((فۆنتیک)) ئەگەرچی لە بەرنامەی کاردا بوو،بەڵام بۆئەوەی هەموو نیشانەکانی زمانەوانی بەوچەشنە وا دڵخوازی نووسەر بوو، دەس‌نەدەکەوت، لە لایەکی تریشەوە ئەنجامی کارەکەی دوور ئەخستەوە،دەسمان لێ هەڵگرت.

٨ـ هەندێ لە قسەو پەندەکان بە هۆی جێگەبەجێگەبوونی وشەکانەوەو لە روانگەی پیتی ئەوەڵی پەندەکەوە لە چەن پیت‌دا دووپات و بەڵکوو سێ‌پات بووەتەوە و ئەمە کارێکی ئاسایی‌یەو پێوەندی هەیە بە چۆن بەکارهێنانی ئەو پەندانە لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستانەوەو چەن پات کردنەوەیان پێویستە تا لە هەموو ناوچەکاندا کەڵکیان لێ وەربگیردرێ.

٩ـ وا دەرئەکەوێ هەندێ قسەو پەند لەوانەی کە لێرەدا نووسراون، لە زمانەکانی تریشدا بێ، وە تایبەتی بە زمانی کوردی‌یەوە نەبێ ؛ ئەمانە ئەو پەندانەن کە پێیان ئەوترێ: ((مەسەلی سایر)) واتە: ((مەسیلە یا پەندی گەردان)) و بێ‌سنوورن و پەندی گشتی بنەماڵەی ئینسانن وئەڵقەی پێوەندی نەتەوەکانن.

١٠ـ بە پێویستی ئەزانم، لەو کەسانەی ناو ببەم کە پێشتر لە من لەم بوارەدا زەحمەت یان

کێشاوە و من بەرهەمەکانیانم دیوەو تا رادەیەک کەڵکم لێیان وەرگرتووە و بەم وەسیلە رێز و پێزانینی خۆمیان پێشکەش دەکەم.
- «مەسەڵ گەڵ کوردی»: خوا لێ خۆش بوو حەزرەتی ئایەتوڵڵا شێخ محەممەدی مەردۆخی کوردستانی.
- «پەندی پێشینان»: خوا لێ خۆش بوو شێخ محەممەدی خاڵ
- «پەندی پێشینیان»: ج١، مامۆستا عبدالحمید حیرت سجادی
- «امثال و حکم کردی»: مامۆستا فەتتاحی قاضی.

هەروەها سوپاسی خوێندکارانی دوو مەرکەزی پەروەردەی مامۆستایانی سنە (سنندج) دەکەم لە ساڵەکانی ١٣٦٣ تا ١٣٧٢ی هەتاوی‌دا.

بێ گومان کەسانێ کی تریش لەم بوارەدا زەحمەتیان کێشاوەوکارەکانیان لە چاپ دراوە، بەڵام من ئەوانەم نەدیوەو بۆ زەحمەتەکانیان رێز دادەنێم.

لەدوایی دا هیوادارم ئەوکەسانەی وابۆ زیندووکردنەوەو گەشەپێدانی فەرهەنگ وئەدەب و زمانی نەتەوەکەیان بە دڵسۆزی وهەستی بەرپرسی هەنگاو هەڵئەگرن وتێئەکۆشن،لە پێناوی ئەنجامی ئەو ئەرکە گرینگەدا سەرکەوتوو بن.

علی رُخزادی
سنە ـ گەلاوێژی ١٣٨١ ی هەتاوی

**ضرب المثل:**

- بازتاب لحظه‌های حسّاس اندیشهٔ انسانهادر موقعیّتهای گوناگون است.
- بیانگر چگونه‌اندیشیدن افراد است.
- دریچه‌ای به‌سوی دنیای درون آحاد ملّتهاست.
- عکس‌العمل نهایی تلخ‌کامیهایا شیرین‌کامیهای آنات انسانهاست.
-گاهی طنزی گزنده است واصلاحگر.
-گاهی هجوی است تحقیرآمیز.
-گاهی فکاهه است وطیبت‌افزا.
- بستر تجلّی عواطف و احساسات مثبت یا منفی افراد وملّتهاست.
- جمله‌ای موجز غیر مخلّ است با محتوایی غنی وپیامی سریع، که جایگزین عباراتی مملّ شده‌است.

اگرچه ماامروز گویندگان ضرب‌المثلهارا نمی‌شناسیم، ولی نسبت به‌مثلهاکه‌یادگار گذشتگان ناشناختهٔ ماهستند، احساس اُنس می‌کنیم زیرایک مجموعه پیامهای آشنااند که‌باورها وآداب‌و رسوم وبرخوردهای اجتماعی نیاکان مارا به‌ما منتقل می‌کنند.این پیامهاچه شیرین‌و چه تلخ، چه‌زشت یازیبا، برای ما دوست داشتنی ودر فرهنگ مابه حکم ضرورت، ماندگارهستند.

پیامهای متنوّع این جمله‌های کوتاه‌وپرمغز عبارتنداز:

پیروزی وکامیابی، شکست وناکامی، جشن وشادمانی، عزا وماتم، تب وتابهای اجتماعی، گوشه‌نشینی وعزلت، خوش‌بینی، بدبینی، بی باکی وگستاخی، ترس وجبن، عشق، نفرت، رفاه‌وآسایش، تنگدستی ورنج، بیگانه‌نوازی، بیگانه‌ستیزی، و...

اگر چه مفهوم تعدادی از این پیامها نامیمون وتلخ اند، وبا موازین ومعیارهای

اخلاقی واجتماعی این روزگار سازگاری ندارند ونمی توانند درس زندگی امروزیان باشند، بااین همه به‌عنوان بازتابهای تفکّرواندیشهٔ دیروزیان در آنات وموقعیّتهای گوناگون زندگی آنان قابل توجّه ودرخور اعتنااند.

## ▣ ویژگیهای لفظی و معنایی ضرب‌المثلها

### الف ـ ویژگیهای لفظی یا صوری

۱ـ عباراتی کوتاه‌اند.

۲ـ مثلهابابی‌فعل اند، یا در هر مثل یک تا دو فعل وجود دارد وبه ندرت سه فعل و بیشتر دیده می‌شود.

۳ـ گاهی فعل اوّل یا دوم به قرینهٔ فعل دیگرحذف شده‌است.

۴ـ الفاظ بیشتر مثلها گفتاری ونزدیک به‌فهم عامّه‌است.

۵ـ در ساختار عبارات معدودی از مثلها لفظهای نازل ودوراز ادب نوشتاری به کار رفته است.

۶ـ پاره‌ای واژگان کهن ـ به‌نسبت روزگار ما ـ در ساخت عبارات وجوددارد.

۷ـ دور از تعقید لفظی اند.

۸ـ گاهی بابرخورداری از کلمات مسجّع، موزون اند.

### ب ـ ویژگیهای معنایی یا محتوایی

۱ـ بار معنایی آنها غنی است.

۲ـ بیانگر باورهای فردی یا قومی اند.

۳ـ منعکس کنندهٔ آداب ورسوم اجتماعی افراد واقوام در ادوارگذشته‌اند.

۴ـ از واژگان صریح وبدون ابهام برای انتقال سریع مفاهیم استفاده شده‌است.

۵ـ دور از تعقید معنوی اند.

۶ـ گاهی توأم با چاشنی صنایع معنوی اند.
۷ـ غالب آنهامستقیم یاغیر مستقیم پندآموزاند.

## ▣ رابطهٔ ضرب المثلها با شاخه‌های گوناگون علوم

ضرب‌المثلهارا می‌توان میدان مطالعه وپژوهش بسیاری از شاخه‌های علوم قرار داد:

۱ـ از دیدگاه زبان‌شناسی : بستری مناسب برای شناختن تحوّلات آوایی و واژگانی یک زبان اند.

۲ـ از دیدگاه تاریخی : بیانگر هویّت دیرینهٔ اقوام وملّتهااند.

۳ـ از دیدگاه جامعه‌شناسی : نشانگر آداب ورسوم وروابط اجتماعی ملّتهادرادوار پیشین اند.

۴ـ از دیدگاه ادبی : میدان شناختن آرایه‌های ادبی ومفاهیم بلاغی درتطوّریک زبان اند.

۵ـ از دیدگاه فقه‌اللّغه : کشکولی از واژه‌های قدیمی وغالباًفراموش‌شدهٔ یک زبان اند.

۶ـ از دیدگاه تاریخ پزشکی : گوشه‌هایی از چگونگی مداوای سنّتی امراض را بیان نموده‌اند.

۷- از دیدگاه علم‌الاخلاق : مبیّن حکمت نظری وعملی پیشینیان اند.

۸- از دیدگاه جغرافیایی : آوای واژگان حوزهٔ جغرافیایی مثلهاوگویندگانشان رانشان می‌دهند.

۹- از دیدگاه روان‌شناسی : بُن‌مایه‌های ذهنی وروانی و آرزوهاوامیال ملّتهارا می‌نمایانند.

۱۰- از دیدگاه دینی : ارزشهاوضدّارزشهای اعتقادی گویندگان مثلهارابیان می‌کنند. و...

## شیوهٔ کار در این مجموعه :

ملّت کُرد در غالب زمینه‌های فرهنگی دارای آثار ونمونه‌های برجسته وپرباری است که بیشتر آنها هنوز مکتوم وناشناخته باقی مانده‌اند ؛اگرچه خوشبختانه درسالهای اخیر پژوهشگران کُرد درغالب زمینه‌های فرهنگی نسبت به معرّفی آثار مکتوب وشفاهی گذشتهٔ ملّت کُرد گامهایی برداشته‌اند، واز این بابت باید بسیار خوشنود بود، امّااین حرکتهای پژوهشی هنوز کافی نیست ومستلزم تلاشی مستمرّاست ؛امیدواریم جوانان ما دراین راه کمر همّت ببندند ودر جهت تبیین واستخراج وشناساندن آثار ونشانه‌های فرهنگ غنی وپربار گذشتهٔ ملّت خویش به‌شیوه‌ای علمی و دور از هر گونه جانبداری نادرست وگمراه کننده وآسیب پذیر، اقدام نمایند.

مجموعهٔ حاضردراین دفتر، امثال وحکم زبان کُردی سورانی است که‌در مورد چگونگی تنظیم وتدوین آن، یادآوری چند نکتهٔ زیررا لازم می‌داند :

۱ـ نویسندهٔ این سطور اذعان دارد که این مجموعه همهٔ ضرب‌المثلهای زبان کُردی نیست، زیرادست یافتن به همهٔ مثلهای یک زبان نه کار یک فرد تواند بود ونه جمع‌آوری همهٔ مثلهادر مدّت چند وچندین سال امکان‌پذیر است. از جهتی

دیگر هرگاه به‌امید آینده‌ای دور ودراز وشاید دست‌نیافتنی، از تدوین وچاپ آن‌چه جمع‌آوری شده‌است، خودداری گردد؛ بی گمان غبنی فاحش خواهد بود. لذا به چاپ این مجموعه که تعداد (۲۶۶۳) ضرب‌المثل است اقدام گردید. باشد که دیگران نیز به تدریج این کار راادامه دهند.

۲ـ تعدادی از این پندها وامثال به گویش سنندجی ویا نزدیک به‌آن است، درحالی‌که در دیگر مناطق سورانی‌زبان نیز باتغییری جزئی در آواو واژگان به کار می‌روند وتاجائیکه ممکن بوده‌است، دیگرصورتهای رایج بعضی از مثلها پس ازشرح «واته» آمده‌است.

۳ـ مثلهاابتدابه زبان کُردی رایج وکاربردی آنهانوشته‌شده، سپس ترجمهٔ آزاد یا لفظ به‌لفظ هرمثل به‌زبان فارسی آمده‌است. پس از آن معنی یاکاربرد هر مثل به زبان کُردی معیار (زمانی یه‌کگرتووی کوردی )بیان گردیده‌است.

۴ـ هرکدام از مثلهااگر برگرفته ازداستان یا واقعه‌ای بوده، تا جائیکه امکان داشته، آن داستان یا واقعه نیز به‌زبان کُردی ساده‌نقل گردیده‌است.

۵ـ اگر در متن مثلها واژه‌ای ناآشنا یا دیرآشنا آمده‌باشد، معنی آن واژه در بخش «واته» ذکر شده‌است.

۶ـ درترجمهٔ مثلها به‌زبان فارسی، جانب فهم معنی مثل در نظرگرفته‌شده وبه‌همین دلیل غالباًترجمهٔ آزاد ترجیح داده‌شده‌است، مگر در مواردی که ترجمهٔ لفظ به لفظ گویای معنی مقصود بوده ونیازی به ترجمهٔ آزاد نبوده‌باشد.

۷ـ آوانگاری یافونتیک مثلهاابتدا جزو این کار بود، ولی به‌دلیل نبودن همهٔ نشانه‌های آوانگاری واژگان، مطابق آن چه دلخواه نویسندهٔ این سطور بود، واز جهتی دیگر انجام کار را بیش از اندازه به تأخیر می‌انداخت، ازآن صرف‌نظر شد.

۸ـ در ساختار پاره‌ای معدوداز مثلهابراساس کاربرد آنهادر منطقه‌های مختلف، ممکن است جابه‌جایی واژه‌هاصورت گرفته باشد،بنا براین براساس حرف اوّل مثل، در بخشهای گوناگون الزاماًتکرار شده‌است.

۹ـ ممکن است تعدادی ازاین مثلهادر زبانهای دیگر نیز وجود داشته باشند و صرفاً به زبان کُردی اختصاص نداشتەباشند، این امری طبیعی است زیرا چنین مثلهایی بەنام «مثل سایر» جزو مشترکات زبانهای گوناگون عالم اند ومثلهای فرامرزی وفراملّی اند وحلقەهای مبارک پیوند میان ملّتهاهستند.

۱۰ـ لازم می‌دانم ازکسانی نام ببرم که پیش از من در این زمینه زحمت کشیدەاند و این‌جانب آثارشان را دیده و تا اندازەای از آن‌ها بهره بردەام و بدین وسیله از زحمات آنان قدردانی می‌نمایم.

ـ «مەسەڵ گەڵ کوردی»: روان‌شاد حضرت آیة الله شیخ محمد مردوخ کُردستانی.

ـ «پەندی پێشینان»: مرحوم شیخ محمّد خال

ـ «پەندی پێشینیان»: ج ۱، استاد عبدالحمید حیرت سجادی

ـ «امثال و حکم کردی»: آقای فتاح قاضی.

هم‌چنین سپاس می‌دارم زحمات دانشجویان مراکز تربیت معلم سنندج در سال‌های ۱۳۶۳ الی ۱۳۷۲ شمسی.

بی‌گمان کسانی دیگر نیز در این زمینه زحماتی کشیده و آثاری تألیف نمودەاند که اینجانب آن‌ها را ندیدەام، اما زحماتشان را ارج می‌نهم.

درپایان امیدوارم آنان که برای احیاءوشکوفایی فرهنگ و زبان ملّت خود بادلسوزی واحساس مسؤولیّت، گام برمی دارند، درایفای رسالت خطیر خویش پیروز وکامیاب باشند.

علی رُخزادی

سنندج ـ مردادماه ۱۳۸۱ خورشیدی

# ■ ئـ

١- **ئاخر عومر و ئەوەڵ ماڵداری!**

○ آخر عمر و اوّل مالداری.

● **واتە:** هەوڵدان بۆ ماڵداری ئیشی هەوەڵی عومره نەك ئاخری عومری مرۆڤ کە ببێتە جێگەی تانە و تەشەری مەردم.

٢- **ئاخ زۆره، پەی زاتێ!**

○ کاش این زور، با غیرتی نیز همراه بود.

● **ئەگێرنەوە:** کابرایەك زۆردار، کەرە کەی لە قوڕێکداگیر ئەکا و ئەچێ سەر ئەکا بەژێر سکی کەرەکەدا و بەرزی ئەکاتەوە و لە قوڕەکە دەری دێنێ و ئەیباتە ئەولاوە. دوای ئەوە بە دەنگی بەرز ئێژێ: ئاخ زۆره پەی زاتێ! یانێ من زۆرێکی وام هەیە بەڵام زاتم نی‌یە. جا کابرایەکی دز کە خۆی بۆ ڕێگری حەشار دابوو، کاتێ کە ئەم قسە ئەبیسێ،وە لە هەوەڵا لە زۆری کابرا ترسابوو، وە خۆی ئاشکرا نەکردبوو، بە بیستنی ئەو قسەیە، لێی دەر ئەپەڕێ و رووتی ئەکاتۆ.

۳ـ **ئاخوری بەرزە.**
○ آخوٚرش بلند است.
● بە یە کێکی دەماراوی و فیز لوٚز ئەوترێ.

۴ـ **ئارد بێخ درک، گردوٚ ناوێتۆ.**
○ آرد زیر بوٚتەی خار جمع نمی‌شود.
● بە کارێکی بێ سوود ئەوترێ.

۵ـ **ئارد خوەی لێ کرد و بێژنگ خوەی لێ کرد بە دارا.**
○ آرد خود را بیخت و غربالش را آویخت.
● **واتە:** کاری خۆی تەواو کرد و رەحەت لێی دانیشت.

۶ـ **ئارد لە کەنووا بێ نان قابلی چەس.**
○ آرد در کندو موجود باشد، نان چه قابلی دارد.
● **واتە:** ئە گەر دەسمان بڕوا پیاوەتی ئە کەین.

۷ـ **ئاردی رویگە و سوٚسی ماگە.**
○ آرد آن از بین رفته و سَبوسش باقی مانده است.
● **واتە:** ئەوەی کە باش و خاوێن بور رۆیشتووە و خراپە کەی ماوەتەوە.

۸ـ **ئازا جارێک ئەمرێ و ترسەنوٚک هەزار جار.**
○ شخص غیرتمند یک بار می‌میرد و ترسو هزار بار.
● **واتە:** مرۆڤی ئازا چونکە ناترسێ و هەر بۆ پێش ئەڕوا تەنها ئەو جارە تووشی خەتەر ئەبێ کە خەتەر رووی تێ ئە کا، بەڵام مرۆڤی ترسەنۆک هەرکاتێکی مەرگێکە.

۹ـ **ئازار جوان وەسە تکەی بان.**
○ مرض جوان مانند چکّهٔ پشت بام است.
● **واتە:** نەخۆشی مرۆڤی گەنج، زوو چاک ئەبێتۆ.

۱۰ـ **ئازاکوڵ دڵ خوەی رژان.**

○ فوراً جوش دل خود را بیرون ریخت.

● **واته:** زۆر زوو قینی خۆی دەربڕی.

**١١ـ ئاسمان بوێتە لێفە دای ناپۆشێ.**

○ آسمان لحاف شود او را نمی‌پوشاند.

● بە یەکێک ئەوترێ عەیبێکی گەورەی لێ‌قەومابێ و بە هیچ لەونێ دانەپۆشرێ.

**١٢ـ ئاسمان دوور و زەوی سەخت.**

○ آسمان دور و زمین سخت.

● **واته:** دەستم لە هەموو لایەکەوە بڕاوە و کارێکم پێ‌ناکرێ.

**١٣ـ ئاسمان دوور و زەوی نزیک!**

◘ بڕوانە بۆ ژمارەی «١٢»

**١٤ـ ئاسن سارد بە فوو گەرم ناوێ.**

○ آهن سرد با فوت کردن گرم نمی‌شود.

● **واته:** ئەو کارە گرینگە بەو ئاسانی‌یە کە تۆ بۆی ئەچی بە ئاکام ناگا.

**١٥ـ ئاسن گەرم بە فوو سارد ناوێ.**

◘ بڕوانە بۆ پەندی ژمارە «١٤»

**١٦ـ ئاسوە خۆم کەرم نی‌یە، لە کا و جۆ خەوەرم نی‌یە.**

○ آسوده‌ام، الاغ ندارم؛ و از کاه و جو نیز اطلاعی ندارم.

● **واته:** هیچم نی‌یە و خەیاڵم تەختە و خەمی لە دەس چوونی ماڵی دنیا ناخۆم.

**١٧ـ ئاسیاو ئارد ئەهارێ و چەقەنە دیان خوەی ئەشکنێ.**

○ آسیاب به ساختن آرد مشغول است و چقچقه دندان خود را می‌شکند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە کاری کەسانێکی تردا قسەی بێ‌جێگە بکا.

**١٨ـ ئاسیاوان بێت و ئارد بۆ خوەی بهارێ!**

○ آسیابان باشد و برای خودش آرد بسازد.

● ئەگەر ئوساکارێ گەرەکی بێ لە بەرهەمەکەی خۆی بۆ خۆی دروس بکا شتێکی باش دروس ئەکا.

نەزیری ئەم مەسیلەیە: «دۆم بێت و کڵاش بۆ خۆی بکا».

۱۹ـ **ئاسیاوان لە خەیاڵێک و ئاش‌هار لە خەیاڵێ.**

○ آسیابان در فکر خودش است و مشتری نیز در فکر خود.

● **واتە:** هەرکەس لە بیری کاری خۆیایەتی.

۲۰ـ **ئاسیاو بە نۆرە. (بە نۆگە)**

○ آسیاب به نوبت.

● **واتە:** لە هەموو کارێکدا نەزم پێویستە.

۲۱ـ **ئاسیاو بێ ئاو ناگەرێ.**

○ آسیاب بدون آب کار نمی‌کند.

● **واتە:** ئەنجامی هەر کارێ، پێویستی بە تایبەتمەندی خۆیەوە هەیە.

۲۲ـ **ئاسیاو فرەهار وردیچ ئەهارێ و دوروشتیچ ئەهارێ.**

○ آسیاب پر کار هم آرد ریز (نرم) می‌سازد و هم آرد درشت (خورد نشده).

● **واتە:** مرۆڤی زۆر وێژ،خاسیش ئێژێ وخراویش ئێژێ وەکوو ئاسیاوێ کە زۆر کار بکا، ئاردەکەی هەم ورد ئەبێ و هەم زبر.

۲۳ـ **ئاسیاوکار خۆی ئەکا و چەقەنە سەر خوەی ئێشێنێ.**

○ آسیاب به کار خود مشغول است و چقچقه سر خودش را درد می‌آورد

● بە یەکێک ئەوترێ کە بێ جێگە لە کارێکدا دەخاڵەت بکا بێ ئەوەی نیازێک بە قسە و دەخاڵەتی ئەو بێ.

۲۴ـ **ئاسیاو لە مێزتن بێ رۆژێ ئەمێزێ.**

○ آسیاب بخواهد سرعناد نشان دهد بالاخره روزی چنین خواهد کرد.

● **واتە:** ئەوکارە ئەگەر بینابێ بترازێ، رۆژێ هەر ئەترازێ.

**۲۵ـ ئاش ئەگەر شلە وێ، ئاشپەزەکەی بلە وێ، هەرکەس بیخوا گول ئەوێ!**

○ آش اگر «شله» باشد، آشپز اگر «بله» (ابراهیم) باشد، هرکس آن را بخورد، جذام می‌گیرد.

● بۆدەربڕینی ناڕەزایەتی لەکەسێکی پوخڵ و بەرهەمە خواردەمەنی‌یەکەی ئەوترێ کە زۆر پیس بێ.

**۲۶ـ ئاش بەتاڵە.**

○ آسیاب از کار افتاد.

● **واتە:** کارەکە تێک چووە. یا: هەڵ شێواوەتەوە.

**۲۷ـ ئاشپەز تەقەی دەسی نایەت.**

○ صدای دست آشپز شنیده نمی‌شود.

● **واتە:** مرۆڤ عەیبی خۆی نابینێ.

**۲۸ـ ئاشتی کتک و مشک، پرسەی بەقاڵە.**

○ آشتی گربه و موش، عزای بقّال است.

● **واتە:** ئەگەر دوو دوژمن پێکەوە ئاشتی بکەن، لەبێ خەتەری بێ بۆ یەکێکی تر کە پێوەندی بەوانەوە هەیە.

**۲۹ـ ئاغە رۆ و خوا شوکرا!**

○ افسوس از مرگ آقا، و خدا را شکر.

● **واتە:** لە رواڵەت دا هاودەردی کردن و لە دڵەوە بەدەردی کەسان پێ خۆشحاڵ بوون.

**۳۰ـ ئافتاوە و لەگان حەفت دەس، شام و نەهار هیچێ!**

○ آفتابه و لگن هفت دست، شام و نهار هیچ!

● بە جێگایەک یا بە ماڵێ ئەوترێ کە ئەهلەکەی خۆیان بۆ هاتنی میوان سەرقاڵ کردبێ و لە هات و چوودابن بەڵام لە سفرە و نان و خواردەمەنی خەبەرێ نەبێ.

**۳۱ـ ئاگر بکەفێتە بێشە، تەر و وشکی بۆ نی‌یە.**

○ آتش به جنگل بیفتد، تر و خشک نمی‌شناسد.

● **واتە:** بەڵاکە رووی کردە جێگایەک، خاس و خراپ ناناسێ.

**٣٢- ئاگر بە ئاگر ناکوژێتەو.**

○ آتش با آتش خاموش نمی‌شود.

● **واتە:** شەڕ بە شەڕ تەواو نابێ.

**٣٣- ئاگر بەری دای لە سەری!**

○ آتش هوس او را دیوانه کرده است.

● **واتە:** هەوەس زۆری بۆ هێناوە و شێتی کردووە.

**٣٤- ئاگر ژێرکا.**

○ آتش زیر کاه.

● بە کەسێ ئەوترێ کە زۆر فێڵەباز و ئاژاوە چاخکەر بێ و کەس پێی نەزانێ.

**٣٥- ئاگر ژێرکا بۆسۆی لێ نایەت.**

○ آتش زیر کاه بوی سوختگی ندارد.

● بە خەتەرێکی ناپەیدا و نهێنی ئەوترێ.

**٣٦- ئاگر لە چاوی ئەوارێ.**

○ آتش از چشمش می‌بارد.

● بە یەکێکی زۆر توورە ئەوترێ.

**٣٧- ئاگر لە سەر پشتی بکەروٚ!**

○ آتش روی پشت او روشن کن.

● **واتە:** زۆر بێ‌غیرەتە و هیچ کارێکی پێ ناکرێ.

**٣٨- ئاگر و ئاو بێ ئامانن.**

○ آتش و آب امان نمی‌دهند.

● **واتە:** ئەو دو چتە هەرچەن زۆر بەخێرن زۆریش جێگەی مەترسی و خەتەرن و ئەبێ لێیان بە وریایی کەڵک وەرگیردرێ.

**۳۹ـ ئاگره سووره له خوەم دووره!**

○ آتشی برپا شده و از من دور است.

● **واته:** خەتەرێک رووی کردووه و من خۆمی لێ ئەپارێزم.

**۴۰ـ ئاگری بە، بۆسۆی لێ هەڵناسێ.**

○ اگر او را آتش بزنی بوی سوختگی از وی بلند نمی‌شود.

● **واته:** زۆر فەقیر و هەژار و رووتە.

**۴۱ـ ئاسیاو ئاو بردگ، ئاسیاوان بە شۆن چەقەنەدا ئەگەرێ.**

○ آسیاب را آب برده، آسیابان دنبال چغچغهٔ آسیاب می‌گردد.

● **واته:** کابرا زەرەرێکی قورسی لێ کەوتووە کەچی ئەو لەو کاتەدا، بیر لە وردەزەرەر ئەکاتۆ.

**۴۲ـ ئاسیاو گرمەی تێ و ئاردی دیار نی‌یه.**

○ سر و صدای آسیاب بلند است و از آرد خبری نیست.

● **واته:** وتەی هەیە و کرداری نی‌یە.

**۴۳ـ ئاسیاو نانەوه چەس؟ ناکەی و پاکەی!**

○ آسیاب راه‌انداختن چیست؟ «نا» و «پا»ی آن.

● بە کەسێ ئەوترێ کە کاری مەردمی بە لاوە سووک بێ.

**۴۴ـ ئاسیاو نەزان خوا ئەیگەرنێ.**

○ آسیاب شخص ساده دل را خدا راه می‌اندازد.

● **واته:** کەسێکی فەقیرۆکە، خوا یارمەتی ئەدا و کار و بارەکەی رێک ئەکەوێ.

**۴۵ـ ئاشپەز دوان بێ، ئاش یا سۆڵە یا بێ خوێ!**

○ آشپز که دو تا شد آش یا شور است یا بی نمک.

● **واته:** کارێ ئەگەر دوو نەفەر بەرپرسی بن، تووشی عەیب ئەبێ.

**۴۶ـ ئامۆزای فره و باوک بێ برا!**

○ عموزاده فراوان در حالی که پدرش بی برادر بود.

● بە کەسانێ ئەوترێ کە بە ناوی قەومی‌یەوە چاوی تەماعیان بڕی‌بێتە ماڵی کەسێک و دەورەیان دابێ.

**٤٧ـ ئاو ئەجاوێ.**

○ آب می‌جود.

● بە یەکێکی گەوج ئەوترێ.

**٤٨ـ ئاو ئەڕوێت و ڕێخ ئەمێنێ.**

○ آب می‌رود و سنگریزه بر جای می‌ماند.

● **واتە:** غەریبە ئەڕوات و خاوەن ماڵ ئەمێنێتۆ.

**٤٩ـ ئاو ببڕگێ لە ڕۆخانە، هەر خوێش خاسە لە بێگانە.**

○ آب از رودخانه قطع بشود، باز هم خویشاوند از بیگانه بهتر است.

● **واتە:** ئەگونجێ ئاوی چەمی گەورە وشک ببێ، بەڵام ناگونجێ بێگانە دڵسۆزتر لە قەوم و کەس بێ.

**٥٠ـ ئاو بوێت، مەلەوان خاسێکە!**

○ آب باشد، شناگر خوبی است.

● **واتە:** ئەوکەسەی ئەگەر دەرفەتی بۆ بڕەخسێ زۆر چاک لە ئاستی ئەوکارە دەردێ.

**٥١ـ ئاو بە ئاوانیا ئەچێت.**

○ آب جایی می‌رود که آباد باشد.

● **واتە:** دوای خواردەمەنی‌یەکی تێر و تەسەل،ئاو ئەخورێتەوە، نەک بە زکی‌برسی.

**٥٢ـ ئاو بە ئاوە ڕێژەدا ئەچێ.**

○ آب از ناودان می‌گذرد.

● **واتە:** هەموو چتێ بە ڕێگەی خۆیا ئەڕوا.

**٥٣ـ ئاو بێرا و دەس بشۆرە.**

○ آب بیار و دست بشوی.

● **واته:** کار، تەواوە.

**٥٤- ئاو بێ‌لەغاوی خواردگە.**

○ آب بدون دهنه خورده است.

● **واته:** هار بووە، لە کەسێ تەربیەتی نەگرتووە.

**٥٥- ئاو پاکیم کردە دەسیا.**

○ آب پاکی روی دستش ریختم.

● **واته:** دڵنیایم کرد و ئەوەی کە ئەبێ بیڵێم، پێم وت.

**٥٦- ئاو چاوی سەنیاگە.**

○ آب چشمش گرفته شده است.

● **واته:** ئەویان ترساندووە.

**٥٧- ئاو چووە مل ئاگریا.**

○ آب بر آتش او ریخته شد.

● **واته:** ئیتر لەو هەو و تەوە کەوت.

**٥٨- ئاو خوەش لە گەڵوومەو نەچووگەسە خوارەو!**

○ آب خوش از گلویم پایین نرفته است.

● **واته:** قەد خۆشیم نەدیوە.

**٥٩- ئاو دەریا بە دەم سەگ چەپەڵ ناوێ.**

○ آب دریا با دهان سگ نجس نمی‌شود.

● **واته:** مرۆڤی پاك و گەورە بە قسەی ناشیرینی ناکەس، سووك نابێ.

**٦٠- ئاو رژیا جەمەو ناوێت.**

○ آب وقتی ریخت دیگر جمع نمی‌شود.

● **واته:** کەسێ کە ئابڕووی چوو، ئیتر کارێکی پێ ناکرێ.

**۶۱ـ ئاو زاڵم سەر بەرەو ژوورە.**

○ آب ظالم روبه بالا می‌رود.

● **واتە:** حوکمی زاڵم پێچەوانەی حوکمی عەدڵە.

**۶۲ـ ئاو ژێر کاس و ئاگر ژێر خوڵەکەوان.**

○ آب زیر کاه است و آتش زیرتودەی خاکستر.

● بە کەسێکی فێڵەباز و ساختەچی ئەوترێ کە هیچکەس لە فێڵی ئەو تێ‌نە گا.

**۶۳ـ ئاوکریا بە ئاگرا و تەواو بوو.**

○ آب بر آتش ریخت و تمام شد.

● **واتە:** ئەو شەڕە کوژراوە.

**۶۴ـ ئاوگەدا و دەوڵەمەن بووگەسە یەکێ.**

○ آب گدا و ثروتمند یکی شده است.

● **واتە:** ئەمڕۆ لەم دەرفەتەدا هەمووکەس وەکوو یەکیان لێ هاتووە.

**۶۵ـ ئاو لە ئاسیاوکەفت.**

○ آب از آسیاب افتاد.

● **واتە:** ئیتر تەواو بوو، هەموو لایەك بێ‌دەنگە.

**۶۶ـ ئاو لە ئاو تەکان ناخوات.**

○ آب از آب تکان نمی‌خورد.

● **واتە:**دنیا کش و ماتە وجم‌وجووڵێ نی‌یە ؛ هەموو لایەك ئارامە.

**۶۷ـ ئاو لە دنگا ئەکوتێ.**

○ آب در دنگ می‌کوبد. معادل: (آب در هاون می‌کوبد)

● **واتە:**کرداری بێ ئاکام ئەکا.

**۶۸ـ ئاو لە سەر بگرد، چ گەزێک، چ سەد گەز.**

○ آب از سر گذشت چه یک متر چه صد متر.

● **واتە:** زەرەر کە هات، کەم یان زۆری هەر ناوی زەرەرە. کاتێ ئەوترێ کە زیانێکی سەر و ماڵی پێش هاتبێ و کەم یا زۆری زیانە کە فەرقی لە ئاکامی ئەو رووداوەدا نەبێ.

**٦٩ـ ئاو لە سەر چاوگەوە لێڵە.**

○ آب از سر چشمه گِل آلود است.

● **واتە:** عەیب لە بنەڕەتەوەیە.

**٧٠ـ ئاو لە سەر گوزەریا، چ نەیەک چ هەزار نەی.**

◘ بڕوانە بۆ پەندی ژمارە «٦٨»

**٧١ـ ئاو و ئاوانیان وتگە.**

○ آب و آبادانی گفته‌اند.

● **واتە:** بە ئاو، ئاوەدانی دروس ئەبێ.

**٧٢ـ ئاوەدان بێ «شاڵیاوا»، بانێکەو دوو هەوا!**

○ «شالّی آباد» آباد باشد، یک بام است و دو هوا.

● وەختێ ئەوترێ کە جیاوازی‌یەکی ناڕەوا لە بارودۆخێکی بەرابەردا لە بەین دوو کەسا رووی دابێ.

**ئەم مەسیلە بەم جۆرە دروس بووە:** ئێژن ژنێ ئەبێ و شەوێ لە هاویناکوڕەکەی و بووکەکەی، کچەکەی و زاواکەی دەعوەت ئەکا بۆ ماڵی خۆی لە دێی «شاڵیاوا»؛ دوای شێو خواردن لە سەر بان جێگای خەوتنیان بۆ رائەخا، بەڵام بەم جیاوازیە کە جێگەی کوڕەکەو بووکەکەی لەوسەری بانەکەوە نەختێ دوور لە یەک دائەخا، تانەلکن بە یەکۆ، وەلێ بۆ کچەکە و زاواکەی لەم سەری بانەکەوە یەک جێگە دائەخا، تا لە خەوتناجووت بن! ئەمجار کە کاتی خەوتن دێ ئەچێ بۆ سەر جێگەی کوڕەکە و بووکەکەی و پێیان ئێژێ: رۆڵەگیان دوور لە یەک بخەون با لە گەرمادا نەکوڵن! دوای ئەوە ئەچێ بۆ سەر جێگەی کچەکە و زاواکەی و بەوان ئێژێ: رۆڵەی دایکی جووت بخەون با سەرماتان نەبێ! بووکێ کە گوێی لە هەر دوو قسەکەی خەسوویەوە ئەبێ، ئێژێ:

ئاوەدان بێ شاڵیاوا، بانێکە و دوو هەوا، ئەمپەڕی بان گڕ ئاوا، ئەوپەڕی بان سڕ ئاوا!

**۷۳ـ ئاو هەسۆکەرە.**

○ آب غلیظ کن.

● بە یەکێکی بەتاڵپا و خوێڕی ئەوترێ.

**۷۴ـ ئاوی بەستگەسە ژێری.**

○ آب به زیر او انداخته است.

● **واتە:** کەم کەم خەریکە کارێ ئەکا، کە ئەو کەسە دەرکا.

**۷۵ـ ئاوی کردگە ژێری.**

▣ بڕوانە بۆ پەندی ژمارە «۷۴»

**۷۶ـ ئاوێ چووبە جۆگەلەیەکا، هەر ئەشێ بڕوێ.**

○ آبی که از یک جوی عبور کرد، همیشه باید برود.

● **واتە:** ئەم ڕەسم و یاسا وا دامەزراوە، ئەبێ هەر وابێ.

**۷۷ـ ئاوێ گەرم ناکا.**

○ آبی گرم نمی‌کند.

● **واتە:** کارێکی لە دەس نایە.

**۷۸ـ ئاوێ ناپاڵێوێ.**

○ آبی را نمی‌پالاید.

● **واتە:** کارێکی لە دەس نایە.

**۷۹ـ ئاوی هابە بێڵەو.**

○ آب به بیل دارد.

● **واتە:** دەسی ئەڕوات و دەسەڵاتی هەیە.

**۸۰ـ ئاوێکی پێ گەرم ناوێ.**

○ آبی گرم نمی‌کند.

● **واتە:** کارێکی لە دەس نایە.

**٨١ـ ئاهوی نەگیریاگ ئەوەخشێ!**

○ آهوی نگرفته می‌بخشد.

● **واتە:** خوڵکی دوور و درێژ و بێ‌جێگە ئەکا.

**٨٢ـ ئاینە ئەگرنە بەردەمیەو.**

○ آینه جلو دهانش می‌گیرند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە سەرە مەرگ دا بێت.

**٨٣ـ ئومێدمان بە وەیس بوو، وەیسیش بە سوننی دەرچوو.**

○ امید ما به ویس بود، ویس هم سُنّی از آب درآمد.

● کەسێ ئەم قسە ئەکات کە ئومێدێکی بە یەکێ بووبێ و ئێستا لەو کەسە نائومێد مابێ.

**٨٤ـ ئەترێ و ئێژێ شانزەی مانگە!**

○ تیز می‌دهد و می‌گوید شانزده برج است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە خەبەری لە وەزع و حاڵی خۆی نەبێ.

**٨٥ـ ئەترێ و هاوسا ماڵ قسەی بۆ ئەکاتۆ!**

○ تیز می‌دهد و همسایه وی راااز آن باخبر می‌سازد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە وەزعی خۆی خەبەری نەبێ.

**٨٦ـ ئەچمە حمام و ناچمە خەزێنە.**

○ به حمام می‌روم اما به خزینهٔ (حمام) نمی‌روم.

● بە یەکێک ئەوترێ کە قسە و کرداری یەک نەگرێ.

**٨٧ـ ئەدات بە لای مارا جووچکەی ئەقرتنی!**

○ از کنار مار می‌گذرد دُمش را قطع می‌کند.

● بە یەکێکی زۆر فێڵەباز و دەسبڕ ئەوترێ.

**٨٨ـ ئەدات لە حەفت ئاو و پای تەر ناوێت!**

○ به هفت آب می‌زند و پایش خیس نمی‌شود.

● **واتە:** زۆر فێڵەباز و زیرەکە.

**۸۹ـ ئەدات لە ناڵ و ئەدات لە بزماریش.**

○ هم به نعل می‌زند هم به میخ.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە بابەتێکدا بە دوو باری جیاواز و دژ لە یەک بە سوودی خۆی قسە بکا.

**۹۰ـ ئەرێ فەقیری بە چەت بێژم خاس ؟ تاوسان پا پەتی و زمسان بێ کراس.**

○ ای گدایی از چه چیز تو تعریف کنم؟ در حالی که تابستان بدون کفش هستم و زمستان بدون پیراهن.

● **واتە:** هەژاری هیچ چتێکی لە هیچ کاتێکدا باش نی‌یە.

**۹۱ـ ئەزانم کڵاشە وەلێ بەسەرما ناچێت.**

○ می‌دانم گیوه است ولی (این حرفها) سرم نمی‌رود.

● **واتە:** ئەزانم وایە بەڵام لێت ناژنەوم.

**۹۲ـ ئەسپاو پڵاو، نانەشانە و ئاو!**

○ وسایل پختن پلو، صافی است و آب.

● **واتە:** ئەم ئیشە ئەوەندەیش بێ زەحمەت نی‌یە.

**۹۳ـ ئەسپ پێشکەشی تەماشای دیانی ناکەن.**

○ دندان اسب پیشکه‌شی را نگاه نمی‌کنند.

● **واتە:** لە چتی پێشکەشی رەخنە ناگیردرێ.

**۹۴ـ ئەسپ، سوار خوەی ئەناسێ!**

○ اسب، سوارکار خود را می‌شناسد.

● **واتە:** ئەسپی رەسەن سواری چاک و خراپ ئەناسێ و مل بە سوارچاک ئەدات و بۆ سوارخراپیش سەر ئەنێ بە دیانەوە.

**۹۵ـ ئەسپ شێ، یا ئەفرێ یا ئەترێ.**

○ اسب كُرَن (كرنگ ـ رنگ بين زرد و سرخ) يا پرواز ميكند يا تيز مى‌دهد.

● بە ئەسپی شێ ئەوترێ کە یا زۆر خێرایە یا زۆر تەمەڵە و حاڵەتی بەینابەینی نی‌یە. (بۆ هەر چتێکی تریش ئەوترێ)

**٩٦ـ ئەسپ و ژن و چەک بێ وەفان.**

○ اسب و زن و اسلحه بى وفااند.

● چونکە دوای مردنی خاوەنەکەیان، ئەکەونە دەس یەکێکی تر.

**٩٧ـ ئەسپ و شمشێر بێ‌وەفان.**

○ اسب و شمشير بى وفا هستند.

◙ وەکوو مەسیلەی پێشوو.

**٩٨ـ ئەسپە مەیان و تفەنگە نیشان.**

○ اسب در ميدان و تفنگ با نشانه‌گذارى آزمايش مى‌شود.

● **واتە:** هەموو چتێ لە جێگای خۆیا، ئەبێ ئەزموون بکرێ.

**٩٩ـ ئەسپیان ناڵ ئەکرد، کەر سمی بەرزۆکرد، ئەیوت: منیش.**

○ داشتند اسب را نعل مى‌كردند، خر سمش را بالا مى‌گرفت و مى‌گفت: من هم هستم.

● بە یەکێکی بێ‌قابل ئەوترێ کە لە هەموو کارێکدا خۆی تێکەڵ بکا.

**١٠٠ـ ئەسپی بە پەیغام ئاو ئەخوا.**

○ اسب او با پيغام آب مى‌خورد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بۆ هەر کارێ دەستوور بدا.

**١٠١ـ ئەسپی جۆ خۆرە!**

○ اسبش جو خور است.

○ بە یەکێک ئەوترێ کە پێش‌تر هاوسەری بووبێ و ئێستا بێ‌هاوسەر مابێ وبێژن ئەو بێ‌هاوسەر نایکرێ. یا بە کوڕێکی گەنج ئەوترێ کە وەختی ژن خواستنی هاتبێ.

**١٠٢ـ ئەسپێ لە چلساڵیا تالیمی بەیت، بۆ سەحرای مەحشەر خاسە!**

○ اسبی را که در چهل سالگی تعلیم بدهی، به درد صحرای محشر می‌خورد.

● **واتە:** هەر بنیادەمێ لە کات و سات و تەمەنی مناڵیدا ئەبێ پەروەردە بکرێ.

**١٠٣ـ ئەسپێ لەر لە گەورێ کەر خاسترە.**

○ یک اسب لاغر از یک طویله الاغ بهتر است.

● **واتە:** مرۆڤێکی زانا لە کۆمەڵێك بنیادەمی نەزان بەنرخترە.

**١٠٤ـ ئەسپی نەو، ئاخوری ئەبەست!**

○ اسب نداشت، آخور درست می‌کرد.

● بە یە کێ ئەوترێ کە بە خەیاڵ بژی.

**١٠٥ـ ئەسپی نەو، زینی بۆ قەرز ئەکرد!**

○ اسب نداشت، زین قرض می‌گرفت.

▣ وەکوو پەندی پێشوو.

**١٠٦ـ ئەشرەفی بووچکە و قیمەتی گرانە.**

○ اشرفی کوچک است و ارزش آن زیاد.

● **واتە:** چتی بچووك نابێ بە سووکی بۆی بڕوانی.

**١٠٧ـ ئەگەر ئاش خوەری کەوچکت کوا ؟**

○ اگر آش خور هستی قاشقت کو ؟

● بە یەکێك ئەوترێ کە دەعیەی ئەنجامی ئیشێ بکا، بەڵام توانایی و ئامرازی جێبەجێ کردنی ئەو ئیشەی نەبێ.

**١٠٨ـ ئەگەر بمزانیایە گۆرانی بێژم، بۆ خوەمم ئەوت.**

○ اگر می‌دانستم آواز بخوانم، برای خودم می‌خواندم.

معادل: «کل اگر طبیب بودی سر خود دوا نمودی».

● **واتە:** لەم کارە سەرم دەرناچێ و ئەگەر بم زانیبا خۆم کەڵکم لێ وەر ئەگرت.

▣ **وەکوو:** «کەچەڵ تیمارکەر بوایە، سەر خۆی تیمار ئەکرد».

**١٠٩ـ ئەگەر بن‌رانت ناخوریٚ، بۆچە لە شوان مانی نەوی ئەکەی ؟**

○ اگر بیخ رانت نمی‌خارد، چرا به چوپان خسته نباشی می‌گویی ؟

● **واتە:** ئەم بەڵایە لە خۆتەوە دائەکەویٚ.

**١١٠ـ ئەگەر بیٚژی ماس چەرمگە باور ناکەم.**

○ اگر بگوئی ماست سفید است باور نمی‌کنم.

● بە یەکیٚکی درۆزن ئەوتریٚ کە هیچ قسەیەکی جیٚگەی باوەڕ نەبیٚ.

**١١١ـ ئەگەر بیٚژی ماس رەشە باور ئەکەم.**

○ اگر بگوئی ماست سیاه است باور می‌کنم.

● بە یەکیٚک ئەوتریٚ کە هەموو قسەیەکی جیٚگەی باوەڕ بیٚ.

**١١٢ـ ئەگەر پرپۆڵەیەکم دروس‌کرد بۆخوەم، رشتەیەکیش دروس ئەکەم بۆتۆ.**

○ اگر توانستم اماجی (آش خمیر) برای خودم بپزم، برای تو نیز آش رشته‌ای درست می‌کنم.

● **واتە:** من کە ناتوانم خۆم بەڕیٚوە بەرم، چۆن ئەتوانم یارمەتی تۆ بدەم؟

**١١٣ـ ئەگەر پەر تاوست گەرەکە، ئەشیٚ جەور هیٚندوستانیش بکیٚشی.**

○ اگر پر طاووس می‌خواهی، باید جور هندوستان را نیز بکشی.

● **واتە:** کەسیٚ کە خۆشی و ئاسایشی گەرەکە ئەبیٚ زەحمەتی بۆ بکیٚشیٚ.

**١١۴ـ ئەگەر پەنجین ئەگەر شەشین، گشتمان میٚوان دیٚزە رەشین.**

○ اگر پنج نفر هستیم و اگر شش نفر، همگی مهمان دیگ سیاه هستیم.

● بە کۆمەڵیٚک ئەوتریٚ کە چاوی تەماعیان بڕیبیٚتە ماڵی کەسیٚک.

**١١۵ـ ئەگەر تۆ مەنی من دوو مەنم بیٚژگە لە گورز و کەمەنم.**

○ اگر تو مَن (واحد وزن) هستی من دو مَن هستم به غیر از گُرز و کَمَندی که از تو زیادتر دارم.

● **واتە:** نە تەنیا چتیٚکم لە تۆ کەمتر نی‌یە بەڵکوو زۆریش لە تۆ زیاترم.

**١١۶ـ ئەگەر تۆ نەوی هاوکار و یارم، خواگەورەس و ئەسازنیٚ کارم.**

○ اگر تو همکار و یار من نباشی، خدا بزرگ است و کار مرا روبراه می‌کند.
● **واتە:** ئومێدم بە خوایە و یارمەتی نەکردنی کەسان بۆم گرینگ نی یە.

**١١٧ـ ئەگەر خاسە حەیفە بۆ خەڵک، ئەگەر خراوە، عەیبە بۆ خەڵک.**
○ اگر خوب است حیف است که به مردم داده شود، اگر بد است عیب است که به مردم داده شود.
● بە کچێ ئەوترێ کە لە هەر حاڵدا ـ خاس یا خراپ ـ باش وا بێ بە خزم وکەسی خۆی بدرێ بە شوو.

**١١٨ـ ئەگەر خوەڵ ئەکەیتە سەرتا، لە خوەڵەکەوان گەورا بیکەرە سەرتا.**
○ اگر خاک روی سرت می‌ریزی، از تودهٔ خاکستر بزرگ روی سرت بریز.
● **واتە:** رووی نیاز بخە لە مرۆڤی نەجیب و خانەدان نەک کەسێکی بێ قابل وناوەجاغ.

**١١٩ـ ئەگەر خەوت تێت ژێر سەرت بۆچەس؟ ئەگەر برسیتە پێخوەرت بۆچەس ؟**
○ اگر خوابت می‌آید چه نیازی به متّکا داری؟ اگر گرسنه هستی به نان خورش چه احتیاجی داری ؟
● **واتە:** پەڵپ و بیانووی بێ جێگە مەگرە.

**١٢٠ـ ئەگەر دڵت لە کەسێ رێشە، تاوان بابەشێخ بێساران چێشە ؟**
○ اگر از کسی دل رنج هستی، تقصیر بابا شیخ «بیساران» چیست؟
● بە یەکێک ئەوترێ کە رقی لە کەسێ بێ و داخی دڵی خۆی بە سەر یەکێکی ترا خاڵی بکاتۆ.
«بێساران» گوندێکی گەورەیە لە ناوچەی ژاوەرۆی مەریوان.

**١٢١ـ ئەگەر رەشیش بم وەک موو، دارایی باوکم ئەم داتە شوو.**
○ اگر چون مو نیز سیاه باشم، ثروت پدرم مرا شوهر می‌دهد.
● بە کچێکی ناشیرین ئەوترێ کە بە ماڵ و سەروەتی باوکیەوە بۆ شوکردن خۆی هەڵکێشێ.

**١٢٢ـ ئەگەر ڕێخێ نی‌یە لە کەوشتا، بۆچە ئەشەلی ؟**

○ اگر ریگی در کفش نداری چرا می‌لنگی ؟

● **واتە:** ئەگەر عەیبێ لە خۆتا شکت نابەی بۆچی ڕاس نایتە ناو؟

**١٢٣ـ ئەگەر زانی ئەزم، ئەگەر لەیزانی، دزم.**

○ اگر فهمید من هستم، اگر نفهمید، دزد هستم.

● **واتە:** ئەگەر زانیان کە من ئەو چتەم هەڵ گرتووە، ئەوا ئێژم گاڵتەم کرد. ئەگەر نەیشیان زانێ، ئەوا بردوومە و تەواو بوو.

**١٢٤ـ ئەگەر ژن بە پیاگ بێژێ چت مەسێنە، ئیتر بزالە چەپەرە شرەس!**

○ اگر زن به شوهرش بگوید، چیزی برای خانه خریداری مکن، بدان که دیگر زوار در رفته است.

● **واتە:** ژنێ وا دڵی لە ماڵ و چت و مەکی ناو ماڵ هەڵ کەوتبێ ئیتر ئاخری عومریەتی.

**١٢٥ـ ئەگەر شاوانە، ئەگەر رەمەزانە، بەش ئێمە هەر دوونان دوونانە.**

○ اگر شعبان است، اگر رمضان است، سهم ما همان دو نان دو نان است.

● **واتە:** ئێمە لە هەر کات و سات‌دا هەر ئەمەینە وا هەین.

**١٢٦ـ ئەگەر کاوێژی بکردایە، گۆشتی بۆ خواردن حەڵاڵ بوو (یا: گۆشتی ئەخوریا).**

○ اگر نشخوار می‌کرد، گوشتش برای خوردن حلال بود. (یا: گوشتش خورده می‌شد)

● بە یەکێکی زۆر فەقیر حاڵ و بێ دەم و زوان ئەوترێ.

**١٢٧ـ ئەگەر کەر بە پەینجا سەر کەفت، خەسوویش لە ووی خوەشی تێت!**

○ اگر خر از نردبان بالا برود، مادر شوهر نیز از عروس خوشش خواهد آمد.

● **واتە:** خەسوو قەد خۆشی لە بووک نایە.

**١٢٨ـ ئەگەر کەسێ نەمیخواست، شووت پێ ئەکەم.**

○ اگر کسی از من خواستگاری نکرد، به تو شوهر می‌کنم.

● بە کەسێ ئەوترێ کە بۆ قسەو کاری یەکێکی تر رێز دانەنێ.

**۱۲۹ـ ئەگەر کەوایەکی کردە بەر خوەی، کراسێکیچ ئەکاتە بەر تۆ.**

○ اگر قبائی به تن خود کرد، پیراهنی هم به تن تو خواهد کرد.

● **واتە:** ئەوکە ناتوانێ خۆی بژینێ، چۆن ئەتوانێ یارمەتی تۆ بدات؟

**۱۳۰ـ ئەگەر گورگ نەویت، سەگ‌گەل ئەت خوەن.**

○ اگر گرگ نباشی، سگها تو را می‌خورند.

● **واتە:** زیرەک و بزێو بە، با بەشت نەخورێ.

**۱۳۱ـ ئەگەر گۆشت گرانە، نەخواردنی هەرزانە.**

○ اگر گوشت گران است، نخوردن آن ارزان است.

● **واتە:** قەناعەت بکە با موحتاج نەبی.

**۱۳۲ـ ئەگەر گوڵ نیت، درکیش مەوە.**

○ اگر گل نیستی، خار نیز مباش.

● **واتە:** ئەگەر چاکەت لە دەس نایە، خراپەیش مەکە.

**۱۳۳ـ ئەگەر لایە لایە ئەزانی، بۆچە ئەگیری ؟**

○ اگر لایه لایه بَلَدی، چرا گریه می‌کنی ؟

● **واتە:** ئەگەر خەڵکی رێنموونی ئەکەی، بۆچی لە بیری خۆت دا نیت؟

**۱۳۴ـ ئەگەر لایە لایە ئەزانی، بۆچە خەوت پیا ناکەفێ ؟**

▣ وەکوو پەندی پێشوو.

**۱۳۵ـ ئەگەر لووت لە بەینا نەوێ، چاو، چاو ئەخوا.**

○ اگر بینی در میان نباشد، چشم، چشم را می‌خورد.

● **واتە:** سنوور و یاسا ئەبێ ببێ، بۆ ئەوەی خەڵک بە مافی یەک دەس درێژی نەکەن.

**۱۳۶ـ ئەگەر لە جافان یەکێ بمێنێ، حەق بەر و دوا لە گشت ئەسێنێ.**

○ اگر از جاف‌ها یک نفر باقی بماند، انتقام اوّل و آخر را از همه خواهد گرفت.

● **واته:** خه‌یانه‌ت کردن به خانه‌دان، بێ تۆڵه نامێنێ.

**۱۳۷ـ ئه‌گه‌ر له‌ کانی‌یه‌ک ئاوت خواردۆ، به‌ردی تێ مه‌خه‌.**

○ اگر از چشمه‌ای آب خوردی، سنگ داخل آن چشمه مینداز.

● **واته:** قه‌در شناس به‌و جوابی چاکه‌ به‌ خراپه‌ مه‌ده‌ره‌وه‌.

**۱۳۸ـ ئه‌گه‌ر له‌کین، چون یه‌کین.**

○ اگر لک هستیم، مثل هم هستیم.

● **واته:** هه‌ر دووکمان له‌ هۆزێکین و چاکه‌ و خراپه‌مان وه‌کوو یه‌ک وایه‌.

**۱۳۹ـ ئه‌گه‌ر موو به‌ به‌خت ئه‌وو، بزن له‌ سه‌ر ته‌خت ئه‌ووا**

○ اگر مو بخت می‌آورد، بایستی بُز بر سر تخت شاهی می‌نشست.

● **واته:** به‌خت به‌ رواڵه‌ت نی‌یه‌.

**۱۴۰ـ ئه‌گه‌ر میمی گونی بوایه‌، ئه‌بووه‌ مامه‌!**

○ اگر عمّه آلت تناسلی مردانه می‌داشت، می‌شد عمو.

● به‌ که‌سێ ئه‌وترێ که‌ له‌ هه‌موو باسێکدابێژێ: «ئه‌گه‌ر» وا بوایه‌ وا ئه‌بوو ...

**۱۴۱ـ ئه‌گه‌ر هه‌رچی مه‌له‌ مێوه‌ خوه‌ر بوایه‌، مێوه‌ به‌ داره‌و نه‌ئه‌ما.**

○ اگر همهٔ پرندگان میوه خوار بودند، میوه‌ای بر درخت نمی‌ماند.

● **واته:** هه‌موو که‌س ناتوانێ هه‌موو کارێ ئه‌نجام بداو هه‌رکارێ به‌ کارزانێ سپێردراوه‌.

**۱۴۲ـ «ئه‌گه‌ر» یان دا به‌ «مه‌گه‌ر»، کورێکیان بوو ناویان نیا «کاشکی»!**

○ «اگر» را به عقد «مگر» درآوردند، پسری آوردند اسمش را گذاشتند «کاشکی»!

● **واته:** وتنی «ئه‌گه‌ر» و «مه‌گه‌ر» و «کاشکی»، له‌ هه‌ر کارێکدا هاته‌ به‌ین، مانای ئه‌وه‌یه‌ که‌ ئه‌و ئیشه‌ ئه‌نجام نابێ.

**١٤٣ـ «ئەگەر» یان نیا و سەوز نەو.**

○ «اگر» راکاشتند و سبز نشد.

● **واتە:** ئەگەر، ئەگەر کردن، نیشانەی ئەنجام نەدانی ئیشە.

**١٤٤ـ ئەگەرێت بۆ نۆک و نوخۆشەرەکەی.**

○ دنبال نخود و لپّەاش می‌گردد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر لە سەر قسەیەک بڕوا.

**١٤٥ـ ئەگەر یەک جار بم خەڵەتێنی خوا بتگرێ؛ ئەگەر دوو جار بم خەڵەتێنی خوا بمگرێ.**

● اگر یک دفعه مرا فریب بدهی خدا گرفتارت کند؛ اگر بار دوم مرا فریب دهی خدا گرفتارم کند.

● **واتە:** مرۆڤ ئەگەر جارێ لەکارێکدا تووشی هەڵە بوو، نابێ بۆ جاری دووهەم هەر لەو کارەدا هەڵە بکا.

عەرەب ئەڵێ: لایُلْدَغُ المؤمِن، مِن جُحْرٍ واحِدٍ مَرَّتَینْ: مؤمن دوو جار لە کونێکەوە ناگەزرێ.

**١٤٦ـ ئەلف لەیلای بۆ بخوێنە، حاڵی ناوێ.**

○ الف لیله برایش بخوان، حالی نمی‌شود.

● **واتە:** هەر چی لەو بارەوە شەرح و پەروایزی بۆ لێبدەیتەوە، تێناگا.

**١٤٧ـ ئەم ئاوە ئەو ئاسیاوە ناگەرێنێ.**

○ این آب، آن آسیاب را به حرکت در نمی‌آورد.

● **واتە:** ئەوەی پێویستە، بەم بەرهەمانە ساز نابێ.

**١٤٨ـ ئەم ئاوە، خراو رژیاگە.**

○ این آب بد جوری ریخته شده است.

● **واتە:**ئەم رەسم و یاسایە خراپ دامەزراوە.

**١٤٩ـ ئەم ئێژێ سیر و ئەو ئێژێ پیازا!**

○ این می‌گوید سیر و او می‌گوید پیاز.

● به دوو کەس ئەوترێ کە قسەیان یەک نەگرێ و بەردەوام بەرهەڵستی یەک بوێستن.

**١٥٠ـ ئەم بجوێنە و ئەو بفرێنە، جا ئەم کەرە لەم قورە دەربێنە!**

○ این را بجنبان و آن را تکان بده،آن گاه‌این خرراازاین گل در بیاور. (جنباندن دُم خر و تکان دادن گوش خر)

● به یەکێک ئەوترێ کە بۆ ئـەنجامی کـارێکی ئـاسان شـارەزا نـەبێ و پـێویست بکا ڕێنموونی بکرێ.

**١٥١ـ ئەم پەنچ ئەنگووسە وەک یەک نین.**

○ این پنج انگشت مثل هم نیستند.

● **واتە:**لە هەموو کەس، چون یەک نابێ چاوەڕوانی بکرێ.

**١٥٢ـ ئەم تۆزە لەم ئاگرە بوێتۆ، هەر خاسە.**

○ اگر این گَرد از این آتش به دست بیاید، باز هم خوب است.

● **واتە:** ئەم نەختە خێرەیش لەم زاڵمە دەس کەوتبێت، هەر باشە.

**١٥٣ـ ئەم دەس موحتاج ئەو دەس نەوێ.**

○ این دست محتاج آن دست نباشد.

● **واتە:** نیاز پەیداکردن بە نزیکترین کەسیش بۆ مرۆڤ، هەر تاڵە.

**١٥٤ـ ئەم دنیا وەسە سەرچۆپی، هەر تاوێ ها بە دەس یەکێکەو.**

○ این دنیا مانند چوپی است، هر زمانی در دست کسی است.

● **واتە:** دنیا دەوران دەورانە و هەرکاتێ بە مورادی یەکێ کە.

**١٥٥ـ ئەم ستوون تا ئەو ستوون فەرەجێکە.**

○ این ستون تا آن ستون فرجی است.

● **واتە:** مرۆڤ نابێ نائومێد بێ.

**١٥٦ـ ئەم کاسە بێ ژێرکاسە نی‌یە.**

○ این کاسه بدون زیر کاسه نیست.

● **واته:** له ژێر ئەم کارەدا فێڵ و فەرزێ هەیە!

**١٥٧ـ ئەم کێره مەترسه وکوزه مەلەرزه بەکار نایەت.**

○ این ترس و لرز فایده ندارد.

● **واته:** لەم کارەدا ترس و لەرز بەکار نایە.

**١٥٨ـ ئەم گشته کونه به من ناگیرگێ.**

○ این همه سوراخ بەوسیلۀ من بسته نمی‌شود.

● **واته:** ئەم هەموو عەیبه به من دروس نابێ.

**١٥٩ـ ئەم لام تات، ئەو لام تات، بابەگیان جیقم دەرهات!**

○ این طرفم تخته‌سنگ، آن طرفم تخته سنگ،پدرجان شکمم درآمد.

● کەسێ ئەمه ئێژێ که له تەنگانەیەکی دژواردا گیری کردبێ.

**١٦٠ـ ئەم مردگه، بەم شیوەنه نازێ.**

○ این مرده، شایستۀ این همه گریه و زاری نیست.

● **واته:** ئەم خەساره پێویستی بەم هەموو هاواره نی‌یه.

**١٦١ـ ئەم لای نیاگه ئەو لاوه، گووی کرگه هەتکوو لاوه.**

○ این طرف راگذاشته آن طرف و در هر دو طرف ریده است.

● **واته:** هەر دوو کاره کەی شێواندووه.

**١٦٢ـ ئەم نانه بەو رۆنه، داخۆم تامی چۆنه ؟**

○ این نان به آن روغن، آیا چه مزّه‌ای دارد ؟

● **واته:** دەسمان بەو دڵخوازه ناگا و مەگەر هەر له دوورۆ ئاخی بۆ هەڵ کێشین.

**١٦٣ـ ئەم وشتره چەرمگه له بەر ماڵ گش کەسا یخ ئەدات.**

○ این شتر سفید جلو خانۀ همه‌کس زانو خواهد زد.

● **واته:** مردن بۆ هەموو کەسه.

**١٦٤ـ ئەمە ترکەڵەکە!**

○ این تودهٔ بی اساس است.

● **واتە:** ئەم ئیشە، یان ئەم چتە ئاکامێکی نی‌یە و بە ئەنجام ناگا.

**١٦٥ـ ئەمە جوانیتە، تۆڵاش تۆڵاشە، قور بە سەر پیریت چ بەو قوماشە!**

○ این ریخت جوانی توست که از قواره افتاده‌ای، گِل به سر روزگار پیریت که به چه شکلی درخواهی آمد!

● بە یەکێکی کەم تەمەنی ناشیرین و هەڵشێواو ئەوترێ.

**١٦٦ـ ئەمە شیرینی خوەرانیە، زەماوەنی هالە دواوە!**

○ این شیرینی خوران اوست، عروسیش بعداً خواهد بود.

● بە تەوس ئەوترێ بە یەکێک کە تەزاندبێتیان و بەڵێنی بدەن کە جارێکی تریش لە ئێستا خراپتر ئەی تەزێنن.

**١٦٧ـ ئەمە مل من و ئەویشە چەقۆی تۆ.**

○ این گردن من و آن هم چاقوی تو.

● **واتە:** تەسلیمی تۆم، هەر چۆن جەزام ئەدەی، بیدە.

**١٦٨ـ ئەم هەورە بێ بارانە!**

○ این ابر بدون باران است.

● **واتە:** ئەم تووڕەیی‌یە ئاکامێکی نی‌یە.

**١٦٩ـ ئەم هەویرە ئاو فرەی گەرەکە.**

○ این خمیر آب زیاد می‌خواهد.

● **واتە:** ئەم کارە بەری درێژە.

**١٧٠ـ ئەم هێلکە لە بان ئەم تەنافەو ناوێسێ.**

○ این تخم مرغ روی این طناب نمی‌ایستد.

● **واتە:** ئەمە کارێکی نامومکینە و لە عەقڵ دوورە.

**١٧١ـ ئەو ئەسپە چەرمگە وا وتت، کوانێ ؟**

○ آن اسب سفیدی که وعده داده بودی، کو ؟

● **واتە:** بەڵێنێکت داوە و عەمەلت پێ نە کردووە.

**١٧٢ـ ئەو پیازە تۆ خواردگتە، من بە قنچکەکەی کایەم کردگە.**

○ آن پیازی که تو خوردەای، من با دمچۀ آن بازی کردەام.

● بە تەوس ئەوترێ بە یە کێکی بێ تەجروبە، واتە: ئەوە بۆ تۆ تازە ئەداتە چاو، من کۆنەم کردووە.

**١٧٣ـ ئەو ترە دایەو با تس بوایە، قوڵف کەمەرەکەی هەر مس بوایە!**

○ آن تیزی که داد کاش چُس می‌بود و قفل کمر بندش مس می‌بود.

● **واتە:** بریا ئەوەندە دەعیەی نەبوایە و کاری بە رسوایی نەی‌کێشایە.

**١٧٤ـ ئەو چاوە کوێر بێت، وا دوژمن خوەی نەناسێ.**

○ آن چشمی که دشمن خود را نشناسد، کور باد.

● **واتە:** مرۆڤ ئەبێ هۆشیار بێ و دۆست و دوژمنی خۆی بناسێ.

**١٧٥ـ ئەو خورما تۆ ئەی‌خوەی، من بە پێشەکەی کایەم کردگە.**

○ آن خرمائی را که تو می‌خوری، من با هستۀ آن بازی کردەام.

● **واتە:** تۆ کەم تەجروبەیت و ناتوانی من فریو بدەی.

**١٧٦ـ ئەو دۆوە هەر لایەق ئەو دۆوانەسە.**

○ آن دوغ لایق همان کیسۀ دوغ است.

● **واتە:** ئەو چتە قەڵبە هەر بۆ ئەو کەسە قەڵبە باشە.

**١٧٧ـ ئەو رۆژە وا با و بۆرانە، کەچەڵ سەرە شۆرانە.**

○ آن روزیکه باد و بوران است، کچل سرش را می‌شوید.

● بە یە کێکی وەخت نەناس ئەوترێ.

**١٧٨ـ ئەو سوارە و من پیادە.**

○ او سوار است و من پیاده.

● **واته:** من به ئەو ناگەم.

**١٧٩ـ ئەو شەرە هەر بۆ لێفەکەی مەلا بووا**

○ آن دعوا بر سر لحاف مُلاّ بود.

● به شەڕێکی زەڕنگەرانەو به درۆ ساز کراو ئەوترێ که له بەینی دو کەس دا به ئەنقەست پێک هاتبێ تا بتوانن چتێک له دەستی کەسێکی‌تر دەر بێنن!

**١٨٠ـ ئەو کاڵا لایەق ئەو باڵا.**

○ آن لباس شایستهٔ آن قد و بالا است.

● **واته:** ئەو کەسە لایەق ئەوکارەیە.

**١٨١ـ ئەو کەسە ماڵی له شیشه بێ، بەرد ناخا بۆ ماڵ مەردم.**

○ کسی که خانه‌اش شیشه‌ای باشد، به سوی خانهٔ مردم سنگ پرتاب نمی‌کند.

● **واته:** کەسێ خۆی ژن و کچ و ناموسی ببێ، به چاوی خەیانەت بۆ ژن و کچ و ناموسی خەڵکی ناڕوانێ.

**١٨٢ـ ئەو گوڵە زەوینە پاک بێت، خوەمی تیا دانیشم!**

○ آن‌نقطه زمین پاک باشد، که خودم در آن بنشینم.

● **واته:** تەنیا خۆم خۆشم بێت و رەحەت بم! قسەی کەسێکە وا تەنیا خێری خۆی ئەبینێ.

**١٨٣ـ ئەو مارە تۆی گەستگە، له بان سینەی منیچ پەپکەی بەستگە.**

○ آن مار که تو را گزیده، روی سینهٔ من هم چنبر زده است.

● **واته:** منیش تووشی ئەو دەردەی تۆم.

**١٨٤ـ ئەو نانە، نانە ؛ ئیمرۆ لە خوانە.**

○ نان واقعی آن نانی است، که امروز در سفره موجود باشد.

● **واته:** لەو چتە قسە بکە وا ئێستا مەوجوودە.

**١٨٥ـ ئەونە باوری پێ بکە بێژێ خوا هەس.**

○ آن قدر به او باور داشته باش که بگوید خدا هست.

● به یه کێکی زۆر درۆزن ئەوترێ که جێگەی باوەڕ نەبێ.

**١٨٦ـ ئەونه برۆ بۆ باوان، جلێ به ژێر بیاوان.**

○ آن اندازه به خانۀ پدری برو که زیراندازی به زیر تو بیندازند.

● **واته:** تەنانەت بۆ ماڵی باوکیش ئەونه بڕۆ، که سووک نەبی.

**١٨٧ـ ئەونه بوێسه تا گیا له ژێر پاتا سەوز ئەوێ!**

○ آن قدر معطّل شو تا گیاه زیر پایت سبز شود.

● **واته:** ماتڵ بوونت بێ سەمەره.

**١٨٨ـ ئەونه به شۆن دزا برۆ، لێت هەڵ نەگەرێتۆ.**

○ آن قدر دزد را تعقیب کن که برنگردد و با تو درگیر نشود.

● **واته:** له سەر ئەو کاره ئەونه مەڕۆ با خراپتر نەبێ.

**١٨٩ـ ئەونه بێ و بچۆ قەدرت نەچۆ.**

○ آن قدر بیا و برو که بی ارزش نشوی.

● **واته:** به هات و چووی زۆر مرۆڤ سووک ئەبێ.

**١٩٠ـ ئەونه چاو بنی به یەکا هەڵ ئەقوڵێ!**

○ آنقدر که چشم به هم بزنی، از زمین می‌جوشد.

● **واته:** هەر ئێستا دەرئەکەوێ و حازر ئەبێ.

**١٩١ـ ئەونه دەمت ئێشێ با پات بێشێ.**

○ آن قدر که دهانت را به زحمت می‌اندازی، بگذار پاهایت به زحمت بیفتد.

● **واته:** قسه کردن بەکار نایه، به شۆینیا بڕۆ.

**١٩٢ـ ئەونه سۆڵ بوو خانیش پێزانی.**

○ آن قدر شور بود خان هم فهمید.

● **واته:** ئەو عەیبه، زۆر گەوره و بەر چاو بوو.

نان و چێشتی خان ئەبوا بێعەیب بوایە، ئەگەر عەیبێکی ببوایە، ئاشپەزی ماڵی خان موجازات ئەکرا، جا لە هەمان کاتدا ئەگەر چێشتی میوانەکانیش سوێر بوایە بەڵام خان پێی نەزانیبایە قەیدی نەبوو!

**١٩٣ـ ئەونە شیرینە بە قوزەڵقورتەو ئەخورگێ!**

○ آن قدر شیرین است که با کوفت نیز خورده می‌شود.

● بە تەوس ئەوترێ بە خواردمەنی‌یەکی پیس و تاڵ یا بەکەسێکی بێ ئیخلاق وگۆشت تاڵ.

**١٩٤ـ ئەونە گەریاگە، دریاگە.**

○ آن قدر این جا و آن جا رفته است که گستاخ شده است.

● بە یەکێکی زۆر گەڕیە ئەوترێ کە حەیای بۆ نەمابێ.

**١٩٥ـ ئەو وشترە ئەگەر خاسە نەنەی خوەتی سوارکە!**

○ آن شتر اگر خوب است ننهٔ خودت را سوار کن.

● **واتە:** ئەو چتە ئەگەر باشە، موبارەکی خۆت بێ.

**١٩٦ـ ئەوە ئاو سارد و ئەویشە بەرەو ژوورەی قایم!**

○ آن آب سرد و آن هم سر بالائی تند.

● **واتە:** فەرموو هەرچی ئەکەی بیکە!

**١٩٧ـ ئەوە ئەوکردی، بایش بە دەوار شری ناکا.**

○ آن کاری که او کرد، باد هم با چادر پاره نکرد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر بە توندی لەگەڵ کەسێکی‌تردا روانڕوو بووبێ و قسەی تاڵی پێ کردبێ.

**١٩٨ـ ئەوە با بیرێتی، بە با ئەچێ.**

○ آنچه باد بیاورد، بر باد می‌رود.

● **واتە:** چتێک وا بۆ بەدەس هێنانی رەنجێ نەکێشرابێ، زوو لە دەس ئەچێ.

**١٩٩ـ ئەوە بۆ مێزکەر هەڵ ئەکەوێ، بۆ راوکەر هەڵ ناکەوێ!**

○ آن شانسی که برای شخص در حال رفع حاجت پیش می‌آید، برای شکارچی پیش نمی‌آید.

● **واتە:** شانس بۆ بێ‌دەسەڵات هەڵ ئەکەوێ.

**٢٠٠ـ ئەوە بە بێوەژنی ئەیکەی، بەکەنیشکی بتکردایەت!**

○ آن چه حالا در سن و سال بیوه بودن داری انجام می‌دهی، بایستی‌در زمان دختر بودنت انجام می‌دادی.

● بەکەسێ ئەوترێ کە ئێستا خەریکی پاراستنی عیسمەتی خوێ بێ ولەمەوپێش خۆی نەپاراستبێ.

**٢٠١ـ ئەوە خەتەنە سووران بوو، زەماوەن ها لە دواوە.**

○ آن ختنه سوران بود، مراسم عروسی بعداً صورت می‌گیرد.

● **واتە:** خراپتر لەمە، بە جەزا ئەگەیت.

**٢٠٢ـ ئەوە ساحێو ماڵ ئەزانێ، دز بیزانیایە هیچی نەئەهێشت.**

○ آن چه صاحب خانه می‌داند، اگر دزد می‌دانست چیزی باقی نمی‌گذاشت.

● چتێکی بەرچاوە.

**٢٠٣ـ ئەوە شۆر کەعبە ها لە سەریا، دەربەس درک موغەیلان نی‌یە.**

○ آن که شور کعبه در سر دارد، از خار مغیلان نمی‌هراسد.

● **واتە:** کەسێ کە گەرەکی‌بێ بە مەقسوودی خۆی بگا، هەرچۆنە عەزیەتێکی بۆ ئەکێشێ.

**٢٠٤ـ ئەوە شیرەی دواتە، بۆچە نۆک ئەخوەی ؟**

○ اگر این وضع گوارشی توست، چرا نخود می‌خوری ؟

● **واتە:** تۆ کە خۆت ئەناسی، بۆچی دەرگیری ئەم مەسئەلە ئەبی ؟

**٢٠٥ـ ئەوە کاور بازی بوو، ئەمە بەران بازی‌یە.**

○ آن چه دیدی برّه بازی بود، اما این که می‌بینی قوچ بازی است.

● **واته:** ئێستا فەرموو چاوم لێکە و بزانە چی ئەکەم نەک ئەوەی کە پێشتر کـردم و بەرچاو نەبوو.

**٢٠٦ـ ئەوە گوڵ ئەکەنێ، درکیش ئەچێ بە دەسیا.**

○ آن که گُل می‌چیند، خار نیز به دستش فرو می‌رود.

● **واته:** گەیشتن بە هەر ئامانجێ، ڕەنج و زەحمەتی پێویستە.

**٢٠٧ـ ئەوە لای بەنە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە.**

○ آن چیزی که نزد بندگان خدا خیال است، نزد خدا باطل است.

● **واته:** خەیاڵی مرۆڤ زۆر جار بە پووچەڵ دەر ئەچێ.

**٢٠٨ـ ئەوە وا پاکە، لە حەساو کردن بێباکە.**

○ آن که پاک است، از محاسبه بی باک است.

● **واته:** مرۆڤی پاک، لە هیچ پرس و جۆیەک ناترسێ.

**٢٠٩ـ ئەو ماسە بێ موو نی‌یە.**

○ آن ماست بی مو نیست.

● **واته:** ئەو کارە بێ عەیب نی‌یە.

**٢١٠ـ ئەونەی باوای عەیار ئەزانێ.**

○ به اندازهٔ بابای عیّار می‌داند.

● بە یەکێکی زۆر فێڵەباز و ساختەچی ئەوترێ.

**٢١١ـ ئەوە گا ئەیکا، گا نایخوا.**

○ آنچه از طریق شخم زدن گاو حاصل می‌شود خوراک گاو نمی‌شود.

● **واته:** مرۆڤ هەر بۆ خۆی هەوڵ نادا بەڵکوو کەسانی تریش ئەبێ لە سێبەری دەس ڕەنجی ئەو بحەسنەوە.

**٢١٢ـ ئەوەڵ ئەپرسن هاوسا وە زەنی، ئەو جار ئەپرسن باوک و فەرزەنی.**

○ اوّل دربارهٔ چگونگی رفتار آدمی با همسایه‌اش سؤال می‌کنند، سپس راجع به

رابطهٔ پدر و فرزندی از او می‌پرسند.

● **واته:** حەقی هاوسێ بە سەر هاوسێوە، زۆرترە لە حەقی باوک و فەرزەنی.

**۲۱۳ـ ئەوەڵ بەخت و تیکەی نەخت.**

○ اوّل بخت و لقمهٔ نقد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە هەوەڵی عومریەوە بەختێکی باش رووی تێ کردبێ.

**۲۱۴ـ ئەوە لە سەر رێگە گوو ئەکا، ئەشێ جوێنیش قەبووڵ بکا.**

○ آنکه در مسیر مردم رفع حاجت می‌کند، باید ناسزای دیگران را نیز قبول کند.

● بە یەکێکی بێ سەرە ئەوترێ کە پاراستنی مافی کەسان بەلایەوە گرینگ نەبێ.

**۲۱۵ـ ئەوە ماڵ ئەفرۆشێ، شەوێ تێرە و ئەوە ماڵ ئەسێنێ، شەوێ برسی‌یە.**

○ آن‌که خانه می‌فروشد، یک شب سیر است و آن‌که خانه می‌خرد، یک شب گرسنه است.

● **واته:** خانوو فرۆش لە خۆشی ئەو پارە واکەوتووەتە دەسی، دەس ئەکا بە هەڵە خەرجی و پارەکەی لە بەین ئەبا و ئیتر بەو خانووە وا فرۆشتوویەتی ناگاتەوە یان دێر ئەگا. بەڵام ئەوەی خانوو ئەسێنێ ئەگەرچی بۆ سەندنی خانوو ماڵی خۆی هەراج کردووە، پارەکەی بە فیڕۆ نەچووە و قازانجی کردووە.

**۲۱۶ـ ئەوە وا لای تۆ نەناسیاگە، لە کراس خوەیا هەر وەک تۆ پیاگە.**

○ آن کسی که از نظر تو ناشناخته است، در لباس خودش آدمی مثل تو است.

● **واته:** بۆ هیچ کەس بە چاوی سووکی مەڕوانە.

**۲۱۷ـ ئەوە وا لە کۆڵانا بۆرەی تێ، لە ماڵا سکی قۆرەی تێ.**

○ آنکه بیرون از خانه هارت و پورت می‌کند، در خانهٔ خود شکمش از گرسنگی قار و قور می‌کند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە ماڵەوە هیچی نەبێ بەڵام لە ناو خەڵکدا خۆی هەڵکێشێ.

**۲۱۸ـ ئەوە ها لە کاسا بە کەوچک دەرتێت.**

○ آنچه در کاسه است با قاشق بیرون می‌آید.

● هەموو چتێ تایبەتمەندی خۆی هەیە.

**٢١٩ـ ئەوە یا لە شارا نەوێت، شێرە.**

○ آن چیزی که در شهر یافت نشود، شیر است.

● **واته:**ئەو خۆ بە زل زانینە، هیچ و پووچە.

**٢٢٠ـ ئەیواتەکانی، ئاوی نات و ئەی تێرێتۆ.**

○ او را سَرچشمه می‌برد و آب نداده برمی‌گرداند.

● بە یەکێکی زیرەك ئەوترێ کە یەکێکی فەقیر و نەزان بخەڵەتێنێ.

**٢٢١ـ ئەیشوەرێ و ئەیشترێ!**

○ هم عوعو می‌کند و هم تیز می‌دهد.

● بە یەکێکی دەم هەراش و بێ حەیا ئەوترێ.

**٢٢٢ـ ئێژم نێرە، ئێژێ بیدۆشە!**

○ می‌گویم نر است، می‌گوید بدوش.

● بە یەکێك ئەوترێ کە قسەیەکی حاڵی نەبێ و لە سەر ئەو قسە پا دا بگرێ.

**٢٢٣ـ ئێژن کەچەڵ بۆچە زڵف دانانی؟ ئێژێ من لەم قرتی بازی‌یە خوەشم نایەت!**

○ می‌گویند کچل چرا زلف نمی‌گذاری؟ می‌گوید من از این قرتی بازی خوشم نمی‌آید.

● **واته:** مرۆڤ ئەگەر دەستی بە چتێ نەگا، لەو چتە عەیبی جۆراوجۆر ئەگرێ.

**٢٢٤ـ ئێژن کیسەڵ کاوێژ ناکات!**

○ می‌گویند لاک پشت نشخوار نمی‌کند.

● بە یەکێکی فەقیرۆکە و بێ دەم و زوان ئەوترێ کە لە ناکاو بێتە قسە کردن.

**٢٢٥ـ ئێژی ئاسمان کونا بووگە و تۆی لێ داکەفتگی!**

○ گوئی آسمان سوراخ شده است و تو فرو افتاده‌ای.

● لەکاتێکدا ئەوترێ کە لە ناکاو ئازیزێ بێت بۆ لات کە ماوەیەکی دوورە نەت دیوە.

**۲۲۶ـ ئێژی ئاسیاوێکە و ئاوی کەفتگە.**

○ گوئی آسیابی است و آب آن قطع شده است.

● بە جێگایەکی بێدەنگ و کش و مات ئەوترێ.

**۲۲۷ـ ئێژی ئاگر ها لە دەمیا!**

○ گوئی آتش در دهان دارد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر توند و بە پەلە قسە بکا.

**۲۲۸ـ ئێژی ئاڵەتیان تێ کردگە.**

○ گوئی فلفل به او استعمال کرده‌اند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە قەرار و ئارامی نەبێ.

**۲۲۹ـ ئێژی ئەنەون لە مووی بەری!**

○ گوئی موی عورت او را می‌کشند.

● بە یەکێکی توورە و ئاڵۆز ئەوترێ.

**۲۳۰ـ ئێژی بۆ ئاگر هاتگە.**

○ گوئی برای بردن آتش آمده است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بۆ کارێ هاتبێ و بۆ گەڕانەوەیش زۆر پەلەی بێ.

**۲۳۱ـ ئێژی بەچە خوەرە ها لە زکیا!**

○ گوئی بچّه خوار (در پزشکی پولیپ رحم) در شکم دارد.

● بە یەکێکی زۆر خۆر ئەوترێ کە هەر لە تێر بوون نەبێ.

**۲۳۲ـ ئێژی بە دوو نق و نیم کردگیەسی!**

○ گوئی بادو و نیم بار زور زدن او را زاییده است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە منالی کەسێکی تری زۆر خۆش گەرەک بێ و بە زکی خۆیەوەی بلکێنێ.

**٢٣٣ـ ئێژی بە دەم دای نیاگە.**

○ گوئی آن بچە را از طریق دهان زاییده است.

● بە منالێ ئەوترێ کە زۆر لە باوک یان دایکی بچێ.

**٢٣٤ـ ئێژی بەرد ئەداتە مل بەردا.**

○ گوئی سنگ بر روی سنگ می‌کوبد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر بە توورەیی یان بە پەلە قسە بکا.

**٢٣٥ـ ئێژی پیرەژن دۆ رژیاگە.**

○ گوئی پیرزنی است کە دوغش ریختە شدە باشد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەر لە بەر خۆیەوە بۆڵەی بێ.

**٢٣٦ـ ئێژی تفیان کردگەسە دەم یەک.**

○ گوئی در دهان یکدیگر تف ریختەاند.

● بە دوو کەس ئەوترێ کە لە بابەتێکدا، هەر وەکوو یەک قسە بکەن.

**٢٣٧ـ ئێژی تیکەگیریاگەسە قورگی.**

○ گوئی لقمە در گلویش گیر کردە است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر بە دەمار بێ و لە گەڵوداقسە بکا.

**٢٣٨ـ ئێژی تینگ بەر ئاوە.**

○ گوئی تشنۀ بە آب رسیدە است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر بە تاسەی دیتنی کەسێکی تر بێ.

**٢٣٩ـ ئێژی جاوگ ئەنێتۆ.**

○ گوئی کرباس می‌بافد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە جێگایەکا زۆر هات و چوو بکا.

**٢٤٠ـ ئێژی جنۆکە پیاتسیاگە!**

○ گوئی جن بە سر و رویش چُسبیدە است.

● بە مناڵێکی زۆر لەڕو لاواز ئەوترێ.

**٢٤١ـ ئێژی جنۆکە گۆچی کردگە!**

○ گوئی جن پستان در دهانش گذاشته است.

● بە مناڵیکی تازە پەیدا بووی لەڕو لاواز ئەوترێ.

**٢٤٢ـ ئێژی جنۆکە گووشاگیە!**

○ گوئی جن فشارش داده است.

● بە یەکێکی زۆر لاواز ئەوترێ.

**٢٤٣ـ ئێژی جیوەی تێ کریاگە!**

○ گوئی جیوه به او استعمال شده است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە نەتوانێ لە جێگای خۆیا دابسرەوێ و هەر جووڵەی بێ.

**٢٤٤ـ ئێژی حمام ژنانەس!**

○ گوئی حمّام زنانه است.

● بە جێگایەکی زۆر قەرەباڵغ ئەوترێ کە کەس قسەی کەسی حاڵی نەبێ.

**٢٤٥ـ ئێژی خوەڵ مردگیان پژانگە بە سەریانا.**

○ گوئی خاک مرده بر سرشان پاشیده‌اند.

● بە جەماعەتێ ئەوترێ کە کش و مات بن و هیچ جم و جووڵێکیان نەبێ.

**٢٤٦ـ ئێژی دەورەی محەمەد و مایی‌یە.**

○ گوئی دورهٔ محمّد و مهدی است.

● بە عەهد و زەمانێکی ئەمن و ئارام ئەوترێ.

**٢٤٧ـ ئێژی رۆن قازیان لێ داگە!**

○ گوئی روغن غاز به تنش مالیده‌اند.

● بە یەکێکی بە دەماخ و سەر حاڵ ئەوترێ.

**٢٤٨ـ ئێژی رۆن ورچیان لێ داگە!**

○ گوئی روغن خرس به تنش مالیده‌اند.

▣ وه‌کوو قسه‌ی پێشووه.

**٢٤٩ـ ئێژی سەگ پا سووتیاگە.**

○ گوئی سگ پا سوخته است.

● به یه‌کێکی گه‌ڕال ئه‌وترێ.

**٢٥٠ـ ئێژی سەگ هارە.**

○ گوئی سگ هار است.

● به یه‌کێکی بێ‌حه‌یا ئه‌وترێ.

**٢٥١ـ ئێژی سەوەتەی پەت بریاگە.**

○ گوئی سبدی است که بند آن گسسته باشد.

● به یه‌کێکی ته‌نیاکه‌وتوو ئه‌وترێ.

**٢٥٢ـ ئێژی سێفێکن وکریاگنە دووکوتۆ.**

○ گوئی سیبی‌اند و دو نصف شده‌اند.

● به دوو که‌س ئه‌وترێ که له رواڵه‌تدا زۆر له یه‌ک بچن.

**٢٥٣ـ ئێژی شەقول قەمەری کردگە!**

○ گوئی شقّ‌القمر کرده است!

● **واته:** وا ئه‌زانێ کارێکی زۆر گرینگی کردووه!

**٢٥٤ـ ئێژی عاسای قووت داگە!**

○ گوئی عصا قورت داده است!

● **واته:** به یه‌کێک ئه‌وترێ که ره‌ق و قوت و سه‌ر بۆ ئاسمان بچێ به رێگه‌دا.

**٢٥٥ـ ئێژی عیساگردگیە و مووسا فووی تێ‌کردگە!**

○ گوئی عیسی او را گرفته و موسی در او دمیده است.

● بە یەکێکی چاخ ئەوترێ.

**٢٥٦ـ ئێژی فاتەی سوورەوانە.**

○ گوئی فاطمۀ سورەبان است.

● بە یەکێکی ئاژاوەچی و شەڕچاخ کەر ئەوترێ!

**٢٥٧ـ ئێژی کاسەی چەورە.**

○ گوئی کاسەی چرب است.

● بە یەکێکی بەدناو ئەوترێ، کە هەموو کەس خۆی لێ لابدا.

**٢٥٨ـ ئێژی کاسەی قەرەچی ئاو بردگیەسی!**

○ گوئی کاسۀ کولی را آب بردە است.

● بە جێگایەکی زۆر قەرەباڵغ ئەوترێ.

**٢٥٩ـ ئێژی کتکە نەفتینەس!**

○ گوئی گربۀ نفت‌آلود است!

● بە یەکێکی شەڕ هەڵگرسێنەر ئەوترێ.

**٢٦٠ـ ئێژی کورد دۆ نەدیگە.**

○ گوئی کُرد دوغ ندیدە است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە خواردنا، هەوڵ بێ.

**٢٦١ـ ئێژی ...کەمتیاری ها پێوە!**

○ گوئی ... کفتار بە همراە دارد!

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەموو کەس خۆشیان گەرەک بێ.

**٢٦٢ـ ئێژی کوێر سپێ مشت کەفتگە!**

○ گوئی کوری است کە شپش یافتە است.

● بە یەکێکی رژد ئەوترێ کە هیچ لە دەستی دەرنەیە.

**٢٦٣ـ ئێژی کەر چەرچی‌یە.**

○ گوئی خر شخص روغن چی است.

● بە یە کێکی زۆر گەڕاڵ ئەوترێ کە سەر بکا بە هەموو ماڵێکا.

**٢٦٤ـ ئێژی کەڵەشێر ناوەختە.**

○ گوئی خروس ناوقت است.

● بە یە کێکی وەخت نەناس ئەوترێ.

**٢٦٥ـ ئێژی کەنیشکە جافیان بۆ داوەزانگە.**

○ گوئی دختر جاف برایش عقد کرده و به خانه‌اش آورده‌اند.

● بە یە کێک ئەوترێ کە هەر لە سەر ئێوارەوە بخزێتە ماڵۆ.

**٢٦٦ـ ئێژی گۆچانی قووت داگە.**

○ گوئی عصا قورت داده است.

● بە یە کێکی فیزن ئەوترێ کە رەق وتەق بڕوا بە رێگەدا.

**٢٦٧ـ ئێژی گورپەی گیپە خانەس.**

○ گوئی گربۀ کلّه‌پزی است.

● بە یە کێکی زۆر چاخ و قەڵەو ئەوترێ.

**٢٦٨ـ ئێژی گول بەخێڵە.**

○ گوئی جذامی حسود است.

● بە یە کێکی دڵ پیس و بەخێڵ ئەوترێ.

**٢٦٩ـ ئێژی گوێزی بۆ ئەژمێرن.**

○ گوئی گردو برایش می‌شمارند.

● بە یە کێک ئەوترێ کە گوێی بەلای قسەی مەردمەوەنەبێ.

**٢٧٠ـ ئێژی گەدای سامەرەس.**

○ گوئی گدای سامرّا است.

● بە یەکێکی تووش ئەوترێ کە هەر دەس هەڵگر نەبێ.

### ٢٧١ـ ئێژی گەنەی گون گاس!

○ گوئی کنەی چسپیدە بە بیضەی گاو است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە دەس لە یەخەی مرۆڤ هەڵنەگرێ.

### ٢٧٢ـ ئێژی گیا ورەی کرد.

○ گوئی گیاه خوردە و شکمش پارە شدە.

● بە یەکێک ئەوترێ لە ناکاو بمرێ.

### ٢٧٣ـ ئێژی گێسک سەلەمە.

○ گوئی بزغالەی سلم (پیش فروش) است.

● بە یەکێکی لەڕو لاواز ئەوترێ.

### ٢٧٤ـ ئێژی لۆتی‌یەو مەیموونەکەی تۆپیگە.

○ گوئی لوطی است و میمونش مردە.

● بە کەسێکی دەم هەراش بەڵام خەمبار ئەوترێ کە ئێستا لە قسە کەوتبێ.

### ٢٧٥ـ ئێژی لە دەم رەش بەربووگە.

○ گوئی از دهان سیاه رها شدە است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە خواردنا هەوڵ و دەسەپاچە بێ.

### ٢٧٦ـ ئێژی لە دەم هار بەربووگە.

○ گوئی از دهان هار رها شدە است.

▣ وەکوو مەسیلەی پێشوو.

### ٢٧٧ـ ئێژی لە قاتی ساڵێۆ هاتگە!

○ گوئی از قحط سالی آمدە است.

● بە یەکێکی هەوڵخۆر یا کەسێکی لەڕو لاواز ئەوترێ.

**٢٧٨ـ ئێژی لە گوێچکەی گادا خەفتگە!**

○ گوئی در گوش گاو خوابیده است!

● بە یە کێکی غافڵ و بێ‌خەبەر لە وەزعی مەوجوود ئەوترێ.

**٢٧٩ـ ئێژی لە گەل جێ ماگە!**

○ گوئی از کاروان عقب افتاده است.

● **واتە:** زۆر پەلە یەتی.

**٢٨٠ـ ئێژی لە لووت فیڵ داکەفتگە.**

● گوئی از دماغ فیل فرو افتاده است.

● **واتە:** زۆر لە خۆ رازی و قوڵم و لووت بەرەوژووره.

**٢٨١ـ ئێژی ماڵی دزیاگە (یا: بریاگە).**

○ گوئی اموالش دزدیده شده است.

● بە یە کێکی فزوول ئەوترێ کە سەر بە هەر جێگایە کا بکا بۆ ئەوەی سەر لە چتێ دەر بێنێ.

**٢٨٢ـ ئێژی مامر ئاسیاوانە.**

○ گوئی مرغ آسیابان است.

● بە یە کێکی بێ حەیا ئەوترێ کە دەس هەڵ گر نەبێ و هەرچی دەری کەی، هەر بێتۆ.

**٢٨٣ـ ئێژی مامرە و نانی کەفتگەسە کولانجا.**

○ گوئی مرغ است و نانش از سوراخ پشت بام پایین افتاده است.

● بە یە کێک ئەوترێ کە بۆ هەرچی جێگەیە سەر بکێشێ.

**٢٨٤ـ ئێژی مردگە و بەش زینگ ئەخوا.**

○ گویی مرده است و سهم زنده را می‌خورد.

● بە یە کێکی تەمەڵ ئەوترێ کە بۆ ژیانی خۆی هەوڵ نەدا و لە دەس‌رەنجی خەڵك بژی.

**٢٨٥ـ ئێژی مرۆچەی خواردگە!**

○ گوئی مورچه خورده است.

● به یه کێک ئەوترێ که بای زکی خۆی پێ ڕاگیر نه کرێ.

**٢٨٦ـ ئێژی مووسایی‌یه‌که‌ی زرێواره.**

○ گوئی یهودی دریاچه‌ی زریوار است.

● به یه کێک ئەوترێ که دوای ئەوەی خه‌تەر به سەر چوو بێ، له خه‌تەره که تێ‌بگا و بترسێ.

**ئەمە حیکایەتی ئەو جوولەکەیە** کە لە زمسانا چوو بۆ مەریوان و لەگەڵ هاوڕێ کەیدا لە سەر یەخی دەریاچەکە تێپەڕ بوون، بێ ئەوەی بزانێ ئەمە ئاوی یەخ بەستووی دەریاچەکە بوو کە بە سەریا ڕۆیشتن. وەختێ لەو بەری ئاوەکەوە ڕەفیقەکەی پێی ئێژێ ئەمە دەریاچەی زرێوار بوو کە بە سەریا هاتین‌و خەتەریکمان بۆ نەبوو! مووسایی کەلەزاور هەر ئەمە ئەبیسێ، لە ترسا هاوار ئەکا و ئەکەوێ و لە سەر خۆی ئەچێ!

**٢٨٧ـ ئێژی موویان هەڵ‌کزانگە.**

○ گوئی موی او را سوزانده‌اند.

● به یه کێک ئەوترێ که کوتووپڕ له جێگه‌یه کا حازر ببێ.

**٢٨٨ـ ئێژی مێش نەی‌گەستگە!**

○ گوئی مگس او را نگزیده.

● به یه کێک ئەوترێ که بەڵایه‌ک رووی لێ دابێ، بەڵام ئەو نەی خاتە خۆی.

**٢٨٩ـ ئێژی نان ساجی‌یه.**

○ گوئی نان روی ساج (تابهٔ فلزی) است.

● به یه کێکی ڕێک و پێک و جوان ئەوترێ.

**٢٩٠ـ ئێژی نان هەورامی‌یه.**

○ گوئی نان اورامی است.

● به یه کێکی ڕێک‌وپێک و جوان ئەوترێ.

**٢٩١ـ ئێژی نیسکە، بەر و پشتی بۆ نی‌یە.**

○ گوئی عدس است، پشت و رو ندارد.

● بە یەکێکی دوو روو ئەوترێ.

**٢٩٢ـ ئێژی وەوی‌یە و ئەسپیان بۆ زین کردگە.**

○ گوئی عروس است و اسب برایش زین کردەاند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە خۆی بۆ کارێ حازر کردبێ بەڵام هیچ پێویستی‌یەک بەو نەبێ.

**٢٩٣ـ ئێژی هێلکەی دووزەردێنەی بۆم کردگە!**

○ گوئی تخم دو زرده برایم گذاشته است!

● **واتە:** ئێژی کارێکی زۆر گرینگی کردووە.

**٢٩٤ـ ئیسە بووبە نان و پیاز، ئەویش قات و نیاز.**

○ حالا تبدیل شد به نان و پیاز، آن هم با قحطی و نیاز روبرو شد.

● **واتە:** بەو بەشە کەمەیش رازین، بەڵام ئەویش دەس ناکەوێ.

**٢٩٥ـ ئیمرۆ دنیاس و سۆزی قیامەت.**

○ امروز دنیا است و فردا قیامت.

● **واتە:** بیری قیامەتت بەلاوە بێ و هەڵە مەکە.

**٢٩٦ـ ئیمرۆ، سۆزی هابە شۆنیۆ.**

○ امروز، فردا را به دنبال دارد.

● **واتە:** بیری دوا رۆژت بەلاوە بێ.

**٢٩٧ـ ئیمرۆ لە تۆ، سۆزی لە من.**

○ امروز تو دچار شدەای، فردا نوبت من است.

● **واتە:** دنیا بۆ کەس لە سەر یەک قەرار نی‌یە.

**٢٩٨ـ ئیمرۆ لە منە، سۆزی لە تۆوە.**

○ امروز من دچار شدەام، فردا نوبت توست.

◘ وەکوو مەسیلەی پێشووە.

**٢٩٩ـ ئیمرۆ و سۆزی ئەکا.**

○ امروز و فردا می‌کند.

● بە کەسێک ئەوترێ کە تەفرە بخاتە کارێ.

**٣٠٠ـ ئینسان وەختێ باری لاروێت، بە مووسایی ئێژێ: خاڵۆ!**

○ آدمی وقتی که بار اقبالش کج شد، ناچار می‌شود که به یهودی بگوید: دائی!

● **واتە:** تەنگ و چەڵەمەی ژیان، مرۆڤ موحتاجی کەس و ناکەس ئەکا.

# ب

**١- باته لای مارا، جووچکەی (کلکی) ئەقرتنێت. (ئەورێت، ئەبرێ).**

○ از کنار ما بگذرد، دُمش را قطع می‌کند.

● **واته:** زۆر فێڵباز و چاوبەسکەر و کڵاوبەرداره.

**٢- باجی ماتاوان، هاتۆ بۆ باوان.**

○ باجی ماه تابان به خانۀ پدری برگشت. معادل: (مال بد بیخ ریش صاحبش)

● **واته:** ماڵ قەڵب سەر بە ساحێوه.

**٣- باخاکیش زۆر بێ، گۆر بە ئەنازه.**

○ اگر چه زمین نیز زیاد باشد، ولی قبر به اندازه معمول آن باید کنده شود.

● **واته:** هەر چتێ ئەندازەی خۆی هەیه.

**٤- باخەوان لە وەخت هەنگوراکەره! (یا: گوێچکەی ناژنەوێ)**

○ باغبان در فصل انگور کَر است.

● **واته:** مرۆڤی گەن و رژد گوێی لە بیستنی نیازی خەڵک کەڕه.

**٥- باخیان بە بەره، هەرکە بیخوا، هەرگ بە سەره!**

○ باغشان به ثمر رسیده است، هرکه‌از آن بخورد، گِل بر سراست.

● **واته:** قوڕ بە سەر ئەو کەسەی موحتاجی ناکەس بێ.

**٦- باخی بە بەرە.**

○ باغش به ثمر رسیده است.

● بەکەسێ ئەوترێ کوڕ وکچی، وەختی ژن هێنان و شوو کردنیان بێ.

**٧- باران ئەوارێتە مل خوڵەکەوانا.**

○ باران بر روی تودهٔ خاکستر می‌بارد.

● **واتە:** بارانی رەحمەت لە خاس و خراپ ناپرسێ و بە سەر هەموو لایەکا ئەبارێ.

**٨- باران بوارێ ئاسیاوی ئەگەرێ، باران نەوارێ جفتی ئەگەرێ.**

○ باران ببارد آسیابش کار می‌کند، باران نبارد زمین را شخم می‌زند.

● **واتە:** ئەوکەسە لە هەر حاڵەتدا دەس بەکارە. یا: نان بە نرخی رۆژ ئەخوا.

**٩- بار بۆ کەر و خواردن بۆ یابوو.**

○ بار برای الاغ و خوردن برای یابو.

● **واتە:** هەر چتێ یا هەر حەیوانێ تایبەتمەندی‌یەکی هەیە.

**١٠- بار سۆک زوو ئەگەیەتە مەنزڵ.**

○ بار سبک زود به منزل می‌رسد.

● **واتە:** خۆت بە ماڵی دنیاوە سەرقاڵ مەکە چونکە هەرچی کەمترت بێ رەحەت‌تری.

**١١- بار لار ناگەیەتە هەوار.**

○ بار کج به منزل نمی‌رسد.

● **واتە:** کاری ناتەواو بە ئاکام ناگا.

**١٢- بار لە باج ناناڵێ.**

○ بار از دادن مالیات نمی‌نالد.

● **واتە:** خاوەن بار ناڵەی دێ ئەگەر باج بدات، بەڵام بار قسەیەکی نی‌یە.

**١٣- بار من هەر چل مەنە.**

○ بار من همان چهل من است.

● **واته:** لە هەر حاڵەتدا، ئەرکی سەرشانی من کەم نابێ.

**١۴ـ بارەگوێزی لێ بنە خرەی نایەت!**

○ بار گردو روی کولش بگذار از آن صدائی بلند نمی‌شود.

● **واته:** ئەو کەسە زۆر نەرم و تەسلیمە.

**١۵ـ بارە هێلکەی لێ بنە لەخشە ناکا!**

○ بار تخم مرغ روی کولش بگذار تکان نمی‌خورد.

▣ بڕوا بۆ: «بارەگوێزی لێ بنە ...»

**١۶ـ بارێ تفەنگ بنە لە کەر گورگ هەر ئەی درێ.**

○ یک بار تفنگ بر الاغ بار کن، باز هم گرگ الاغ را می خورد.

● **واته:** کەسێ لە زاتی خۆیدا غیرەتی نەبێ، چت و مەکی ئازایەتی غیرەتی پێ نادا.

**١٧ـ باریکان ئەرێسێ.**

○ نخ می‌ریسد.

● **واته:** زۆر وێژە.

**١٨ـ باری ناگەیەتە هەوار.**

○ بارَش به منزل نمی‌رسد.

● **واته:** لەم کارەدا سەر ناکەوێ.

**١٩ـ بارە شاری تێتۆا!**

○ بارش از شهر برمی‌گردد.

● **واته:** زۆر بەم کارە شادمانە.

**٢٠ـ بارەقەڵا دوگمە لچە، حەفت شووی کردگە و هێشتا کچە!**

○ آفرین بر این دکمه لب، هفت شوهر کرده و هنوز ادّعا می‌کند که دختر است!

● بە بێوەژنێکی بێ عەقڵ ئەوترێ کە وەکو کچان ناز و عیشوە بفرۆشێ.

**٢١ـ باز لە بازگەدا ئەگیرگێ.**

○ باز در بازگاه شکار می‌شود.

● **واتە:** هەر ئیشێ لە کات و جێگای خۆیائەبێ ئەنجام بدرێ.

**٢٢ـ بازەکەی عەتاخانە، مامر راو ئەکات!**

● باز عطا خان است، مرغ خانگی شکار می‌کند.

● **واتە:** حیز بە خاڵۆی خۆ فێرە!

عەتا خان بازێکی ڕاوی بووە، کاتێ کە بەر ئەدرا بۆ سەر نەچیر، بە جێگەی ئەوە بچێ کەروێشک و نەچیری‌تر راو بکا، راس ئەهاتۆ بۆ ماڵۆ و مریشکەکانی ماڵی عەتاخانی راو ئەکرد!

**٢٣ـ با سیر بخوا و سورنا بژەنێ.**

○ بگذار سیر بخورد و سُرنا بزند.

● **واتە:** با هەر قسەی بێ‌جێگە بکا.

**٢٤ـ با شێر بتخوا بەڵام پەنا مەوەرە رێوی.**

○ بگذار شیر تو را بخورد اما به روباه پناهنده مشو.

● **واتە:** بە دەسی مرۆڤی گەورە بکوژرێیت باشتر لەوەیەکە بۆ نەجاتی خۆت، منەتی نامەرد بکێشی.

**٢٥ـ باگوڵێ بێتەو لەکانی!**

○ صبر کن «گلی» از چشمه برگردد.

● **واتە:** بێ‌خود ماتڵ ئەبی چونکە کەڵک وەرناگری.

**٢٦ـ باڵابووچک رۆژێ حەفت دەفعە ئەوێتە شا و هەر ها لە جێگەی خوەیا!**

○ قدکوتاه روزی هفت مرتبه شاه می‌شود و باز هم سر جای خودش باقی است.

● **واتە:** مرۆڤی باڵا بچووک هەر وا لە بیری ئەوەداکە رۆژێ سەرکەوتووتر لە هەموو بێ.

**٢٧ـ بالّدار بڕویّ بالّی ئەرزێنیّ، نالّدار بڕویّ نالّی ئەشکێنیّ.**

○ بالدار برود بالش را می‌ریزد، نعل دار برود نعلش را می‌شکند.

● **واته:** ئەوەندە زۆرداره کەس پێی ناوێریّ.

**٢٨ـ بالّەوازە بووگە!**

○ پر در آورده است.

● بە گەنجێکی تازە پیّ گەیشتو ئەوتریّ کە دەسی کردبیّ بە دلّداری.

**٢٩ـ بانگ موحەممەیی بە ئاشکرا خوەشە.**

○ اذان محمّدی آشکارا خوش است.

● **واته:** قسەی حەق ئەبیّ روون و ئاشکرا بوتریّ.

**٣٠ـ بانێکە و دوو هەوا.**

○ یک بام است و دو هوا.

▣ بۆ حیکایەت و مانای ئەم مەسیلە بڕوانە بۆ پیتی «ئ»: ئاوەدان بیّ شاڵیاوا، بانێکە و دوو هەوا.

**٣١ـ باوک بیّ براو ئامۆزاگ فرە!**

○ پدر بی برادر و عموزاده فراوان!

▣ بڕوانە بۆ پیتی «ئ»: ئامۆزای فرە و باوک بیّ‌برا!

**٣٢ـ باوک خوەی نە دیبوو، ئەی‌وت کور حەمە شای قاجارم!**

○ پدر خودش را ندیده بود، می‌گفت پسر محمّد شاه قاجار هستم.

● بە کەسێکی بیّ وجوود ئەوتریّ کە گەورە کی بیّ بە درۆ بە خۆی بایەخ بدا.

**٣٣ـ باوک گوناح ئەکا و ئەولاد پیّ گیر ئەکا.**

○ پدر گناه می‌کند و فرزند به عقوبت آن گرفتار می‌شود.

● **واته:** تاوانی هەڵەی باوک ئەبیّ ئەولادەکانی بیدەنۆ.

**٣٤ـ باوکمان براو تۆ لە من ماقوولّترا!**

○ پدرمان برادر و تو از من نجیب‌تر!

● به یه کێک ئەوترێ که خۆی له برادەرانی هاومالّی به ماقووڵتر بزانێ، کەچی وایش نەبێ.

**٣٥- باوکم دیار نی‌یه و ئێژن پیاگێکیش گورگ خواردگیەسی!**

○ پدرم پیدایش نیست و می‌گویند گرگ نیز مردی را خورده است!

● به کەسێ ئەوترێ که به خەبەرێکی ناخۆش بزانێ و به ئەنقەست خۆی بدا له نەزانی.

**٣٦- باوک مردگ وازی هاورد، ئاو وگۆشت خوەر واز نایەرێ.**

**(...ئاو وگۆشت خوەر ئەی‌وت: ئەی‌گەیەنمە حەقه جێگە).**

○ پدر مرده ول کرده است، آبگوشت خور ول نمی‌کند.

● **واته:** خاوەن پرسه دەسی له پرسه کێشاوە، بەڵام مفت‌خۆر دەس بەردار نی‌یه.

**٣٧- باوک من باوک تۆی نەدیگە!**

○ پدر من، پدر تو را ندیده است!

● **واته:** هەر نات ناسم.

**٣٨- باوەلێ باوێکی بەسە.**

○ بابالی را فرصتی بس است.

● به یه کێک ئەوترێ که هەر ئەوەندە دەرفەتێکی بۆ بڕەخسێ ئیتر دەس‌هەڵگر نەبێ.

**٣٩- باوێت و باران وێ، هەر له عومر بەفرکەم ئەوێتۆ.**

○ باد باشد یا باران، در هر حال از عمر برف کاسته می‌شود.

● **واته:** خاس پێش بێت یا خراپ، هەر ئەو زەرەر ئەکا.

**٤٠- باوێشکی بۆ ئەدا.**

○ برایش خمیازه می‌کشد.

● **واته:** گوێ به قسەی ئەونادا. بیری به لای قسەی ئەو کەسەوە نی‌یه.

**٤١- بای بێ شەن ئەکا و باران بوارێ ئاسیاوی ئەگەرێ.**

○ باد بوزد گندم را شانه می‌کند، و باران ببارد آسیابش کار می‌کند.

● **واته:** ئەو کەسە لە هەر حاڵەتێکدا دەس بە کارە.

ئەم مەسیلە مانای تەوسیشی هەیە واتە: ئەو کەسە بە نرخی رۆژ نان ئەخوا.

**۴۲- بای کردە قولی.**

○ در قوزک پای او دمید.

احمق را ستایش خوش آید، چون لاشه که در کعبش دمی، فربه نماید.

*(گلستان سعدی)*

● **واته:** بە باڵایا خوێندی و فریوی دا.

**۴۳- بچمە سەر سیروان وشک ئەوێ.**

○ به کنار رودخانهٔ سیروان بروم خشک می‌شود.

● **واته:** زۆر بەد شانسم.

**۴۴- بچمە شارێ کەس نەم ناسێ، خوەم هەڵ کێشم پر کراسێ.**

○ به شهری بروم که هیچکس مرا نشناسد، در آنجا به دلخواهم از خود تعریف کنم.

● **واته:** لە جێگایەکدا خۆت هەڵ کێشە، کەس نەت ناسێ.

**۴۵- بچێ بۆکوچک سەر خوەی پێ بشکنێ، ناییەن پێ.**

○ اگر سنگ بخواهد تا سر خودرا با آن بشکند، به او نمی‌دهند.

● بە کەسێ ئەوترێ کە خەڵکی زۆر لێی بێزار بن.

**۴۶- بخورە بەڵام مەورە.**

○ خشمگین بشو ولی اهانت مکن.

● **واته:** بە سەر ژێردەسەدا، دابخوڕە بەڵام خراپیان پێ مەیەژە.

**۴۷- بخەفە با بیێتە خەوت!**

○ بخواب تا آن را در خواب ببینی.

● **واته:** مەگەر بەو ئارەزوووەت، لە خەوا بگەی!

**٤٨- برا بوو بە برازا، کار لە کار ترازا.**

○ وقتی که جای برادر را برادرزاده گرفت، دیگر کار از کار گذشته است.

● **واتە:** برازا جێگەی برا ناگرێتۆ.

**٤٩- برا حەز بە مەرگ برا ناکا، بەڵام حەز بە رەجاڵی برا ئەکا!**

○ برادر مرگ برادرش را نمی‌خواهد، امّا گدایی و نداری او را آرزومند است.

● بە برای خراپ ئەوترێ کە چاوی دیتنی سەرکەوتنی برای خۆی نی‌یە.

**٥٠- برا لە پشت برا وێ، قەزا لە لای خوا وێ.**

○ اگربرادر پشتیبان برادر باشد، جز به قضای الهی شکست نمی‌خورند.

● **واتە:** پشتیوانی‌کردن برا لە یەک‌تری، ئەیانکا بە هێزێکی قەوی کە قەزای خوای لێ بگەڕێتۆ، کەس زەفەریان پێ نابا.

**٥١- برامان برایی، کیسەمان جیایی.**

○ برادریمان به جای خود، امّا کیسهٔ خرج ما جدا باشد.

● **واتە:** بۆ ئەوەی برایمان نەشێوێ، با حیسابی خەرجمان جیا بێ.

**٥٢- برا و براژن تێریان خوارد و پاڵیان داوە، خوەیشک بێ شێو سەری نیاوە!**

○ برادر و زن برادر سیر خوردند ولم دادند، اما خواهر با شکم گرسنه خوابید.

● **واتە:** ئەو کاتەی کە باسی سوودی کەسێ دێتە ئاراوە، برای خراپ خوشکی برسی خۆی لە بیر ئەباتۆ.

**٥٣- برای گزیرە.**

○ برادر پیشکار (یا: پاکار) است.

«گزیر» پاکاری ئاغا بووە لە گوندەکانا و زۆر زاڵم بووە و رەعیەتەکان لێی ترساون.

● **واتە:** ئەو کابرایشە هەر وەکوو گزیر، فتنە و دەغەڵە.

**٥٤- برسی، خوەراکی نی‌یە و دەوڵەمەن، ئیشتیها!**

○ گرسنه خوراک ندارد و ثروتمند اشتها.

● **واتە:** هەژار نی‌یەتی بیخوا و دەوڵەمەن دڵی نایە بیخوا!

**٥٥ـ برسی مەنێرە بۆ نان و جووانیش مەنێرە بۆ خوازبێنی.**

○ گرسنه را برای خریدن نان و جوان را برای خواستگاری مفرست.

● **واتە:** برسی هەر خواردەمەنی‌یەکی پێ‌بدەن چونکە برسیەتی وەری ئەگرێ و لە خاس و خراپ ناپرسێ وگەنجیش تەنیا بۆ رواڵەتی کچ ئەڕوانێ و ئەگەر تـۆزکاڵێ رەنگ و رۆنی ببێ پەسەندی ئەکا و ئیتر ناپرسێ لە چۆنیەتی خولق و خۆی ئەوکچە و لە ئاکامداهەردوو گورۆ پەشیمان ئەبنەوە.

**٥٦ـ برسییەتی، رەگ هاری هاپێوە.**

○ گرسنگی، رگ هاری با خود دارد.

● **واتە:** زگ برسی لە هیچ ناپرسێ‌و وەکوو هار پڕ ئەداتە هەموو چتێ.

**٥٧ـ بروا بۆکاسە وکەوچک دابگرە.**

○ به کاسه نگاه کن و قاشق بزن.

● **واتە:** هەوەڵ بۆ چۆنیەتی خاوەن ماڵ و شێواز و دیمەنی ماڵەکەی بڕوانە و ئەوسا، رووی لێ بخە.

**٥٨ـ بروا بۆکۆزکارژەلە وکەمچی دابگرە.**

○ به آغُل بزغاله نگاه کن و لقمه بگیر.

▣ وەکوو پەندی پێشوو.

«کۆز»، گەوڕێکی بچووکە لە تەنشت گەوڕی ماڵاتە گەورەکانەوە کە بە تووڵی تـەڕ درووسی ئەکەن بۆ بەرخ و کارژەلەی ساوا، لە بەر ئەوەی نەکەونە ژێر دەس و پای ماڵاتە گەورەکان.

**٥٩ـ بروانە رەنگم و بپرسە حاڵم.**

○ به رنگ من نگاه کن و حالم را بپرس.

● **واتە:** رواڵەتم لە چۆنیەتی ئەحواڵم حیکایەت ئەکا.

**٦٠ـ بریا نان و بریا دۆ.**

○ نان و دوغ قطع شد.

● **واتە:** دەخڵمان بڕاوچتێکمان بۆنەماوەتەوە.

**٦١ـ بزانە چەنێ بەختەکەم شەرە،کۆچم ئاوێتەی کۆچ سەگ وەرە.**

○ ببین چقدر بدبخت هستم، کوچ من با کوچ پراز عوعو سگ همراه شده است.

● **واتە:** زۆر بەدبەختم و رەفێق و هاوماڵم بووەتە جەماعەتێکی بێحەیا و قەرەچناخ.

**٦٢ـ بزانە چەنێ لارمە، قارسە قولێ بارمە!**

○ ببین که چقدر بختم‌کج است، فُضلۀ حیوانات بار من است.

● **واتە:** بەختم شەڕە و بەشم چتی بێفەڕە!

**٦٣ـ بزانە زانست لەکوێ هێلانەی بەستگە ؟**

○ ببین دانایی کجا لانه کرده است ؟

● **واتە:** بڕۆ بە شوێن فێربوون و زانستا.

**٦٤ـ بزمار ناچێتە بەردا.**

○ میخ در سنگ فرو نمی‌رود.

● **واتە:** قسە لە مێشکی ئەوکەسەدا کار ناکا.

**٦٥ـ بزن بە پای خوەی ئەکێشگێتە دار و پەزیچ بە پای خوەی.**

○ بز با پای خودش به چنگک کشیده می‌شود و گوسفند نیز با پای خود.

● **واتە:** هەر کەس گیرۆدەی عەمەلی خۆی ئەبێ.

**٦٦ـ بزن بە سمەکرێ جێگەی خوەی پاک ئەکاتۆ.**

○ بز با کشیدن سُم بر روی زمین جای استراحت خود را تمیز می‌کند.

● **واتە:** تەنانەت ئاژەڵیش هاله بیری خاوێن کردنی جێگای خۆیا.جا ئینسان چۆن ئەبێ لەو بابەتەوە لە حەیوان کەمتر بێ ؟!

**٦٧ـ بزن بیخوا، ئەچێتە بەرەوپیری گورگۆ.**

○ بز آن را بخورد، به استقبال گرگ می‌رود.

● **واتە:** ئەو خواردەمەنی‌یە زۆر تورشە.

**۶۸ـ بزن تا سمه کریّ نه کا، ناخه‌ویّ.**

○ بز تا با سُم جای خود را نروبد نمی‌خوابد.

● **واته:** ته‌نانه‌ت حه‌یوان و مالّاتیش هان له بیری خاوێن کردنی جێگه و ڕێگه‌ی خۆیانا.

**۶۹ـ بزن تێرێته کەڵ!**

○ بز را تحریک می‌کند.

● **واته:** ئه‌وچته زۆر تورشه.

**۷۰ـ بزن خه‌م گیان یه‌و قه‌ساو خه‌م دووگ.**

○ بز بیمناک جان خویش است و قصّاب به دُنبه می‌اندیشد.

● **واته:** هه‌رکه ها له بیری خۆیا.

**۷۱ـ بزن دایمه دووی به‌رزه و بۆی عه‌یب نی‌یه، به‌ڵام دووی مه‌ر جارێک به‌رز ئه‌وێتۆ، هه‌رای لیّ ئه‌که‌ن.**

○ دُنبهٔ بز همواره بالا زده است وبرایش عیب نیست، امّا دنبهٔ گوسفند یک بار بالا می‌رود او را هو می‌کنند.

● **واته:** مرۆڤی بیّ‌حه‌یا و پڕ عه‌یب هه‌رچی بکاکه‌س ده‌نگی نادا؛ به‌ڵام مرۆڤی به شه‌رم و حه‌یامانیع،ئه گه‌ر هه‌ر بۆ جارێکیش هه‌ڵه‌یه ك بكا، ده‌نگی ئه‌ده‌ن.

**۷۲ـ بزن ساڵ دوانزه مانگ قنگی هاوه ده‌رۆ، مه‌ر هیچ نایه‌ژیّ، به‌ڵام مه‌ر ئه‌گه‌ر جارێک قنگی ده‌رکه‌فیّ، بزنه‌کان لیّ ئه‌که‌نه هه‌را.**

○ بز دوازده ماه سال مقعدش پیداست و گوسفند چیزی نمی‌گوید، امّا اگر گوسفند یک بار دُنبه‌اش بالا برود و مقعدش پیدا شود، بزها هوَش می‌کنند.

▣ بڕوانه بۆ مه‌سیله‌ی پێشوو.

**۷۳ـ بزن گه‌ر رانیّ گه‌ر ئه‌کا.**

○ بز گَر گلّه‌ای را گَر می‌کند.

● **واته:** مرۆڤێکی خراپ، هۆزیّ خراپ و به‌د ناو ئه‌کا.

**۷۴ـ بزن گه‌ر (یا: گه‌رۆڵ) له سه‌ر چاوکه ئاو ئه‌خواتۆ.**

○ بُز گر از سرچشمه آب می‌خورد.
معادِل: (میمون هر قدر زشت‌تر، ادا و اطوارش بیشتر)
● **واتە:** مرۆڤی ناشیرین و قەباحەت، بە دەمارە.

**٧٥ـ بزن لە نەخوەشیا نەئەچووە ڕێگا، ئەیان کردە «حەچە»ی ران.**
○ بُز مریض بود و راه نمی‌رفت، آن را چَپش ( تکه، بز پیشرو گلّه) می‌کردند.
● بە کەسێ ئەوترێ کە لە تەمەڵی و تەوەزەلی خۆی نەتوانێ بچێ بە ڕێگەدا، خەڵکی ئەو بە مرۆڤێکی قورس و بەویقار بزانن و بیکەن بە بەرپرس و سەرۆک!

**٧٦ـ بزن نەگبەتی بێ نان شوان ئەخوا.**
○ بز بدشانسی بیاورد نان چوبان را می‌خورد.
● بە یە کێکی بێ‌سفەت و سپڵە ئەوترێ کە خەیانەت بکا بە وەلی‌نیعمەتی خۆی جا ئەبێ بە جەزای خەیانەتی خۆی بگا.

**٧٧ـ بزنە قوت لە من چوو، سەربنێ بە هەزارۆ.**
○ بز قُد از دست من در رفت، بگذار که از کوه سرنگون بشود.
● **واتە:** ئەو ماڵەی کە لە دەس من دەرچوو هەر چێکی بە سەر دێ، با بێ.

**٧٨ـ بزنەکەی هەیاس خاسە!**
○ بز «هەیاس» است.
● بە یە کێ ئەوترێ کە ماوەیە ک قەڵەو بێت و ماوەیە ک لەڕ.
**ئێژن «هەیاس خاس»** بزنێکی بووە و بەڵێنی داوە، نەیەڵێ ئەو بزنە لە ئەندازەیە کی دیاریکراو، کەم یا زیاد بکا. جا بەچکە گورگێکی بۆ ڕاگیر کردبوو، وە هەر وەخت بزنە کە گەرە کی بووە چاخ ببێتۆ، بەچکە گورگە کەی پێ نیشان داوە، بزنیش لە ترسا دووبارە چووەتەوە پێسە ئەوەڵە کەی خۆی!

**٧٩ـ بزنێ نە خواردم، کاورێ چیاندم.**
○ بزی نخوردم، برّەای (یا گوسفندی) نیز از دست دادم.
● **واتە:** نە تەنیا چتێکم دەس نە کەوت چتێکیشم لە دەس دا.

**۸۰ـ بزنیش بۆ شەوێ جێگەی خوەی خوەش ئەکا.**

○ بزهم برای یک شب جای استراحت خود را درست می‌کند.

● **واتە:** مرۆڤ نابێ لە ئاژاڵ و مەڕ و ماڵات کەمتر بێ و لە بیری خاوێن کردنی جێگەی خۆیا نەبێ.

**۸۱ـ «بسم‌الله» پیشەی کەم نانی‌یە!**

○ بسم‌الله گفتن نشانهٔ کم نانی است.

● **واتە:** نانە کە کەمە و بسم‌الله ئەکەن بەڵکوو بەرەکەتی تێ کەوێ.

**۸۲ـ بشێوە لە دەمیا خێزاو ئەکا.**

○ آشوب از دهان او موج می‌زند.

● بە یەکێکی بەدزات و شەڕ هەڵگرسێنەر ئەوترێ.

**۸۳ـ بکوژێ قەساو، بوڕێ قەساو!**

○ بکشد قصّاب، بِبُرّد قصّاب!

● بە کەسێ ئەوترێ کەلەبابەتێکدا هەموو کارێ بە دەس خۆی بێ.

**۸۴ـ بگار بناسە و لێ‌بە.**

○ پایاب را شناسایی کن سپس به آب بزن.

● **واتە:** هەوەڵ چۆنیەتی کارە کە لە یەک بدەرەوە ئانجا تێی هەڵچۆ.

**۸۵ـ بناوانی شێلاگە. (یا: بنە جۆی شێلاوە)**

○ اساس کار را محکم کرده است.

● **واتە:** بنچینەی کارەکەی تەخت کردووە.

**۸۶ـ بن هەوانە کون بێ هەر پر ناوێ.**

○ ته انبانه اگر سوراخ باشد پر نمی‌شود.

● کینایە لە مرۆڤی تەماع کارەکە هەر تێر نابێ.

**۸۷ـ بنیام (بنیادەم) خوەش حەساو شەریک ماڵ مەردمە.**

○ آدم خوش معامله شریک مال مردم است.

● **واتە:** کەسێ خۆش حیساب بێ هەموو کەس لە موعامەلەدا بڕوای پێ ئەکا.

**٨٨ـ بنیاەم (بنیادەم) دوو دفعە لەکونایەکەو ناچزگێت.**

○ آدمی دو مرتبه از یک سوراخ گزیده نمی‌شود.

● **واتە:** کەسێ یەک کەڕەت لە چتێکا خەڵەتا ئیتر کەڕەتێ تر لەو چتەدا ناخەڵەتێ.

لا یُلْدَغُ المؤمن من جُحْرٍ واحدٍ مرّتین. مؤمن دوو جار لەکونێکەوە ناگەزرێ.

**٨٩ـ بنیاەم (بنیادەم) سەد ساڵ عومر ناکا، بەڵام خەفەت هەزار ساڵ ئەخوا.**

○ انسان صد سال زندگی نمی‌کند، امّا به اندازهٔ هزار سال غصّه می‌خورد.

● **واتە:** خەم و پەژارەی مرۆڤ لە ژیانیدا زۆرترە لە ماوەی ژیانی ئیعتیادی و خۆشیەکانی ئەو.

**٩٠ـ بنیاەم (بنیادەم) شیر خاوی خواردگە.**

○ آدمی شیر خام خورده است.

● **واتە:** ئینسان هەڵەی لێ سەر ئەدات.

**٩١ـ بنیاەم (بنیادەم) فەقیر، لای باوە ئەتسێ!**

○ آدم فقیر، از جهت وزش باد می‌چُسّد.

● **واتە:** مرۆڤی هەژار و دەس تەنگ، لە هەرچی چتا، هەر بەختی نییە و بە بچووکترین هەڵەیشی، پێ ئەزانن.

**٩٢ـ بنیاەم (بنیادەم) کوێر خەو ناوینێت.**

○ آدم کور خواب نمی‌بیند.

● **واتە:** خەو دیتن لە دیتنۆ دروس ئەبێ. یا: کەسێ چتێ نەبینێ چۆن ئەتوانێ لەو بارەوە چتێ بێژێ؟

**٩٣ـ بنیاەم (بنیادەم) هەرچی پیر بوێ، تەماع و ئارەزووی جوان ئەوێتۆ.**

○ آدمی هرچه پیر شود، طمع و آرزوی او جوان می‌شود.

آدمی پیر که شد طبع جوان می‌گردد  خواب در وقت سحرگاه گران می‌گردد.

**(صائب)**

● **واته:** مرۆڤی پیر دڵی زۆرتر به دنیا خۆشه.

**۹۴- بۆ برسییه‌تی‌یه‌که‌ت ئه‌گیرم، به‌ڵام نانت پێ نادەم!**

○ برای گرسنه بودن تو گریه می‌کنم، ولی به تو نان نمی‌دهم!

● **واته:** پیاوه‌تی ئه‌گه‌ر خه‌رج هه‌ڵ بگرێ، نایکه‌م؛ به‌ڵام بێ‌خه‌رج، حازرم!

**ئه‌گێرنه‌وه:** دوو نه‌فه‌ر ئه‌بن به هاورێ و رێگایه‌کی دوور ئه‌ده‌نه به‌ر و زۆر هیلاك ئه‌بن. یه‌کێکیان ده‌س ئه‌کا به‌گیرفانیاو نانێ ده‌ردێنێ و ئه‌یداته به‌ر قه‌پ، ئه‌وی تریان نانی نابێ و هه‌ر ماتڵه ره‌فێقه‌که‌ی خوڵکی بکاو برێ نانی بداتێ، به‌ڵام ئه‌و هه‌ر نایداتێ و خۆی نانه‌که ئه‌خوا. کابرای برسی، تاقه‌ت نایه‌رێ و رووی تێ ئه‌کا و ئێژێ: ئه‌رێ برا تیکه‌یه‌کیش نان بده‌ره من خۆ له برسا مردم!

ره‌فێقه‌که‌ی ئێژێ: وه‌الله کاکه، بۆ برسییه‌تی‌یه‌که‌ت ئه‌گیرم به‌ڵام نانت پێ نادەم!

**۹۵- بۆ به‌ر ئه‌چم ئاو ئه‌م وات، بۆ دوا ئه‌چم ئه‌سووتم!**

○ به طرف جلو بروم آب مرا می‌برد، به عقب بروم می‌سوزم!

● **واته:** له حاڵه‌تێکدا گیرم کردووه که رێگه‌ی به‌ر و دوام لێ به‌سراوه.

**۹۶- بۆ تۆ بوێ له‌چک به سه‌رێ، بۆ منیش هه‌ر ئه‌وێ کڵاو له سه‌رێ.**

○ برای تو لچک بر سری پیدا شود،برای من هم کلاه برسری پیدا خواهد شد.

● **واته:** به‌ڵکوو بۆ هه‌ر دووکمان یه‌کێ درگای به‌ختێ بکرێتۆ.

**۹۷- بۆچه ماسه به ده‌ور ده‌متا دیار بێ ؟**

○ مگر ماست است که بر دور دهانت پیدا باشد ؟

● به‌که‌سێ ئه‌وترێ که له‌و هه‌ڵه واکردوویه‌تی حاشا بکا.

**۹۸- بۆ حسین ناگیرێ، بۆ شله ئه‌گیرێ.**

○ برای حسین گریه نمی‌کند، بلکه برای خوردن آش می‌گرید.

● **واته:** گیریان و سینگ کوتانیان بۆ خۆشه‌ویسی ئه‌وکه‌سه نی‌یه وا مردووه، بۆ ئه‌وه‌یه که به چێشت و خێری خۆیان بگه‌ن.

**۹۹- بوخچه‌یه‌ك دایك بیوه‌سێ، ئه‌شێ که‌نیشک بیکاته‌و.**

○ بُقچه‌ای  راکه مادر ببندد، باید دخترآن را باز کند.

● **واته:** چاک و خراپەی دایک و کچ بەیەکەوە بەسراوە.

**١٠٠ـ بۆ دەسماڵێ، قەیسەرییەک ئاگر مەدە!**

○ برای به دست آوردن یک دستمال، یک راسته بازار را آتش مزن.

● **واته:** بۆ بە دەس هێنانی سوودێکی کەم، زەرەرێکی گەورە مەدە.

**١٠١ـ بۆرە نەویٚ بازە ویٚ، دەسەوساری تازە ویٚ!**

○ این رنگ یا آن رنگ فرقی ندارد، فقط افسار آن تازه باشد.

● **واته:** هەرچییەك هەیە با بیێ، بەڵام با تازە بێ!

**١٠٢ـ بۆ ریش چوو، سمێڵیشی نیا بانی.**

○ برای ریش رفت، سبیلش را نیز از دست داد.

● **واته:** چوو چتێ بە دەس بێنێ بەڵام نە تەنیا بەو چتە نەگەیشت، چتێکی تریشی لە دەس دا.

**١٠٣ـ بۆسویٚ لێ هەڵناسێ.**

○ بوی سوختگی از او بلند نمی‌شود.

● **واته:** زۆر شڕ و وڕ و فەقیرە.

**١٠٤ـ بۆ شۆن مامان خاسی (یا: خاسە)!**

○ برای رفتن به دنبال قابله خوبی (یا: خوب است)!

● بە یەکێکی تەمەڵ و لەش‌قورس ئەوترێ.

**١٠٥ـ بۆکونێک هەزار کون مەکەرە خوەت.**

○ برای یک سوراخ هزار سوراخ در خودت ایجاد مکن.

● **واته:** بۆ بە دەس هێنانی سوودێکی بچووک، خۆت تووشی هەزار گیر و گرفت مەکە.

**١٠٦ـ بۆکەسێ بمرە، بۆت یاو بکات.**

○ برای کسی بمیر که برایت تب کند.

● **واته:** خۆت فیدای کەسێ بکە کە ئەویش بۆ تۆ دڵی لێ بدا.

**۱۰۷ـ بۆ گورچیلەیەک گایەک ئەدا بە عەرزا!**

○ برای به دست آوردن یک کلیه، گاوی را می‌کشد.

● **واته:** بۆ سوودێکی بچووک، زەرەرێکی گەورە ئەدا.

**۱۰۸ـ بۆ گێسکێ، گایەک مردارۆ مەکە.**

○ برای یک بزغاله، گاوی را مکش.

◙ وەکوومەسیلەی ژمارە(۱۰۰) : بۆ دەسماڵێ، قەیسەرییەک ئاگر مەدە.

**۱۰۹ـ بۆ نۆک و نوخۆشەرەکەی ئەگەرێ!**

○ دنبال نخود و لپّه‌اش می‌گردد.

● **واته:** زۆر لە سەر ئەو قسە ئەڕوا.

**۱۱۰ـ بۆ نەوس کەوتە حەوز.**

○ به خاطر طمع توی حوض افتاد.

● **واته:** تەماع سەری تیا برد.

**۱۱۱ـ بوو بە هات هاتەکەی رۆم!**

○ مانند آمد، آمد لشکر روم شد.

● **واته:** هەر ئێژن هات و هەر خەبەرێ نەبوو.

**۱۱۲ـ بوومان، بوومان حەساو نی‌یە؛ هەسمان، هەسمان حەساوە.**

○ داشتیم، داشتیم به درد نمی‌خورد؛ داریم، داریم اعتبار دارد.

● **واته:** قسە لەوەی مە کە کە پێشتر چۆن بوویت و چیت بووە؟بەڵکوو قسە لەوەی بکە کە ئێستا چیت و چۆن مرۆڤێکی ؟

**۱۱۳ـ بووگە بە ماکەرەکەی قلّیان.**

○ مثل مادّه الاغ روستای «قلیان» شده است.

● **واتە:** زۆر بەد فعلە و هەموو کەسی پێ فێرە.

**۱۱۴ـ بووگەسە ئارد بێخ درک.**

○ چون آرد زیر بوته خار شده است.

● بە چتێ ئەوترێ کە هەر کۆ نەبێتۆ.

**۱۱۵ـ بووگەسە کەر بێگاری.**

○ مثل الاغ بیگاری شده است.

● **واتە:** هەر کەس هەڵئەسێ دەستوورێکی پێ ئەدا.

**۱۱۶ـ بووگەسە گاکەی ماڵ مامە حاجیەو.**

○ شده گاو خانهٔ عمو حاجی.

● **واتە:** بۆ هەموو کەس کار ئەکا، بۆ خاوەن ماڵ نەبێ.

**۱۱۷ـ بووگەسە مووی لووت.**

○ موی دماغ شده است.

● **واتە:** هەر حازرە و دوور نابێتۆ.

**۱۱۸ـ بوومە شوانەکەی حەق نادیاری.**

○ مثل آن چوپانی شدم که دست مزدش ناپیدا بود.

● بە یەکێک ئەوترێ کە رەنجێکی کێشابێ و نەتیجەیەکی نەگرتبێ.

**۱۱۹ـ بوون و نەبوون تا سەر نی‌یە.**

○ داشتن و نداشتن مال دنیا پایدار نیست.

● **واتە:** بە بوون و نەبوونی ماڵی دنیا هیچ کەس نابێ دڵ خۆش بکا، یان خەمبار بێ چونکە هیچ کامیان دەوامیان نی‌یە.

**۱۲۱ـ بویَ بە ئاگر ژێر خوەی ناسووتێنێ.**

○ آتش هم بشود، زیر خود را نمی‌سوزاند.

● **واتە:** ئەگەرچی زۆریش دڕندە بێ، بۆ دەور و بەری خۆی مەترسی‌یەکی نی‌یە.

**۱۲۲ـ بوینە رەنگم، مەپرسە حاڵم.**

○ رنگ و رویم را ببین و از حالم مپرس.

● **واتە:** رەنگ و رواڵەتم ئەڵێ حاڵم چۆنە و پێویستی بە پرسین نی‌یە.

**۱۲۳ـ بۆی شیر لە دەمی تێت.**

○ بوی شیر، از دهنش می‌آید.

● **واتە:** هێشتا مناڵە.

ئەم مەسیلە مانای تەوسیش ئەدات، ئەگەر بە مرۆڤی پڕ تەمەن بوترێ.

**۱۲۴ـ بۆیە پێت ئێژم کاکە، چۆلەکەم بۆ بگری.**

○ به این جهت تو را برادر بزرگ خودم خطاب می‌کنم، که گنجشک برایم‌بگیری.

● **واتە:** بۆیە خوڵتەت پێ ئەکەم، کەلێکم بگری.

**۱۲۵ـ بە ئاو هات و بە نان خوریا!**

○ چون آب آمد و چون نان خورده شد.

● بەچتێ ئەوترێ کە دوور لە باوەڕ، گوم ببێ‌ولە بەین بچێ.

**۱۲۶ـ بە ئەنازەی بەر خوەت پا داکێشە.**

○ به اندازه گلیم خودت پا دراز کن.

● **واتە:** زۆرتر لەوەی کە مافی خۆتە داوا مەکە.

**۱۲۷ـ بە ئیسکانێ ئاو ئەکەفێتە مەلە! (یا: بە کاسەیەک ئاو ئەکەوێتە مەلە)**

○ با یک استکان آب به شنا می‌افتد.

● **واتە:** ئەو کەسە بە بچووکترین گۆڕان، بایی هەوا ئەبێ.

**۱۲۸ـ بە بگار نەگەیشتگ شواڵ ئەکەنێ!**

○ هنوز به پایاب نرسیده، شلوارش را در می‌آورد!

● **واته:** هێشتا هیچ نەبووە، خۆی لێ ساز کردووە!

**۱۲۹ـ بە بۆنەی گوڵێ گەنمۆ هەزار گوڵ مرۆر ئاو ئەخواتۆ.**

○ به خاطر یک گل گندم، هزار گل تلخک آب می‌خورد.

● **واته:** لە سایەی سەری یەکێکۆ، چەندین کەسی تر بە بەهرە ئەگەن.

**۱۳۰ـ بە بۆی کەواو هات، نەیزانی کەر داخ ئەکەن!**

○ به بوی کباب آمد، نفهمید که دارند الاغ داغ می‌کنند!

● بە یەکێکی تەماعکار و چرووك ئەوترێ کە ئەمجار بە هەڵەدا چووبێ و لووتی سووتا بێ.

**۱۳۱ـ بە بەرماڵ هەرکەسێکا ئەم‌وەن، بە بەرماڵ میمکما مەم‌وەن.**

○ از جلو خانهٔ هر کس عبورم می‌دهید، اشکالی ندارد امّا از جلو خانهٔ عمّه‌ام (یا خاله‌ام) مرا عبور ندهید.

● **واته:** قەوم و کەسی خراپ چاوی دیتنی سەرکەوتنی خزم وکەسی خۆیان نی‌یە. ئەم مەسیلە وتەی کچێکە کە ئەیبەن بۆ ماڵی بەخت، ئەویش لە تانە وتەشەری میمکی (پووری) ئەترسێ و تێژێ لە هەر رێگایەکۆ ئەمبەن بمبەن، بەڵام با لە بەرماڵی میمکمۆ نەبێ چونکە ئەو ئەگەر بمبینێ نەتەنیاحەزناکاو دیانی خێرم پێدانانێ بەڵکوو تانە و تەشەریشم لێ ئەدا.

**۱۳۲ـ بە پشیلەیان وت گووت بۆ دەرمان خاسە، ئەچوو ئەیکردە ژێر خوەڵۆا**

○ به گربه گفتند مدفوعت خاصّیت دارویی دارد، می‌رفت آن را زیر خاک پنهان می‌کرد!

● بە کەسێکی بێ‌نرخ ئەوترێ کە وەختێ بزانێ کارێك لە دەستی دێ خۆی بشارێتۆ.

**۱۳۳ـ بە پفێ داڵەگرسێت و بە تفێ ئەکوژێتەو.**

○ با یک پف روشن می‌شود و با یک تف خاموش می‌شود.

● **واته:** ئەو کەسە بە قسەیەکی بچووك زۆر زوو تووڕە ئەبێ و بە

هەڕەشەیەکی بچووکیش خاو ئەبێتۆ.

**۱۳۴ـ بە پڵتۆک خوەی ئەتەکنێ!**

○ با تلنگر خود را می‌تکاند!

● **واتە:** فیز و دەماری بەرزە.

**۱۳۵ـ بە پووڵ قەمچان ئەکا.**

○ با پول بازی می‌کند.

● **واتە:** ئەوەندە دەوڵەمەنە، پووڵ لە لای ئەو، وەکوو ئەمرازی کایە وایە.

قەمچان: بازەڵێن (جۆرەکایەیەکی منالّانە)

**۱۳۶ـ بە پەلە ژن مەیەرا، تا بە شێنەیی پەشیمان نەویتۆ.**

○ با عجله ازدواج مکن، تا به آرامی پشیمان نشوی.

● **واتە:** پەلەکردنی ئەمرۆ، پەشیمانی سۆزی ها بە شوێنیۆ.

**۱۳۷ـ بە پیری فێر پڵاو خواردن بووگە.**

○ در پیری پلو خوردن را یاد گرفته است.

● **واتە:** دوای تەمەنێکی درێژ تازە فێری ڕەسم و یاسای مەدەنی بووە.

**۱۳۸ـ بە پێکەنین زاڵم باوەر مەکە.**

○ به خندیدن ظالم اعتماد مکن.

● **واتە:** رووی خۆشی زاڵم جێگەی باوەڕ نی‌یە.

**۱۳۹ـ بەتاڵ، دەس پرناچێتەو بۆ ماڵ.**

○ شخص بیکار، دست پر به خانه برنمی‌گردد.

● **واتە:** مرۆڤی بەتاڵ پا، ناهمێ‌یە.

**۱۴۰ـ بە تر حمام گەرم ناوێ.**

○ با حرارت تیز حمام گرم نمی‌شود.

● **واتە:** کاری گرینگ هەوڵدانی ئەوێ و بە ئاسانی دروس نابێ.

**١٤١ـ بە تر گۆزەڵە ئەشکنێ.**

○ با تیز کوزه می‌شکند.

● **واتە:** زۆر بەدەمارە.

**١٤٢ـ بە ترێ حەفت مەن خوری شی ئەکاتۆ!**

○ با یک تیز هفت من پشم به هم می‌زند!

● **واتە:** بە کەسێ ئەوترێ کە زۆر فیز و دەماری بێ و پێی نە کەوێ.

**١٤٣ـ بە تەقەی تفەنگ دەر ناکەفێ.**

○ با صدای تیراندازی نیز ظاهر نمی‌شود.

● **واتە:** هەر دیاری نی‌یە.

**١٤٤ـ بە تەماشاکردن بوایە، سەگ زوو فێر قەساوی ئەوو.**

○ اگر به نگاه کردن می‌بود، سگ زود قصّابی را یاد می‌گرفت.

● **واتە:** فێر بوونی هەر کارێ تەنیا بە تەماشاکردن و روانین بۆ ئەو کارە ئەنجام نابێ، بەڵکو دڵ پێدان و کار لە سەر کردنی پێویستە.

**١٤٥ـ بە تەناف تۆکەفتکەسە چاڵ.**

○ با طناب تو در چاه افتاده است.

● **واتە:** لە سەر تەحریکی تۆ دوچاری ئەوکۆسپە بووە.

**١٤٦ـ بە تیرێ دو نیشان ئەپێکێ.**

○ با یک تیر دو هدف را می‌زند.

● **واتە:** بە ئەنجامدانی ئیشێ، بە دوو بەرهەم ئە گا.

**١٤٧ـ بە جاریا نەچووگە.**

○ به آن موضوع راه نبرده است.

● **واتە:** لەو مەسەلەیە چتێکی حاڵی نەبووە، بە هەردیا نەچووە.

**١٤٨ـ بە جێگەی ئەوە ئاو بکاتە مل ئاگرا، ئەیگەشێنێتەوا!**

○ به جای آنکه آب روی آتش بریزد، آن را باد می‌زند.

● **واته:** نه تەنیا ئاگری شەڕەکە ناکوژێنێتۆ، بەڵکو زۆرتر گەشە بە وشەڕ و ناکۆکیە ئەدا.

**۱۴۹ـ بە چاو خەفتگ بە دڵ وریا، تا تۆ هەڵسای کەرەکوڵ بریا.**
**(یا: تا لای‌گردۆ، کەرەکوڵ بریا).**

○ به چشم خوابیده و به دل بیدار؛ تا تو بلند شدی خر دُم بریده را بردند.

● **واته:** ئەگەر هۆشیار وبزێو نەبی تاڵانت ئەکەن.

**۱۵۰ـ بە چ عەیارێ بی‌پێوی، بەو عەیارە بۆت ئەپێون.**

○ با هر پیمانه‌ای به مردم بدهی با همان پیمانه به تو خواهند داد.
معادل: با هر دستی بدهی با همان دست می‌گیری.

● **واته:** چون لەگەڵ خەڵکا موعامەلە بکەی، هەروا لەگەڵتا موعامەلە ئەکەن.

**۱۵۱ـ بەچکە سۆنەس!**

○ جوجهٔ مرغابی است.

● بە منالێکی ژیر و ڕەسەن ئەوترێ کە کێشابێتیە سەر باوک و باوەڕەی خۆی. وەکوو بەچکە سۆنە، کە هەر دوای پەیا بوونی ئەتوانێ مەلە بکا.

**۱۵۲ـ بەچکە گەدا، مەخەرە تەما، بە چڵێ کەما، تێتە سەما!**

○ بچهٔ گدا را به طمع مینداز، او با یک شاخهٔ کُما به رقص می‌آید.

● **واته:** مرۆڤی هەتیوەچە، ئەگەر ڕووی پێ بدرێ و تەماعی پێ نیشان بدەی دەس ئەکا بە کلکە سووتێ بە دەورتا.

**۱۵۳ـ بەچکە گەدای فەرەتەما، بە چڵێ کەما، تێتە سەما!**

○ بچهٔ گدای بسیار طمعکار، با یک شاخه کما، به رقص می‌آید.

● **واته:** هەتیوەچەی تەماعکار، لە بەرابەری بچووکترین سووددا، ئەکەوێتە کلکە سووتێ!

**۱۵۴ـ بە حەفت ئاو تەر ناوێ!**

○ با هفت آب خیس نمی‌شود.

● **واتە:** زۆر بێ‌حەیایە و هیچ عەیبێکی پێ عەیب نی‌یە.

**١٥٥ـ بە حەفت ئاو شۆریاگەسەو.**

○ با هفت آب شسته شده است.

● **واتە:** زۆر بێ‌شەرم و بێ‌حەیایە.

**١٥٦ـ بە حەفت براوە کڵاوێکیان هەس!**

○ هفت برادر یک کلاه دارند.

● **واتە:** دەس تەنگن.

**١٥٧ـ بە حەفت تەور ملی ناورگێتەو.**

○ با هفت تبر گردنش بریده نمی‌شود.

● **واتە:** ئەو کەسە زۆر مل ئەستوور و قەڵەوە.

**١٥٨ـ بە حەفت قەڵەم خوەی ئارایش کردگە.**

○ هفت قلم خودش را آرایش کرده است.

● **واتە:** ئەو ژنە رەنگ و رۆنێکی زۆری داوە لە خۆی. حەوت قەڵەم رەنگ و رۆنی ئارایش کە لە قەدیما ژنان ئەیان کرد بریتی بووە لە ئەمانە: ١ ـ خەنە ٢ ـ وسمە ٣ـ سووراو ۴ـ سپیاو ۵ ـ سورمە ٦ ـ زێرەک (زێڕوەرەق) ٧ ـ خاڵی روومەت، کە ئەم خاڵەیان بە سورمە، لە گۆشەی لێو یالە جێگەیەکی تری روومەتا دائەنا.

**١٥٩ـ بە خاسە خاسە گوی کردە کاسە.**

○ آنقدر از او تعریف کردند که کار را خراب کرد.

● **واتە:** ئەونە پێیان وت تۆ خاسی، کارەکەی خراپ کرد.

**١٦٠ـ بە خاسە خاسە هەڵمەماسە.**

○ به تعریف و تمجید دیگران، مغرور مشو.

● **واتە:** بەوەی کە مەردم بە باڵاتا ئەخوێنن لە خۆت دەرمەچۆ.

**١٦١ـ بە خاڵۆ خاڵۆ، خوەی خستە ماڵۆ.**

○ بە خالو خالو گفتن، داخل منزل شد.

● **واتە:** بە زوانِ بازی، خۆی بە سەریانا سەپاند.

**١٦٢ـ بە خاڵۆ خاڵۆ هاتە لامەوە، بوو بە ئەژدیها دای بە پامەوە!**

○ با دائی دائی گفتن بە من نزدیک شد، آن گاە اژدهایی شد و مرا گزید.

● **واتە:** بە زوانی خۆش خۆی پێم نزیکەوە کرد و لە ئاکامدا لە بەینی بردم.

**١٦٣ـ بەخت هەڵ بگەڕێتۆ، دەڵەمەیش دیان ئەشکێنێ!**

○ بخت برگردد، دَلمک نیز دندان آدمی را می‌شکند.

● **واتە:** ئەگەر کەسێ نەگبەتی بێ، لە هەرچی چتی بێ‌قابلیشە زەرەر ئەبینێ.

**١٦٤ـ بەیخ مەکە یەخ ئەکەی!**

○ یخ مکن یخ می‌کنی!

● **واتە:** خۆت لووس مەکە پێت ناکەوێ.

**١٦٥ـ بە خوەشیِ زمسان و بە پێ‌کەنینِ زاڵم باوەر مەکە. (یا: دڵ خوەش مەکە)**

○ بە هوای خوش زمستان و بە خندۀ ظالم باور مکن. (یا: دل خوش مکن)

● **واتە:** نە هەوای خۆشی زمسان جێگەی متمانەیە و نە رووِ خۆشی زاڵم.

**١٦٦ـ بە خوەم بێژن ئاغە و بە ژنەکەیشم بێژن ئاغە ژن.**

○ بە خودم بگویند آقا و بە زنم بگویند زن آقا.

● بە کەسێ ئەوترێ کە دایمە بە ئاواتی ناو و مەقام بێ.

**١٦٧ـ بە خەیاڵ پڵاو، خوان رەنگین ناوێ.**

○ بە خیال پلو، سفره رنگین نمی‌شود.

● **واتە:** لە ئارەزوودا ژیان بە سەر بردن، بە نان و ئاو نابێ.

**١٦٨ـ بەدبەخت ئەو کاروانە وا پێشاهەنگی کەرە!**

○ بدبخت آن کاروانی کە پیشاهنگش الاغ باشد.

● **واتە:** قوڕ بە سەر ئەو جەماعەتەی وا ڕێبەریان مرۆڤیکی نەزان و نەفامە.

**۱۶۹ـ بە دزی ئیزرائیلۆ ئەچێ بە ڕێگا.**

○ دور از چشم عزرائیل راه می‌رود.

● **واتە:** زۆر نەخۆشە و مەترسی مەرگی لێ ئەکرێ.

**۱۷۰ـ بە دۆسی دۆسی، کای کردە پۆسی.**

○ در قالب دوستی و رفاقت پوست او راکند و در آن کاه ریخت.

● **واتە:** لە عاڵەمی دۆسیاکەوڵی کەند.

**۱۷۱ـ بە دۆشاو خوەت قانع بەو بۆ هەنگوێن مەردوم مەروانە.**

○ به دوشاب خودت قانع باش و به عسل مردم نگاه مکن.

● **واتە:** بە کەمی خۆت قەناعەت بکە و ڕوو لە مەردم مەخە.

**۱۷۲ـ بە دۆعای کتک باران ناوارێ.**

○ با دعای گربه باران نمی‌بارد.

● **واتە:** دۆعای مرۆڤی چەپەڵ نەتیجەیەکی نی‌یە.

**۱۷۳ـ بە دوو براکڵاوێکیان هەس!**

○ دو برادر یک کلاه دارند.

● **واتە:** دەس تەنگن.

**۱۷۴ـ بە دەس ئەیاتە دواوە، بە پا ئەی‌کێشێتە بەرەو!**

○ با دست عقب می‌زند، با پا جلو می‌کشد.

● **واتە:** لە ڕوو گەرەکی‌نی‌یە، بەڵام بە دڵ داوای ئەکا.

**۱۷۵ـ بە دەس بیبە و بە پا بکەفە شوێنی.**

○ با دست بده و با پا دنبالش برو.

● **واتە:** قەرز مەدە بە یەکێک کە پێت نەداتۆ و مەجبوور بی بە شوێنیا دەرچی.

**۱۷۶ـ بە دەس خوەی ئاگری بەرداگەسەگیان خوەی.**

○ با دست خودش آتش به جان خودش انداخته است.

● **واتە:** خۆی بووەتە سەبەبی عەزاب و دەردیسەر بۆ خۆی.

**۱۷۷ـ بە دەس خوەی قەور بۆ خوەی ئەکەنێ! (یا: بە دەس خوەت قەور خوەتت کەند. یا: بە دەس خوەت قەور بۆ خوەت مەکەنە).**

○ با دست خودش برای خود گور می‌کَنَد!

● **واتە:** خۆی ئەبێتە هۆی دەردی سەر و تووش بوونی خۆی.

**۱۷۸ـ بە دەس مەردم مار ئەگرێ!**

○ با دست مردم مار می‌گیرد.

● **واتە:** لە خەڵکی مایە دائەنێ.

**۱۷۹ـ بە دەسێ چەپڵە ناتەقێ.**

○ با یک دست نمی‌شود کف زد.

● **واتە:** کەسێ بە تەنیایی ناتوانێ ئەم کارە ئەنجام بدا.

**۱۸۰ـ بە دەسێ دوو هەنی (یا: دوو شووتی یا: دووکاڵەک) هەڵناگیرگێ.**

○ با یک دست دو هندوانە را نمی‌شود بلند کرد.

● **واتە:** لە یەک کاتدا دوو کار پێکەوە جێبەجێ نابێ.

**۱۸۱ـ بە دەم و بە دەس تێ وەشیاگە.**

○ با دهان و با دست شروع کرده است.

● **واتە:** زۆر بە گەرمی دەستی داوتە ئەو کارە.

**۱۸۲ـ بە دەم هار و بە لەش بیمار.**

○ پر حرف و کم عمل.

● بە یەکێکی زۆر قسەکەر و بێ هونەرئەوترێ.

**۱۸۳ـ بەر بۆ خوەت پاکۆ مەکە.**

○ برای خودت زمینه سازی مکن.

● به یه کێ ئەوترێ که له باسێکدا، وا قسه بکاکه خۆی سوودی لێ وەرگرێ، و پێی بێژن: بۆ خۆت رێگه تەخت مه که.

**۱۸۴ـ بەر تۆ لە دوای فرە کەس متمانەترە!**

○ «جلو» تو از «عقب» خیلی‌ها قابل اطمینان‌تر است.

● به یه کێك ئەوترێ که له داوێن پاکیو به ناموسیازۆرجێگەی باوەڕبێو بۆ ئەوه بشێ ماڵ و ناموسی پێ بسپێردرێ.

**۱۸۵ـ بەرتیڵ بەرد نەرم ئەکا.**

○ رشوه سنگ را نرم می‌کند.

● **واته:** ئه گەر بەرتیل بدرێ ناحەق به حەق ئه کەن و حەق به ناحەق. ئەم مەسیله مانای تانه و تەوسی تێدایه، ئەینه بەرتیل دان کارێکی ناپەسەندە.

**۱۸۶ـ بەرخ نێر بۆ سەربرینە.**

○ برّه نر برای سربریدن است.

● **واته:** کوڕی ئازا بۆ نەجاتی گەل، نابێ له شەڕ و مەرگ بترسێ.

**۱۸۷ـ بەر خوەی ژێر کەس ناخات!**

○ گلیم خود را زیر کسی نمی‌اندازد.

● **واته:** بۆ کەس خێری نی‌یه و کڵاوی کەس سەری ناچێ.

**۱۸۸ـ بەرخ هەتا سەر، لە بن سەوەتەدا نامێنێ و تێتە دەرەو.**

○ برّه برای همیشه در ته سبد باقی نمی‌ماند و بیرون می‌آید.

● **واته:** مناڵ بۆ هەمیشه مناڵ نامێنێ وگەورە ئەبێ و دێتە ناو مەردم.

**۱۸۹ـ بەرد بووچکیش سەر ئەشکێنێ.**

○ سنگ کوچک نیز سر می‌شکند.

● **واته:** له دوژمنی کەم هێزیش ئەبێ هەر بیمت بێ و نابێ لێی غافڵ بی.

**۱۹۰ـ بەرد تا ها لە جێگای خوەیا، سەنگینە.**

○ سنگ تا زمانیکه سر جای خودش قرار دارد، سنگین است.

● **واتە:** هەر کەس زۆر ئەم لاو ئەو لا بکا، سووك ئەبێ.

**۱۹۱ـ بەردێ نەزان بیخاتە گۆمۆ بە سەد زانا دەر نایەت.**

○ سنگی راکه نادان در تالاب بیندازد به صد دانا بیرون نمی‌آید.

● **واتە:** کارێکی ناڕێك که مرۆڤی نەزان بیکات، بۆ سەد زانا رێکی نایەت.

**۱۹۲ـ بەرز مەفرە، نزم ئەنیشی.**

○ بلند پروازی مکن، سرنگون می‌شوی.

● **واتە:** زۆر خۆت هەڵمە کێشە و دەعیە مە کە، چونکە تێ ئەشکی.

**۱۹۳ـ بەر لە ئەوە بچیتە ناو بیر، بیر لە هاتنە بانت بکە!**

○ پیش از آن که وارد چاه‌بشوی، فکر بالا آمدنت رابکن.

● **واتە:** بەر لە ئەوەی دەس‌بدەی بە ئیشێکەوە دووربینی ئاخری بکە.

**۱۹۴ـ بەر لە کارێز ئاوی گەرە کە!**

○ قبل از کندن کهریز آب می‌خواهد.

● **واتە:** هێشتا هیچ نەبووە ئەو داوا کارە.

**۱۹۵ـ بەر ماڵە کەیان تۆپ و تۆپخانە، دێزەی پیازاو تورش، پر هەڵە گولانە!**

○ جلو خانه‌شان توپ و توپخانه، دیگ آب وپیاز ترش پر از خر خاکی.

● به یه کێکی فیز قۆز ئەوترێ که لە رواڵەت دا خۆی زۆر هەڵ کێشێ، بەڵام لە ناو ماڵا پیس و پیس خۆر و گەن بێ!

**۱۹۶ـ بەرماڵی بەبان ئاوا ئەگەرێ!**

○ جا نمازش روی آب می‌گردد.

● ئەم مەسیلە، تەوسە بەو کەسەی کە بە لای دینداریا نەچوویێت. دوور لە تەوسیش مانای ئەوەیە کە ئەو کەسە زۆر دینداره.

**١٩٧ـ بە رۆژە رۆژە ساڵمان بردە سەر، ئەوا بەهار هات قنگمان کەوتە دەرا**

○ روزها را بە تدریج سپری کردیم، بهار فرا رسید و آبرویمان ریخت.

● **واتە:** کات بە سەر چوو و ئێمە هیچ کارێکمان نەکرد و ئابڕووماں چوو.

**١٩٨ـ بەروو لە دەمیا تەقیگە!**

○ میوۀ بلوط در دهانش ترکیدە است!

● بە یەکێکی زۆر تووڕە و بڵەبڵ کەر ئەوترێ.

**١٩٩ـ بەرەلای تەنکی‌یەو ئەدرگێ. (یا: بەرەی فەقیر لە لای تەنکی‌یەو ئەدرگێ)**

○ گلیم از طرف کم عرض آن پارە می‌شود.

● **واتە:** بنیادەم لەو خاڵەوە وا لاوازە، دوژمن رەخنەی تێ ئەکا.

**٢٠٠ـ بەرەوخوار و بەرەوژوور، کەرەکوڵ و خورجە سوورا**

○ رو بە پایین و رو بە بالا، الاغ دم بریدە و خورجین قرمز!

● بە ماڵێکی هەژار و دەس تەنگ ئەوترێ.

**٢٠١ـ بەری با بێت و پشتی کەنەڵان.**

○ از روبروی او باد بوزد و پشت سرش گودال باشد.

● **واتە:** باگوم بێ و هەر نەمێنێ.

**٢٠٢ـ بە ریش نی‌یە بە ئیشە.**

○ بە ریش نیست بە عمل است.

● **واتە:** رواڵەت نابێ بە مەزەنەی هەڵسەنگاندنی مرۆڤ بەڵکو عەمەل پێوانەی ناسینە.

**٢٠٣ـ بە رێوی‌یان وت کێ شایەتتە؟ وتی: کلکم!**

○ بە روباە گفتند: شاهدت کیست؟ گفت: دُمم!

● **واتە:** مرۆڤی فێڵەباز بۆ سەلماندنی وتەی خۆی هەر مەگەر خۆی شایەتی بدا.

**٢٠٤ـ بە زکێ تێر و بە دوو زک برسی.**

○ یک شکم سیر و دو شکم گرسنە.

● به یه کێکی دەس تەنگ و برسی ئەوترێ.

**۲۰۵ـ به زۆر بمنێرن بۆ مازگ، ناروانمه دارا.**

○ با زور مرا بفرستید که مازوج بیاورم، به درخت نگاه نمی‌کنم.

● **واته:** کاری زۆر ئاکامێکی دڵخوازی نی‌یه.

**۲۰۶ـ به زوان پیاگ ئه‌گرێ.**

○ بازبان آدم را به خود جلب می‌کند.

● **واته:** زوان بازه.

**۲۰۷ـ به زوان خوەش، مار له‌کونا تێته دەرۆ.**

○ با زبان خوش، مار از سوراخ بیرون می‌آید.

● **واته:** زوانی خۆش، دوژمنیش ئه‌کا به دۆس.

**۲۰۸ـ به زوان، شێر ئه‌کاته رێوی.**

○ با زبان، شیر را روباه می‌کند.

● **واته:** زۆر زوان بازه و هه‌رکارێ مه‌یلی بێ به زوان ئه‌یکا.

**۲۰۹ـ به زیله‌گوپ خوەم سوور ئه‌که‌مۆ.**

○ با سیلی گونهٔ خودم را سرخ می‌کنم.

● **واته:** به زۆر خۆم له رواڵه‌تدا شادمان و سه‌رحاڵ نیشان ئه‌دەم ئه‌ینه دڵم پڕ له خه‌م و په‌ژاره‌یه.

**۲۱۰ـ به زینگی نه‌م دی جفتێ که‌وش له پای، به مردگی نیایان هه‌زار جفت له جای!**

○ تا زنده بود، ندیدم که یک جفت کفش به پا داشته باشد؛ وقتی که مُرد هزار جفت کفش در خانهٔ او بود.

● **واته:** تا زیندوو بوو، که‌س لێی نه‌ئه‌پرسی و خێرێکیان پێ نه‌ئه‌کرد، به‌ڵام وه‌ختێ که مرد بۆی ئه‌گریان و خێر و بێریان بۆ ئه‌کرد.

**٢١١ـ بە ژێر باڵ هێلکە ئەورژنێ!**

○ با زیر بغل تخم مرغ را می‌پزد.

● **واتە:** زۆر حەرارەتی هەیە و گەنج و سەرحاڵە.

**٢١٢ـ بەسمە، کورە کەچەڵ کەسمە!**

○ برایم همین کافی است که آن کچل فامیل من است!

● **واتە:** ئەونە لێم قەوماوە، ئەبێ بەلات و لووتەوە فەخر بکەم!

**٢١٣ـ بە سەد حەکیم ئەونەی دەردە دارێ نازانێ.**

○ صد طبیب به اندازه یک مریض از چگونگی درد خبر ندارد.

● **واتە:** بە سەر هاتوو، حەکیمە.

ئەوەی کە تووشی بەڵایەك بووە و لە ناو بەڵاکەدایە، باشتر لە چۆنیەتی ئەو بە سەر هاتە ئەزانێ لەوانەی وا لە دوورەوە دانیشتوون و سەبارەت بەو بەڵایە قسە ئەکەن.

**٢١٤ـ بە سەد دەرزی گاوە سنگێکی تیا ناوێ.**

○ صد سوزن یک گاو آهن نمی‌شود.

● **واتە:** مرۆڤێکی ئازا و لێهاتوو سەد کەسی خوێری و لێنەهاتوو، دێنێ.

**٢١٥ـ بە سەر ئاو حماما تەعارف ئەکا.**

○ بر آب حمّام تعارف می‌کند.

● بە خوڵك کردنێکی بێمایە و بێخەرج ئەوترێ.

**٢١٦ـ بە سەر حەفت پشکەڵا باز ئەوا!**

○ از روی هفت پشکل می‌پَرَد.

● **واتە:** زۆر قوت و فرتە فرت کەرە.

**٢١٧ـ بە سەرەو ناچێتە درگادا، بە قنگەو ئەیوەن.**

○ با سر داخل نمی‌شود، از جهت عکس او را هول می‌دهند.

● **واتە:** کەسێ ئەگەر بە رەزامەندی کارێ نەکا، بە زۆر پێی ئەکەن.

وڵاخ کە بە سەرا نەچێ بە گەوڕا، پشتاو پشت ئەیبەنە گەوڕ.

**۲۱۸ـ بە سەرەی کەر بەهار نایەت.**

○ با عَرعَر خر بهار فرا نمی‌رسد.

● **واتە:** بە قسەی مرۆڤی بێ نرخ، ئەو ئاواتە نایەتە دیل.

**۲۱۹ـ بە سێ کەس کڵاوێکیان هەس.**

○ سە نفر یک کلاە دارند.

● بە کەسانێکی دەس تەنگ ئەوترێ.

**۲۲۰ـ بەش کریا، مەغمون یا مەلعون.**

○ تقسیم شد، مغبون یا ملعون.

● **واتە:** ئەگەر لەوبەش کردنەداکڵاو سەرت چووبێ پێت ئەوترێ «مەغمون» وە ئەگەر زۆر بە لای تۆدا هاتبێ و نەت‌دابێتۆ بە خاوەنی، پێت ئەوترێ «مەلعون».

**۲۲۱ـ بە شۆن هەر کەنینێکۆ،گیریانێکیش هەس.**

○ پس از هر خنده‌ای، گریه‌ای است.

● **واتە:** خۆشی، ناخۆشی ها بە شوێنیۆ.

**۲۲۲ـ بە شەو جەردە بە رۆژ مەردە!**

○ شب دزد و روز جوانمرد!

● بە یەکێکی دوو روو ئەوترێ.

**۲۲۳ـ بەفر هەتا نەختێکیشی بمێنێ هەر ساردە.**

○ برف اگر ذّره‌ای از آن نیز باقی بماند باز هم سرد است.

● **واتە:** ئەو چتە، کەمیشی هەر وەکوو زۆرە کەیەتی. کینایەش لە زوڵمە کە زۆر یان کەمی، هەر ناوی زوڵمە.

**۲۲۴ـ بەفریش جوانە، سەگ لە سەری ئەری.**

○ برف نیز زیبا است، سگ روی آن می‌ریَدْ.

● **واتە:** چتی پاکیش تووشی ناپاکی ئەبێ.

**٢٢٥ـ بە فرێ موسوڵمان و بە ترێ کافر!**

○ به مشاهدهٔ پریدن مرغی مسلمان و به شنیدن یک تیز کافر!

● بە کەسانێ ئەوترێ کە نە ئیمانیان جێگەی باوەڕ بێ و نە بێ ئیمانی یان جێگەی مەترسی.

**ئەم مەسیلە لەم حیکایەتە وەرگیراوە:** شێخێ لە رێگەیەکۆ ئەڕوا، ئەبینێ چەن لاو دانیشتوون و خەریکن نان و گۆشتی سووررۆکراوی مریشک ئەخۆن. لاوان بێ ئەوەی ئەو شێخە بناسن، خوڵکی ئەکەن بۆ نان خواردن، لەکاتێکدا شێخ دەس درێژ ئەکاتۆ نانی پێ بدەن، یەکێ لەو گەنجانە بۆ گاڵتە کەوچکێ رۆنی داخ ئەکاتە ناو مشتی شێخ، شێخ لەم کارە زۆر قەڵس ئەبێ و روو ئەکاتە گۆشتی مریشکەکەی ناو تاوەکە و ئێژێ: «فڕ!»؛ لە ناکاو مریشکەکە هەڵ ئەفڕێ و لە ناو تاوەکەوە دەرئەچێ! لاوەکان کە ئەم کەرامەتە زۆر سەرسوورڕێنەرە ئەبینن، تێ ئەگەن کە ئەمە پیاوێکی گەورەیە و ئەوان هەڵەیەکی خراپیان دەرحەقی کردووە، لە ئەنجاما هەموو خۆیان ئەخەن بە سەر دەس و پای شێخاو لێی ئەپاڕنەوە کە بیانبەخشێ. شێخ ئەیان بەخشێ و ئەوانیش وەکوو موریدی موخلیس ئەکەونە خزمەتی شێخ. شێخ بۆ ئەوەی ئەندازەی باوەڕی ئەوان تاقی بکاتەوە، بە جۆرێ کە هەموویان ببیسن (بلا تشبیه) ترێ ئەداتۆ! لاوەکان ئەدەن لە قاقای پێکەنین و ئەڵێن: بابە بە هەڵەدا چوین شێخی چی و کەشکی چی! ئینجا هەموویان جێی تێڵن و ئەڕۆن. شێخ کە لە دەستی ئەم لاوە خاوانە رەحەت ئەبێ روویان تێ ئەکا و پێیان ئێژێ: ئێوە بەفڕێ موسوڵمانن و بەترێ کافر!

**٢٢٦ـ بە قالاو ئێژێ: گدی!**

○ به کلاغ آوای بز سر می‌دهد.

● **واتە:** ئەوەندە لاواز و بێ هێزە کە زەینی ناسینی نەماوە و باڵندە و چەڕندە لە یەک جیا ناکاتەوە.

**٢٢٧ـ بە قسەم حەزرەت عەباست باور بکەم یا بە جووجکەی کەڵەشێرەکە ؟**

○ به قسم حضرت عبّاست باور بکنم یا به دم خروس ؟

● **واتە:** سوێند خواردنەکەت و نیشانەی خیلافەکەت یەک ناگرن.

**ئەگێرنەوە:** پیاوێ کەڵەشێرێ ئەدزێ و ئەیداتە ژێر عاباکەی، بەڵام کلکی کەڵەشێرە کە بە دەرەوە ئەبێ و خۆی نازانێ، خاوەن کەڵەشێر پەیدا ئەبێ و لەو کابرا ئەپرسێ: ئەرێ برا تۆ کەڵەشێرێکت نەدیوە؟ کابرای دز ئێژێ: نە بە حەزرەت عەباس! ساحێب کەڵەشێر،کە کلکی کەڵەشێرە کە لە ژێر عابای کابرای دزا ئەبینێ، پێی ئەڵێ: بە قەسەم حەزرەت عەباست باوەڕ بکەم یا بە جووجکەی کەڵەشێرە کە؟

**۲۲۸ـ بە قسەی خوەش مار لە کونا تێتە دەرۆ.**

○ با زبان خوش مار از سوراخ بیرون می‌آید.

● **واتە:** زوانت خۆش بێ تا دوژمنیشت بە دۆست بێ.

**۲۲۹ـ بە قنگ درگایان پیٚ کردۆ.**

○ او را عقب عقب از در اتاق بیرون انداختند.

● **واتە:** بە زۆر لەو جێگا دەریان کرد.

**۲۳۰ـ بە کار ناخوات زۆری بێ زات!**

○ زور بدون جرأت بی فایده است.

● **واتە:** زۆر و زات پێکەوە بێت بە کەڵک دێ.

**۲۳۱ـ بە کارەکەر بێژی خانم، هەرچی کاسە و کەوچکە ئەیشکنێ.**

○ به کُلُفت بگویی خانم، تمام ظرف و ظروف را می‌شکند.

● **واتە:** بەعزە کەسێکی کەم شیاو، زەرفی گۆڕانیان نی‌یە و زوو لە خۆ دەرئەچن.

**۲۳۲ـ بە کاسەیەک ئەی‌کەن و بە کەوچکێک ئەی‌خوەن.**

○ در یک کاسه می‌پزند و با یک قاشق می‌خورند.

● **واتە:** ئەوان یە کێکن و لە یە ک دەرناچن.

**۲۳۳ـ بە کام سازت برەقسم ؟**

○ با کدام ساز تو برقصم ؟

● **واتە:** بە کام قسەت باوەڕ بکەم ؟

**٢٣٤ـ بە کشمیشێ گەرمی ئەکات و بە نیسکێ سەردی.**

○ با یک کشمش تب می‌کند و با یک عدس سردی.

● **واتە:** ئەو کەسە زۆر ناسک نارنجییەو تاقەتی گەرما و سەرمای نی‌یە.

**٢٣٥ـ بە کشە و مرێ، خاتری گەرد ئەگرێ.**

○ با یک انتقاد مختصر، آزرده خاطر می‌شود.

● **واتە:** زۆر دڵ ناسکە و تاقەتی بیستنی هیچ رەخنەیەکی نی‌یە.

**٢٣٦ـ بە کلکی گوێز ئەشکێنێ! (یا: بە جووجکەی گوێز ئەشکنێ)**

○ با دُمش گردو می‌شکند!

● **واتە:** زۆر شادمان و سەرحاڵە.

**٢٣٧ـ بە کۆڵ تەواف کابەی پێوە بکە، لە بەر چاوی نی‌یە!**

○ او را کول بگیر و به طواف کعبه ببر، قدرشناس نیست.

● **واتە:** هەرچی یەکی لەگەڵ بکەی قەدری نازانێ.

**٢٣٨ـ بە کونای دەرزیا ئەچێت.**

○ از سوراخ سوزن می‌گذرد.

● بە یەکێکی زۆر لەڕ و لاواز ئەوترێ.

**٢٣٩ـ بە کەر موسایی فێر نالبەنی ئەوێ.**

○ با خر یهودی نعلبندی یاد می‌گیرد.

● **واتە:** بە ماڵی مەردم خۆی فێری کار ئەکا.

**٢٤٠ـ بە کەر ناوێرێ بە کۆپان شێرە. (یا: بە کەر ناوێرێ بە کۆپان فێرە. یا: بە شێر ناوێرێ بە کورتان رەپە رەپیە.)**

○ از عهده خر برنمی‌آید، نسبت به پالان خر شیر است.

● **واتە:** بە زۆردار ناوێرێ و بە سەر هەژارانا زاڵە.

**٢٤١ـ بە کەوچکێ ئاوکەفتە مەلە.**

○ با یک قاشق آب به شنا کردن افتاد.

● به یه کێکی کەم شیاو و کەم زەرف ئەوترێ.

**۲۴۲ـ بە ک... مەردم گ... ئەکا.**

○ با آلت تناسلی دیگران جماع می‌کند.

● **واتە:** خۆی پیاوەتی لێ نایە و بە پیاوەتی خەڵکەوە شانازی ئەکا.

**۲۴۳ـ بە گایەک گێرە ناکرگێ.**

○ با یک گاو خرمن کوبی ممکن نیست.

● **واتە:** بە تەنیا کەسێ ئەم کارە پێش ناچێ.

**۲۴۴ـ بە گرێ ئەکوڵێت و بە پفێ لە کوڵ ئەچێتەو.**

○ با یک شعله به جوش می‌آید و با یک پف جوشش آن فروکش می‌کند.

● **واتە:** ئەو کەسە بە قسەیەکی بچووك زۆر زوو توورە ئەبێ و بە هەڕەشەیەکی بچووکیش لە گرمە گرم ئەکەوێ.

**۲۴۵ـ بە گورگ‌یان وت سۆزی نۆرە رانتە! دەسی کرد بە گیریان،وتیان بۆچە ئەگیری؟ وتی ئەترسم ئەم قسە درۆ بێت!**

○ به گرگ گفتند فردا نوبت چوپانی توست! شروع کرد به گریه کردن، گفتند چرا گریه می‌کنی؟ گفت می‌ترسم این سخن دروغ باشد!

● به خەبەرێکی دوور لە باوەڕ ئەوترێ کە بیدەن بە کەسێ، کە شیاوی ئەو خەبەرە نەبێ.

**۲۴۶ـ بە گورێس تۆ کەفتکەسە چاڵ!**

○ با طناب تو در چاه افتاده است.

● **واتە:** تۆ ئەو کەسەت تووشی ئەو کۆسپە کردووە.

**۲۴۷ـ بە گوڵیان وت: بۆچە واگەشی؟ وتی: باخەوانەکەم مەردە.**

○ از گل پرسیدند: چگونه است که این اندازه سرحال هستی؟ گفت: باغبانم مرد است.

● **واتە:** ئەگەر گەورەی ماڵ، زانا و لێهاتوو بێ، ئەهلی ئەو ماڵە، بە دەماخ و شادمانن.

**٢٤٨ـ بەگوڵێ بەهار نایەت.**

○ با یک گل بهار نمی‌آید.

● **واتە:** بە پێش هاتێکی دڵخواز بەڵام بچووك، حوکمی گشتی نادرێ.

**٢٤٩ـ بەڵا لە بۆگەن ئەوێتەو.**

○ بلا از موجود بدبو ایجاد می‌شود.

● **واتە:** لە کەسانێ کە قسەی ناخۆشیان بە شوێنەوەیە دووری بکە با تووشی عەزیەت نەبی.

**٢٥٠ـ بەلای دێزەی رەشەو دامەنیشە با رەش نەوی. (یا: بە لای دێزەی رەشەو، دانیشی رەش ئەوی).**

○ در کنار دیگ سیاه منشین تا سیاه نشوی.

● **واتە:** رەفێقی خراپ، مرۆڤ بەد ناو ئەکا، کەوا بوو دووری لێ بکە.

**٢٥١ـ بە لە ئاو، مەدە لە پرد نامەرد.**

○ به آب بزن امّا از روی پُل ساختۀ دستِ افراد نامرد عبور مکن.

● **واتە:** مرۆڤ گیانی خۆی بخاتە مەترسی‌یەوە باشترە لەوەی منەتی نامەرد بکێشێ.

**٢٥٢ـ بە لەفز قەڵەم قسە ئەکا.**

○ با لفظ قلم سخن می‌گوید.

● **واتە:** خۆی لێ گۆڕاوە.

**٢٥٣ـ بە لێو ئەخورگێ.**

○ با لب خورده می‌شود.

● بە خواردەمەنی‌یەکی نەرم ئەوترێ.

**٢٥٤ـ بە مانگای نەزاوە چاوگوێرەکە دەر تێرێ!**

○ هنوز ماده گاو نزاییده است، چشم گوساله را درمی‌آورد!

● **واته:** هێشتا بە جێگەیەك نەگیشتووە، ئەکوژێ و ئەبڕێ!

**٢٥٥ـ بە مانگ بچۆ مێوان بە، بە ساڵ بچۆ سوڵتان بە.**

○ ماهی یک بار برو و مهمان باش، سالی یک بار برو و سلطان باش.

● **واته:** کەم بچۆ با قەدرت نەچۆ.

**٢٥٦ـ بەم دەس ئەیداو بەو دەس ئەیواتەوا!**

○ با این دست می‌دهد و با آن دست پس می‌گیرد.

● **واته:** خەڵات و بەخشینی ئەوکەسە، جێگەی باوەڕ نی‌یە.

**٢٥٧ـ بە مەرگ بیگرە، تا بە یاو رازی بێت.**

○ به مرگ بگیر، تا به تب راضی شود.

● **واته:** زۆرتر لەوەی کە گەرەکتە پای لێ داگرە با بەوەی کە ئەتەوێ، بگەی.

**٢٥٨ـ بە مەویژێ نەزانێ بە کەویژێ نازانێ.**

○ اگر قدرشناس یک دانه مویز نباشد، قدرشناس یک کاسۀ پر از مویز نیز نخواهد بود.

● **واته:** ئەگەر بەکەم نەزانێ، بە زۆریش هەر نازانێ.

کەویژ: زەرفی پێوانەیە.

**٢٥٩ـ بە نان هات و بە ئاو خوریا.**

○ چون نان آمد و چون آب خورده شد.

● بە چتێ ئەوترێ کە دوور لە باوەڕ، گوم ببێ.

**٢٦٠ـ «بەنا» و «ماس» وەخت خوەی خوەشە.**

○ بَنا و ماست در فصل خودش خوشمزّه است.

● **واته:** هەرچی چتە لە وەختی خۆیا خۆشە.

«بەنا»: مەنێ، گیایە کە لە تیرەی چەتری‌یەکان کە لە بەهارا سەوز ئەبێ و تا جوانە ئەیکەنن و بە ماسەوە ئەیخۆن.

**٢٦١ـ بە ناو نیشان پەڵە هەورەکە!**

○ به نام و نشانی همان لکّهٔ ابر!

● **واتە:** ئەو بەڵێنە وا داوتە جێگای باوەڕ نی‌یە.

**ئێژن «نەسیمی عەیار»** هەر چتێکی بە نرخی دەس‌بکەوتایە، لە کاتێکدا کە پەڵە هەورێکی بە ئاسمانەوە بدیبایە، ئەو چتەی لە عاستی ئەو هەورەوە ئەکرد بە ژێر خۆڵەوە یان ئەی نایە درزی بەردێک و بۆ دۆزینەوەی چتە کە لە دواییدا هەورە کەی کردبوو بە نیشانە. جا مەعلومە هەور لە بەین ئەچوو، وە ئەویش بەو چتە وا شاردبوویۆ لە هیچ کات دا نەئەگەیی.

**٢٦٢ـ بەنای ناشی، دیواری لارە.**

○ بنّای ناشی، دیوارش کج است.

● **واتە:** لە رووی دەس‌کردۆ، ئوساکار ئەناسرێ.

**٢٦٣ـ بەن لە تەختە، حیزیش وە بەختە!**

○ به تخته بزنید، هیزی هم به شانس است.

● **واتە:** هەرچی چتە بە بەختە تەنانەت کاری خراپیش!

**٢٦٤ـ بەن لە تەختە، هەرچی چتە بە بەختە.**

○ به تخته بزنید، همه چیز به بخت بستگی دارد.

● **واتە:** هەرچی کارە پێوەندی بە بەخت و ئیقباڵەوە هەیە.

**٢٦٥ـ بە نۆکێ لە نوێژ ئەچێ!**

○ با یک نخود نجس می‌شود.

● **واتە:** زۆر زوو ئەڕەنجێ.بە کەسێکی دڵ ناسک ئەوترێ.

**٢٦٦ـ بە نەوگ مەردم سەر ئەورێ.**

○ با نَمَد مردم را سر می‌بُرَّد.

● **واتە:** بە خۆی نەرم و قسەی خۆش مرۆڤ ئەکوژێ!

**٢٦٧ـ بەنی شلۆ بووگە.**

○ بندش شُل شُده است.

● **واتە:** ١ـ لەوە ئەچێ لە بەندیخانە ئازادی بکەن. ٢ ـ کار و باری شێواوە بە یە کا.

**٢٦٨ـ بەو با ئەژیم لە تەرف تۆوّ بێ.**

○ بە آن باد زندەام کە از سوی تو بوزد.

● **واتە:** ژینی من بە مەرحەمەتی تۆوە پێوەندی هەیە.

**٢٦٩ـ بەوبەخت ئەو قافڵە وا پیشاهەنگی‌کەرە.**

○ بدبخت آن قافلەای کە پیشاهنگش الاغ باشد.

● **واتە:** سەر قـافڵەی نـەزان،قـافڵە ئـەبابۆ کـەس‌نەزان! (مـەبەست بـۆ لای رەنـج و کوێرەوەری‌یە)

**٢٧٠ـ بە وشتریان وت:بۆچە ملت لارە؟ وتی:جاکوێنەم راسـە تـا مـلیچم راس بێ؟**

○ بە شتر گفتند: چرا گردنت کج است؟ گفت: کجای بدنم راست است تا گردنم نیز راست باشد؟

● بە کەسێک ئێژن کە عەیبی یە ک و دوان نەبێ.

**٢٧١ـ بە وشتریان وت ملت بۆچە درێژە؟ وتی: دووربینی دوا ئەکەم.**

○ بە شتر گفتند چرا گردنت دراز است؟ گفت: آیندە نگری می‌کنم.

● **واتە:** بۆ هەرکەس پێویستە دووربینی دوارۆژ بکا.

**٢٧٢ـ بەو لە بەوتر، خاسترە.**

○ بد از بدتر، بهتر است.

● **واتە:** لەبەین دوو کاری خراپا ئەوەیان هەڵبژێرە وا خراپەی کەمترە.

**٢٧٣ـ بە هاکردن، بە هووکردن، چووگەسە شار بۆ شووکردن!**

○ با های و هوی راه انداختن، بە شهر رفتە است تا شوهر کند.

● بە تەوس بە ئافرەتێک ئەوترێ کە خۆی لێ گۆڕابێ و وا بزانی ئە گەر جێگە و رێگەی خۆی جێ هێڵاو چوو بۆ وڵاتێکی‌تر، زۆر ماقووڵ ئەبێ!

**٢٧٤ـ بەهانەی بەنی‌ئیسرائیلی ئەگرێت!**

○ بهانهٔ بنی‌اسرائیلی می‌گیرد!

● **واتە:** پەڵپی سەخت ئەگرێ.

**٢٧٥ـ بەهانەی تر، نان جۆیینە!**

○ بهانهٔ باد شکم، خوردن نان جو است.

● **واتە:** بۆ پینەکردنی کارێکی خراپ واکردوویەتی بڕوبەهانەی پووچەڵ تێرێتۆ.

**٢٧٦ـ بە هەر چاوێ تۆ من ئەوینی، هەر بەو چاوە منیچ تۆ ئەوینم.**

○ باهرچشمی‌که تو مرا می‌بینی، من نیز باهمان چشم تو را می‌بینم.

● **واتە:** چۆن لەگەڵ منا موعامەلە ئەکەی، وات لەگەڵا موعامەلە ئەکەم.

**٢٧٧ـ بە هەڵوا هەڵوا دەم شیرین ناوێ.**

○ به حلوا حلوا گفتن دهان شیرین نمی‌شود.

● **واتە:** وتەی بێ کردار بەکەڵک نایە.

**٢٧٨ـ بە هەوای بەچە، ئەخوەم کولووچە!**

○ به هوای بچّه‌دار شدن، کلوچه می‌خورم.

● **واتە:** بە تەمای بیستنی خەبەرێکی خۆش، شادمانم.

**٢٧٩ـ بەیتەکەی «بلە»س و شاییەکەی «خولە».**

○ بیت «بله» است و شادی «خوله».

● بە قسەیەکی هیچ و کارێکی پووچ ئەوترێ.

**بلە: برایم (ابراهیم) / خولە: مەحموو (محمود)**

**٢٨٠ـ بە یەک لۆ نەئەگەی‌یەو، نۆگەی دوولانەس!**

○ یک لا نمی‌رسید، نوبهٔ دولا است!

● **واتە:** لەم حاڵە ئاسایی‌یەداکە هەیەکارێ ناکرێ، بێ‌دیار حاڵەتێکی لەمە سەخت‌تر!

**٢٨١ـ بێ بگار ئەدا لە ئاو (یا: بێ‌بگار مەدە لە ئاو).**

○ بدون شناختن پایاب به آب می‌زند.

● **واته:** ڕێگای نەناسراو ئەبڕێ!

**٢٨٢ـ بێ حەیا، دای لە دەریا وتی: تەرتەر نەباشەدا!**

○ بی‌حیا به دریا زد و گفت، ترشدن معنی ندارد!

● **واته:** بێ‌حەیا، هیچ عەیبێکی پێ عەیب نی‌یە و نای خاتە خۆی.

**٢٨٣ـ بیخەیتە ناو ئاگر بۆسۆی لێ هەڵناسێت.**

○ او را درون آتش بیندازی، بوی سوختگی از وی بلند نمی‌شود.

● بە یەکێکی هەژار و شڕ و وڕ ئەوترێ.

**٢٨٤ـ بێ‌دەسەڵات، ئەگیرێ!**

○ آدمِ ناتوان، گریه می‌کند.

● **واته:** لە کاری دنیادا تێ کۆشە و زەبوونی نیشان مەدە.

**٢٨٥ـ بێژنگێ بگرە ڕووتەو.**

○ غربالی مقابل صورتت بگیر.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر کەم ڕوو بێ.

**٢٨٦ـ بێژی و بیکەی، فیلەتەنی؛نەیەژی و بیکەی، کەرکەدەنی؛ بێژی و نەیکەی، مانگای تەرەزەنی!**

○ بگوئی و عمل کنی، فیل هستی؛ نگوئی و عمل کنی، کرکدن هستی؛ بگوئی و عمل نکنی، مادّه گاو تازه زاییده می‌باشی!

● **واته:** قسە و کردار ئەگەر یەک بگرێ، نیشانەی زیرەکی و پیاوەتی‌یە؛ کرداری بێ‌قسەیش، نیشانەی دەروون داری‌یە؛ بەڵام قسەی بێ کردار، نیشانەی تەمەڵی و نەتوانکاری‌یە.

مانگای تەڕەزەن: مانگای تازە زایە کە لەشی قورس و بێ‌هێزە.

**٢٨٧ـ بێسان، بێ‌سەرەخەر ؟**

○ جالیز، بدون مزاحم ؟

● **واتە:** هەرچی جێگەیە، زۆڵەکێکی تێدایە.

**٢٨٨ـ بیس گورگەکە ئاخری بە خشە دەرچوو!**

○ آن بیست گرگ، عاقبت خش‌خشی بیش نبود.

● **واتە:** ئەوەی وا زۆر لێی ترسا بووی، وەهم و خەیاڵ بوو.

**ئەم مەسیلە** قسەی ئەو کابرایە کە وتی لە ڕێگایەکۆ ئەڕۆیشتم، بیس گورگم لێ هەڵ کەوت! ئەوانەی واگوێیان لە قسەکەی بوو، بەگاڵتە وتیان بیس گورگ؟ چتی وا چۆن ئەبێ؟ کابرا وتی: با بیس نەبێ و دە بێ! وتیان: دە گورگ؟ کابر وتی: دە نە و پەنج! وتیان: پەنج گورگ؟ وتی: دوو! وتیان دوو؟ وتی: کورە بابە لێم گەڕێن خشە خشێ هات وام زانی گورگە!

**٢٨٩ـ بێ سورنا هەڵئەپەڕێ!**

○ بدون سُرنا نمی رقصد

● به یه کێک ئەوترێ کە بە فشە خۆش بێ.

**٢٩٠ـ بێشکەی من تەمەرە جوانکیە!**

○ گهوارهٔ مرا رنج و مشقّت جنبانده است.

● **واتە:** من بە ڕەنج و کوێرەوەری گەورە بووگم.

**تەمەرە: ڕەنج و سەختی.**

**٢٩١ـ بێعاریان خستە جەحانم، وتی: دارەکەی تەڕە!**

○ بی عار را بردند به دوزخ، گفت: هیزمش تر است.

● **واتە:** مرۆڤی بێعار و بێشەرم بە هیچ چتێ لە ڕوو ناچێ.

**٢٩٢ـ بێ کەلەشێریش ڕۆژ ئەوێتۆ.**

○ بدون خروس هم صبح فرا خواهد رسید.

● **واتە:** چ تۆ گەرەکت بێ چ گەرەکت نەبێ، ئەو کارە ئەنجام ئەدرێ.

**٢٩٣ـ بێگانە وەسەگای شێت!**

○ بیگانه مثل گاو دیوانه است.

● **واتە:** مرۆڤی غەریبە و نەناسراو جێگەی متمانە نی‌یە، ئەبێ لە گەڵ ئەوا بە تێبینی و حیساب کراو روو بە روو بیت.

**۲۹۴ـ بێڵەقور بە دەس خەڵکۆ سووکە!**

○ بیل گل در دست دیگران سبک است.

● **واتە:** بەعزە کەسێ، کاری کەسانی تریان بەلاوە سووکە.

**۲۹۵ـ بێ نا ئەیژەند، ئیسەیچە نا هابە دەسیەوا!**

○ بدون سُرنا می‌نواخت؛ حالا هم که سرنا در دست دارد!

● بە یەکێک ئەوترێ کە لەمەوپێش بێ بیانوو، ئابڕووی خەڵکی بردبێ، ئێستاش بیانووی دەس کەوتووە، جا ئیتر چی بکا، پەنامان بەخوا!

**۲۹۶ـ بێناو بە و بەدناو مەوە.**

○ بی نام و نشان باش ولی بدنام مباش.

● **واتە:** مرۆڤی بێ ناو و نیشان زۆر بەڕێز و سەنگین‌ترە لەو کەسەی کە بەخراپە لە نێو جەماعەت دا ناوی دەرکردووە.

**۲۹۷ـ بێوەژن کۆشی ئەکا.**

○ تلاشی چون بیوه زنان دارد.

● **واتە:** کارەکانی وەکوو کاری بێوەژنانە، هەر جەمی ئەکات و ئەیشارێتۆ.

**۲۹۸ـ بی، هەنار و بەی ناگرێ.**

○ درخت بید، انار و به، بار نمی‌آورد.

● **واتە:** لە مرۆڤی بێخێر چاوەڕوانی پیاوەتی ناکرێ.

# ■ پ

۱ـ **پا ئەدا لە پەین!**

○ پهن را با پا شخم می‌زند!

● **واتە:** بێکارە، نەتوان کارە.

۲ـ **پاچکە بەیتە ناکەس، هەوەس رانیچ ئەکا!**

○ به ناکس پاچه بدهید، هوس ران نیز می‌کند!

● بە کەسێ ئەوترێ کە ئەگەر چاکەیەکت لەگەڵ کرد، چونکە ناشیاو و بێشەرمە، تەمای زیاترت تێ ئەکا.

۳ـ **پادار بگرە، بێ پا ماڵ وێمانە.**

○ پادار را بگیر، بی پا مال خودمان است.

● **واتە:** ئەو چتەی وا مەترسی لە بەین چوونی لێ ئەکرێ بیگرە با نەفەوتێ، غەیری ئەوە جێگەی پەژارە نی‌یە.

۴ـ **پارەکە مرد و ئیمساڵ ساڵیەسی!**

○ پارسال مرد و امسال سالگرد وی است.

● بەکەسێ ئەوترێ کەکوتوپڕ بەر هێرشێکی سەخت و دوور لە باوەڕ بکەوێ و بدرێ بە عەرزا و لە سەر خۆی بچێ، بەو جۆرە کەوا بزانی مردووە!

۵ـ **پا لە ئەنازەی بەرەی خوەت درێژ مەکەرۆ.**

○ پا از اندازه گلیم خودت درازتر مکن.

● **واته:** زۆرتر له حەقی خۆت داوا مەکە.

**٦ـ پا مەنە سەر مارا با مارت لێ هەڵنەگەرێتۆ.**

○ پا روی سر مار مگذار تا مار به شما حمله نکند.

● **واته:** له زاڵم و زۆردار هەڵمەکەوە.

**٧ـ پاناڵ پەرت ئەکا!**

○ نعل پرت می‌کند!

● **واته:** هەرچی بە دەمیا دێ ئێژێ و بێ تێبینی قسە فڕە ئەدا!

**٨ـ پای پەتی خاسە لە پێڵاوی تەنگ ؛ بێ ژنی خاسە لە مارەکە و جەنگ.**

○ پای برهنه بهتر است از کفش تنگ ؛ مجرّد بودن بهتر است از نزاع و دعوای خانه.

تهی پای بودن به از کفش تـنگ — بلای سفر به که در خـانه جـنگ

بـه زنـدان قـاضی گـرفتار بـه — که در خانه دیدن بـرابـر و گـره

زنی راکه جهل است و ناراستی — بلا بر سر خود نه زن خـواسـتی

(بوستان سعدی)

● **واته:** بێ کەوشی و بێ ژنی لەکەوشی تەنگ و شەڕ و شۆڕی ناو ماڵ زۆر باشترە.

**٩ـ پای زل نەگبەتە ؛ سەر زل دەوڵەتە.**

○ پای بزرگ نشانهٔ بدبختی است ؛ سر بزرگ نشانهٔ خوشبختی.

● **واته:** پای زل نیشانەی رەنجکێشانی زۆر و هات و چووە و سەر زل نیشانەی مێشکی زل و بە بیرە.

**١٠ـ پایزە برا.**

○ برادر پاییزه.

● بە یەکێک ئەوترێ کە دێردێر بێت بۆ لات ئەویش بە تەمای چتێکەوە!

وەکوو ئەو کەسەی وا لە وەرزی پاییزدا پەیدا ئەبێ کە وەختی هـەڵ گـرتنی خـەلە

و خەرمان و باخاتە.

**١١- پای کردگەسە ناو کەوش گەورە گەلا.**

○ پا توی کفش بزرگان کرده است.

● **واتە:** تەك کەسانی ناودارا هەڵئەسێ و دائەنیشێ. بە تەوس ئەوترێ بە کەسێ کە قسەی زل زل ئەکا.

**١٢- پر پێسیەسی.**

○ پر پوستش است.

● **واتە:** ئەو چتە زۆر بۆ ئەو کەسە، تەواوە.

**١٣- پر دەممە لە خوێن و قووتی ئەدەم.**

○ دهانم پر از خون است و آن را قورت می‌دهم.

● **واتە:** زۆر ناڕەحەتم و دڵم پڕ لە دەردە بەڵام دەری ناخەم.

**١٤- پرسا بە و دانا بە.**

○ بپرس و دانا باش.

● **واتە:** پرسین ئەبێ بە سەبەبی زانین.

**١٥- پرست پێ ئەکەم بە قەوڵت ناکەم!**

○ با تو مشورت می‌کنم ولی به پیشنهاد تو عمل نمی‌کنم.

● **واتە:** لە کەسێ ڕێنموونیمان گەرەك بێت، بەڵام بە ڕێنموونی‌یەکەیشی گوێ نەدەین.

**١٦- پرسیان لە خوو بۆچە بە ڕۆژ دەرناکەوی؟ وتی: بەبۆنەی کردەوەی شەومەوا!**

○ از خوک پرسیدند چرا در طول روز ظاهر نمی‌شوی؟ گفت: به واسطهٔ کارهایی که شب کرده‌ام!

● بە کەسێ ئەوترێ کە ئەوەندە هەڵەی کردبێ، کە رووی نەبێ خۆی دەرخا و هەر خۆی بشارێتۆ.

**١٧ـ پرسیان لە قنگلاشک: مەسکەنت کوێنەس؟ وتی: با ئەزانێ!**

○ از کنگر خار (بوتهٔ خار کنگر) پرسیدند: مسکن تو کجاست؟ گفت: باد می داند!

● کەسێکی هەژار و بێ جێگە و ڕێگە بە خۆی ئەڵێ، کاتێ کە لێی ئەپرسن: ماڵت لە کوێ یە؟ ئەڵێ: من وەکوو قنگلاشك وامە، با بۆ هەر کوێ بمبا، ئەمبا.

**١٨ـ پرسیان لە کیسەڵ لە کوێ بوی؟ وتی: لە حماما! وتیان بە شان و ملتا دیارە!**

○ از لاک‌پشت پرسیدند کجا بودی؟ گفت: حمّام! گفتند از شانه و گردنت پیداست!

| | |
|---|---|
| آن یکی پرسید اشتر را کـه هـی | از کجا می‌آئی ای فرخنده پـی؟ |
| گـفت از حـمّام گـرم کـوی تـو | گفت خود پیداست از زانوی تو |

(مثنوی مولوی)

● بە یە کێك ئەوترێ کە لە سەر قسەیەك پا دابگرێ بەڵام بەڵگەیەکی لێ دەرکەوێ و بیخاتەوە درۆ.

**١٩ـ پرسیان لە گا پیر بۆ شۆن مانگای بەکەڵ ئەکەوی؟ وتی: لە ترس خوەما!**

○ از گاو پیر پرسیدند چرا دنبال ماده گاو آمادهٔ جفتگیری می‌افتی؟ گفت: از ترس تجاوز به خودم!

● بە کەسانێ ئەوترێ کە ئەهلی بەعزە کارێکی ناپەسەند نەبن، بەڵام بۆ ئەوەی خەڵکی نالەباریان لێ دوور بکەوێتۆ، وا نیشان بدەن کە ئەوانیش ئەهلی ئەو کارەن.

**٢٠ـ پرشنگ ئەوەشنێ (یا: پرشنگی لێ ئەوێتۆ)**

○ جرقّه می‌زند. (یا: از او جرّقه ایجاد می‌شود).

● **واتە:** لەو قسەیە یا لەو ڕووداوە زۆر تووڕەیە.

**٢١ـ پر ماڵیان بوو لە رازیانە و بە دڵ ئێشە مرد.**

○ خانه‌شان پر بود از رازیانه و خودش به دل درد مُرد.

● **واتە:** چنێ کە خۆی بووی و پێویستی حەیاتی پێ بوو کەڵکی لێ وەر نەگرت.

**٢٢ـ پشت دەس خوەی برد بە دەما!**

○ پشت دست خود را گاز گرفت.

● به یه کێک ئەوترێ که له کارێك زۆر پەشیمان بێ.

**۲۳- پشت له هەزار سوار هەڵناکا.**

○ در برابر حملهٔ هزار سوار فرار نمی‌کند.

● **واته:** زۆر ئازا و نەترسه.

**۲۴- پشت یەک نادەنه زەوینا.**

○ پشت یکدیگر را زمین نمی‌زنند.

● **واته:** له یه ك پشتیوانی ئه کەن.

**۲۵- پشیله دەمی نەئەگەییه دووگ ئەیوت سۆڵە!**

○ گربه دهنش به دنبه نمی‌رسید می‌گفت شور است!

● به یه کێك ئەوترێ که ئارەزووی چتێ بکا و دەسی پێ نه گا و له خەیاڵی خۆیا هەڵی‌سەنگێنێ. یان: ناحەزی خۆی بەو چته دەر ببرێ.

**۲۶- پشیله له بەر رەزای خوا مشک ناگرێ!**

○ گربه به خاطر رضای خدا موش نمی‌گیرد.

● تەوسه بەو کەسەی که کارێکی به رواڵەت مرۆڤایەتی ئه کا، بەڵام ئاشکرا ببێ که خێری خۆی تێدا دیوه و کردوویەتی.

**۲۷- پشیلەیش، پشیلەی قەیم!**

○ گربه هم گربهٔ قدیم.

● **واته:** هەموو چتێ قەدیمەکەی جێگەی متمانەیه.

**ئەگێرنەوە،** دایکێ ئێژێ بەکوڕەکەی: رۆڵه پشیله که دەم و چاوی ئەسڕێ، میوانمان بۆ دێ! کوڕه ئەڵێ: دایه ئەم قسانه هی قەدەیمه و کۆن بووەو و خورافەیه دەسی لێ هەڵ گره. دایه ئێژێ رۆڵه: پێشینان ئەم قسانەیان تەجروبه کردووه، سەبر کـه تـا سـۆزی میوانمان بۆ دێ! ئەو رۆژه و سێ رۆژی تریش سەبر ئه کەن و میوانیان بۆ نایه. کوڕه ئێژێ: دایه هایدە وتم ئەمانه خورافەیه دەسی لێ هەڵگره؟ دایەش سەری تەکان داو

وتی: رۆڵە بەو خوا بێژم چی ؟ پشیلەیش، پشیلەی قەیم!

**٢٨ـ پشیلەی کوێر نان لە ماڵی دەر نایەرێ!**

○ گربۀ کور نان از خانه‌اش بیرون نمی‌آورد!

● بەکەسێکی پیسکە و نانی خۆ نەخۆر ئەوترێ!

**٢٩ـ پف و سەورێ!**

○ پفی و یک لحظه صبر.

● **واتە:** لە کارا پەلە مەکە و سەبرت بێ.

**حیکایەتی ئەو کابرایە** کە چووە ماڵێك و شیر برنجی داخیان بۆ دانا و بێ ئەوەی سەبر بکا ساردۆبێ، بە داخی کەوچکێکی کردە دەمی و شیربرنج دەمی سووتان و سەری بەرزۆکرد بۆ ئەوەی نەختێ شیربرنجە کە لە دەمیا ساردۆبێت! لەوکاتەیش دا بۆ ئەوەی خاوەن ماڵ نەڵێ بۆچی ئەم میوانە سەری بەرزۆکردووە، لە خاوەن ماڵی پرسی: کاکە ئەم خانووەت بە چەن وەخت کردووەتۆ؟ خاوەن ماڵ کە لە دەردی کابرا تێگەیشتبوو، وتی: کاکە گیان: بە پف و سەورێ! واتە: ئەگەر تۆ سەبرت بکردایە چێشتە کە ساردۆ بوایە، وا دەمت نەئەسووتا!

**٣٠ـ پۆز عالی و جیب خالی!**

○ فیس و افاده زیاد ولی جیب خالی!

● بەکەسێ ئەوترێ کە فیز و دەماخی بەرز بێ و دەستی تەنگ!

**٣١ـ پۆسی دەواخی نایە!**

○ پوستش دبّاغی نمی‌پذیرد.

● **واتە:** گڵاوە و لە پاکی نایە.

**٣٢ـ پووری دەچێ بۆ مردن ؛ مووروو دەکاتە گەردن!**

○ عمّه (یا خاله) دارد به سوی مرگ می‌رود ؛ مهره به گردن می‌اندازد.

● **واتە:** ئاخری پیری و کرداری گەنجی ناکەونە یەك!

شیئانِ عجیبانِ هُمَا أبْرَدُ مِنْ یَخْ، شیخٌ یتصابا و صَبیٌّ یتشیَّخْ.

● **واتە:** دوو چتی سەرسووڕهێنەر هەن کە لە یەخ ساردترن، پیرێ کە کرداری گەنجانە لە خۆی نیشان بدا و گەنجێ کە کرداری پیران بکا.

**٣٣ـ پووشیان فرداگە.**

○ معادل : فاتحەاش را خواندەاند.

● **واتە:** لێی نائومێدن.

**٣٤ـ پووش لە ناوچاو خوەیا ناوینێ، بەڵام موو لە ناو تیکەی مەردما ئەوینێ!**

○ خاشاک را در چشم خودش نمی‌بیند، ولی مو در لقمهٔ مردم می‌بیند.

● بە کەسێ ئەوترێ کە عەیبی گەورەی خۆی نابینێ، بەڵام عەیبی بچووکی خەڵک ئەبینێ و رەخنە ئەگرێ.

**ئەگێڕنەوە** پیاوێ ئەچێتە ماڵێ بە میوانی،کاتێ کە دائەنیشن نان بخۆن، خاوەن ماڵەکە روو ئەکاتە میوانەکە و ئێژێ :پێم وایە لەو تیکەداکە گرتووتە موویەکی تێدا بوو! کابرای میوان هەر ئەمە ئەبیسێ بێ ئەوەی هیچ بێژێ هەڵئەسێ و لە ماڵەکە ئـەچێتە دەرۆ، کابرای خاوەن ماڵ بە شوێنیا ئەڕوا و ئەیگرێ و ئێژێ: ئەرێ کاکە ئەوە بۆچی دەرچویت و نانەکەت نەخوارد؟ میوانەکە ئێژێ: نانی ئەو ماڵە ناخورێ وا پووش لە ناو چاو خۆیا نابینێ، بەڵام موو لە ناو تیکەی مەردما (یان: میوانا) ئەبینێ!

**٣٥ـ پووشین چووە سەرم، خەم چووە بەرم.**

○ از وقتی کە سرپیچ بە دور سرم پیچیدم غم و اندوە بە من روی آورد.

● ئەمە قسەی کچێکە کە چووەتە ماڵی مێرد و باری بەرپرسی لە سەر شانی نیشتووە.

پووشین، کێش و مێزەری ژنانەیە.

**٣٦ـ پووڵت بوێ مەلا لە مێحراو دەرتێری!**

○ پول داشتە باشی ملاّ را از محراب بیرون می‌کشی!

● **واتە:** پووڵ هەرچی کارە ئەیکا!

**٣٧ـ پووڵ چەرمگ بۆ رۆژ رەش.**

○ پول سفید برای روز سیاە.

● **واتە:** ماڵ و سەروەت بۆ ئەوەیە، مرۆڤ لە تەنگانە دەربێنێ.

**۳۸ـ پووڵ گرد و بازار درێژ.**

○ پول گرد و بازار دراز.

● **واتە:** ئەگەر پووڵت بیێ ئەتوانی ئەوەی گەرەکتە بی‌سێنی و رێگەت لێ نەگیراوە.

**۳۹ـ پووڵ مەردم کیسە ئەدرێ.**

○ پول مردم کیسە پارە می‌کند.

● **واتە:** ماڵی خەڵکی جێگەی دڵخۆشی نی‌یە.

**۴۰ـ پووڵێ بە قنگەگان پەیا بوێ، ئەشێ بدرگێتە خەرج بەوەسیرییا!**

○ پولی کە از راە مفعول شدن بە دست بیاید، آن را باید خرج بواسیر کرد.

● **واتە:** دەخڵێکی پیس و حەرام، هەر لە رێگەی پیس و حەراما خەرج ئەبێ.

**۴۱ـ پەتاتە، شەلەمینەکە دەواتە.**

○ زُکام داری، خوراک شلغم دوای توست.

● **واتە:** شەلەم دەوای هەڵامەتە، بیخۆ چاک ئەبیتۆ.

**۴۲ـ پەت سواڵی مل دائەورێ.**

○ طناب گدایی گردن را می‌بُرّد.

● **واتە:** سواڵی مایەی سووکی و سەرشۆڕییە.

**۴۳ـ پەر تاوست گەرەکە، ئەشێ جەور هێندوستانی بۆ بکێشی.**

○ پر طاووس می‌خواهی، باید برایش جور هندوستان بکشی.

● **واتە:** کەسێ گەرەکی بێ بە ئامانجی خۆی بگا، ئەبێ عەزیەتیشی بۆ بکێشێ.

**۴۴ـ پەر تێرێتە دەمیا.**

○ پر بر دهانش می‌کشد.

● **واتە:** بەڵێنی درۆی ئەداتێ و فریوی ئەدا.

**٤٥- پەرژین (پەرچین) بۆ حەلالٚ زادەس.**

○ پرچین برای حلال زاده است.

● **واتە:** مرۆڤی پاک و رەسەن سنووری مافی کەسان ئەناسێ و ئەو سنوورە رەوایانە ناشکێنێ.

**٤٦- پەسەنی شاعەباس، شەمشەمەکوێرەس!**

○ مورد پسند شاه عبّاس، خفّاش است!

● ئەم مەسیلە بە تەوس ئەوترێ بە کەسێکی گەورە کە لە هەڵبژاردنی چتێکا، گەن پەسەن بێ.

**٤٧- پەشیمانی ئەگەر شاخی بوایە، سەد گەز شاخی بووا**

○ پشیمانی اگر شاخ می‌داشت، صد متر شاخش بود.

● **واتە:** لەو کارە کە کردوویەتی زۆر پەشیمانە.

**٤٨- پەلەپیتک ئەوەشنێ!**

○ تلنگر می‌زند.

● **واتە:** بە تانە و تەشەرەوە قسە ئەکا. قسەی بە تێکوڵ ئەکا.

**٤٩- پەنج تمەن و قنگەگانێ قەرزار بوین، دامان و هاتینۆ!**

○ پنج تومان و ک ... ی بدهکار بودیم، دادیم و برگشتیم.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بچێ بۆ چتێک و نە تەنیا ئەو چتەی دەس نەکەوێ، چتێکیش بدۆڕێنێ و خراپتریش.

**ئەم مەسیلە لەم حیکایەتە وەرگیراوە:**

کابرایەک ماینێکی بەتەڵەوی ئەبێ و ئەیەوێ بیبا بۆ ئەوگوندەکەی تر و ئەسپەکوێتی بە ناو بانگی کاکە حەمەی بخاتە سەر بۆ زک و زا.

رێ ئەکەوێ و ئەچێ بۆ ئەوگوندە و ئەچێتە ماڵی کاکە حەمە و ماین لە بەر دەرگـا ئەبەسێتۆ و بە رەسم و شێوازی ئەوکارە، خاوەن ئەسپ ئەبێ پارەیەک بسێنێ تا ئیزن بدا، ئەسپەکەی بخرێتە سەر ماینێ. خاوەن ماین پێنج تمەنی نرخی ئەوکارە ئەدا بە کاکە حەمە و ئەسپەکوێت لەگەوڕ تێرنە دەرۆ بیخەنە سەر ماین. ئەسپ بە حینەحین ئەپەڕێتە

کۆڵ ماین و بە سەهوو تەکیا جووت ئەبێ! وکاریش لەکار ئەترازێ و دوای ئەوەش ئیتر ئەسپ ناتوانێ جارێکی‌تر جووت ببێ و پارەیش تازە رۆیشتووە و نادرێتەوە! خاوەن ماین رەشوەی ماین ئەگرێ و مات و مەلوول سەر دا ئەخا و بەرەو گوندی خۆیان ئەگەڕێتۆ. ئاشنایەکی لە رێگادا تووش ئەبێ و لێێ ئەپرسێ: کا مەحموو ئوغر وە خێر لەکوێوە بۆ کوێ؟ کا مەحمووی لێ‌قەوماو، بە زوێری‌یەکەوە دەس رائەکێشێ بۆ لای ماینەکە و ئێژێ: برا لەکوێ بووم! چووین بۆ لای کاکە حەمە، پێنج تمەن و قنگە گانێ قەرزار بوین دامان و هاتینۆ. ئیتر تۆ وە خێر و من وە سڵامەت!

**۵۰- پەنجەی خوەی گەست. (یا: پەنجەی خوەی برد بەدەما)**

○ انگشت خود را گزید.

● **واتە:** پەشیمانۆ بوو.

**۵۱- پەیمانە پر بووگە.**

○ پیمانە پر شدە است.

● **واتە:** ئەو زوڵمەگەیشتوەتە نیهایەت.

**۵۲- پەیمانەی پر بووگە.**

○ پیمانەاش پر شدە است.

● **واتە:** کاری تەواوە، ئاخریەتی.

**۵۳- پیادە ئەزانێ سوار تەنگی بەربووگە.**

○ پیادە می‌داند کە تنگ اسب سوار باز شدە است.

● **واتە:** عەیبی مرۆڤ خۆی نایبینێ،بەڵکوو ئەوانە ئەیبینن وا لەو دوورترن.

**۵۴- پیازەکەی عەوالانە، خواردنی هەس و بردنی نی‌یە.**

○ پیاز «ابدالان» است، خوردن دارد اما بردن ندارد.

● **واتە:** ئەتوانی لەم خواردەمەنی‌یەکە لە بەر دەستایە تا دڵت ئەخوازێ بخۆی، بەڵام بە تەمای بردنی مەبە.

**عەوالان:** کێوێکی بەرزە لە بەینی شاری سنە و کامیارانا.

**٥٥- پیازی بۆ پاک ئەکات.**

○ برایش پیاز پوست می‌کند.

● **واتە:** حیسابی لێ ئەبا.

**٥٦- پیاگ بێ دەسەڵات، چ لە شار و چ لە دێهات!**

○ آدم بی‌کفایت چە در شهر باشد چە در دە.

● **واتە:** مرۆڤی نەتوانکار و بێ‌غیرەت شار و دێی بۆ نی‌یە و هەر نەتوانکار و بێ‌غیرەتە.

**٥٧- پیاگ پیر بوو، چۆلەکەی پێ ئەگرن.**

○ آدم کە پیر شد او را بە گرفتن گنجشک می‌گمارند.

● **واتە:** مرۆڤی پیر، ئەبێ بە گاڵتەجاڕی خەڵکی نەفام.

**٥٨- پیاگ چەقۆس و ژن هەسان.**

○ مرد چاقو است و زن سنگ ساب (فسان).

● **واتە:** ژن بە زمانی خۆی پیاو تیژ ئەکاتۆ.

**٥٩- پیاگ دووژنە جەرگی کون کونە.**

○ مرد دوزنە جگرش سوراخ سوراخ است.

● **واتە:** ماڵی پیاوی دوو ژنە، هەر ئاژاوەیە و ئەو پیاوە قوڕ بە سەرە ئەبێ هەر خەفەت بخوا.

**٦٠- پیاگ رەفێق شێت بێت،بەڵام رەفێق گەوج نەوێت!**

○ آدمی با دیوانە دوست باشد، ولی با احمق نە.

● **واتە:** شێتی لە گەوجی باشترە.

**٦١- پیاگ گول، تر زل.**

○ آدم کم وجود و بی اهمّیت، تیزش بلند است.

● **واتە:** مرۆڤی بێ نرخ و بێ نموود، فیز و دەماری بەرزە.

**٦٢- پیاگ موحتاج، سەر بە درگای نامەردا ئەکا.**

○ آدم محتاج، سر به در خانه نامرد فرو می‌کند.

● **واته:** مرۆڤی دەس تەنگ، کاتێ‌جار نیازی ئەبێ‌ که روو بخا له ناکەس.

۶۳ـ **پیاگ وەختێ ماتڵ بێ، قەوم دوور و قەرزکۆنه ئەکاته یاد!**

○ آدم وقتی که محتاج باشد، به یاد قوم و خویش دور و طلب کهنه می‌افتد.

● **واته:** مرۆڤ له تەنگانەدا ئەکەوێته بیری ئەو چته کۆنانه وا پێشتر نەئەکەوتنه بیری.

۶۴ـ **پیاگەتی به سەر ئاو حماما ئەکا.**

○ بر آب حمام تعارف می‌کند.

● **واته:** له چتێ ئەبەخشێ که بۆ ئەو خەرجێکی تێ‌ناچێ.

۶۵ـ **پیاگ هەر دەفعەیەک ئەمرێ.**

○ آدمی فقط یک بار می‌میرد.

● **واته:** مرۆڤ نابێ له ئەنجامی کارێکا ترس ولەرز بیگرێ، چونکه ئەو کاره ئەگەر مردنی پێوه بێ مەرگ هەر جارێکه و دێت و تەواو ئەبێ، بەلام بۆ ترسەنۆک هەردەمێک مەرگێکه.

۶۶ـ **پیاوەتی ها له بەخشینا نەک له تۆڵه سەندنا.**

○ مردانگی در عفو است نه در انتقام.

● **واته:** ئەگەر کەسێ خراپەیەکی لەگەڵ‌تاکرد، بیبەخشه و له بیری تۆڵەسندنەوه دا مەبه. پیاوەتی بەوه ئێژن.

الکاظمینِ الغیظَ والعافینَ عن النّاسِ واللهُ یُحِبُّ المحسنین. قورئان(۳/۱۳۴)

۶۷ـ **پێت ئێژم، مەنێ ئارد چەنێ فەتیرەی هاتیا!**

○ به تو خواهم گفت که یک من آرد چقدر فطیر دارد.

● **واته:** سەبر که حاڵیت ئەکەم! (بۆ ترساندنی کەسێ ئەوترێ)

۶۸ـ **پیرت نی‌یه، پیرێ بسێنه!**

○ اگر پیر نداری، پیری خریدار کن.

● **واته:** مرۆڤی پیر و دنیا دیه بۆ رێ‌نموونی هەرماڵ و بنەماڵەیەک پێویسته و بوونی

ئەو بەرە کەتە.

۶۹ـ **پیر لە پیری نی‌یە، لە سەرگوزەشتیە.**

○ ارزش پیر به سنّ طولانی او نیست بلکه به سرگذشتها و تجربه‌های وی است.

● **واتە:** نرخی مرۆڤی پیر وا بە ئەزموون و بیرەوەری‌یەکانیەوە.

۷۰ـ **پیر مەنێرە بۆ ئەسپ سەندن و جوانیش مەنێرە بۆ ژن خواستن.**

○ پیر را برای خریدن اسب و جوان را نیز برای خواستگاری مفرست.

● **واتە:** ئەگەر پیر بنێری بۆ ئەسپ سەندن، ئەو لە چاوی لەشی خۆیەوە ئەسپێ پەسەن ئەکا لەڕ و لاواز و بێ‌هێز، تا ئەگەر خۆی سواری بوو، ئەسپەکە نەیلەخشێنێ. گەنجیش هەرکچێکی بە ڕوومەت جوان ببینێ پەسەنی ئەکات وگوێی لە ڕەسەنایەتی و خولق و خۆیەوە نی‌یە! لە ئاکامداکاری هەر دوو دەسە پەشیمانی بار دێنێ.

۷۱ـ **پیر و پۆش هاتگەسە خورۆش.**

○ پیر و پوشیده به خروش آمده‌اند.

● لە کاتێکی خۆش وەکوو بەهار یا زەماوەن یا جەژنێکدا ئەوترێ کە هەموو کەسی تێدا هاتبێتە سەما و خۆشی.

۷۲ـ **پیری و هەزار عەیب!**

○ پیری و هزار عیب! (پیری و صد عیب!)

● **واتە:** لە کاتی پیریدا هەرچی عەیبی لەشە ڕوو ئەکاتە مرۆڤ.

۷۳ـ **پیس بە پیسا ئەروێ.**

○ کثیف به وسیله کثیف از بین می‌رود.

● **واتە:** چتی گەن ئەبێ چتی گەن لە بەینی ببا.

۷۴ـ **پێس سەگ بە دەواخی پاکۆ ناوێ.**

○ پوست سگ با دبّاغی پاک نمی‌شود.

● **واتە:** چتێ کە زاتی پیس بێ، بە هیچ چتێکی‌تر پاک نابێتۆ.

**۷۵ـ پێس (یا: پۆس) قورواق بۆ دەواخی ناژێ!**

○ پوست قورباغه ارزش دبّاغی ندارد.

● **واتە:** ئەو چتە وا رەنجی بۆ ئەکێشی، بەو رەنجە ناشێ.

**۷۶ـ پێس ورچ نەکوژیاگ ئەوەخشێ! (یا: مەوەخشە)**

○ پوست خرس شکار نشده می‌بخشد.( یا: نبخش)

● **واتە:** پیاوەتی بە سەر ئەو چتەوە ئەکا وا نی‌یەتی.

**وەکوو ئەڵێن:** لەگیرفانی خاڵی ئەبەخشێ.

**ئەم مەسیلە** قسەی ئەوکابرایە دێنێتەوە بیر وا چوو بۆ ماڵی خزمێکی و ئەو شیرینی‌یە کە ئەبوا بۆ مناڵەکانی ئەوی ببردایە، لە بیری چووبوو، یان هەر نەی‌ویستبوو شیرینی‌یان بۆ بسێنێ؛ وەختێ دانیشت و خێرهاتنیان کرد و مناڵی ئەو ماڵە دەوری خاڵۆیان گرت؛ کابرا وتی: واللە شیرینی مناڵەکانم لە بیر چوو بی‌هێنم، دۆستەکەی وتی: شیرینی چی، خۆت شیرینی؛ کابرا وتی: نە برا، شیرینی پێویستە، با بخۆن، با بخۆن! ئیتر لە چی با بخۆن، با خۆن ؟ خوا ئەیزانێ!

**۷۷ـ پێشەی تیا شکانگە. (پێشەی تیا شکیاگە)**

○ در آن کار استخوان خورد کرده است.

● **واتە:** لەو کارەدا، رەنجی زۆری کێشاوە.

**۷۸ـ پێشەی خوەی شکانگە.**

○ استخوان خودش را شکسته است.

▣ وەکوو قسەی پێشوو.

**۷۹ـ پێشەی رەش نەکردگە.**

○ استخوانش سیاه نشده است.

● **واتە:** هێشتا زۆر گەنجە.

**۸۰ـ پێکەنین فرە، گیریان ها بە شۆنیو.**

○ خندۀ زیاد، گریه به دنبال دارد.

● **واتە:** بە پێکەنینی زۆر و بێ جێگە خۆت سووک مە کە.

**٨١ـ پێکەنین ناوەخت، عاقیبەتی گیریانە!**

○ خندۀ بی موقع، عاقبتش گریه است.

● **واتە:** هەموو چتێ کات و ساتی خۆی هەیە، تەنانەت پێکەنین.

# ت

۱ـ **تا ئەم با لەم کونەوە بێ، ئەم ئاگرە ناگرێ.**

○ تا این باد از این سوراخ بیاید، این آتش شعله‌ور نمی‌شود.

● **واتە:** تا ئەم حاڵە کە پێش هاتووە، بە سەر نەچێ ئەم کارە سەر ناگرێ.

۲ـ **تا ئەمە سەر بگرێ، قیر رەش چەرمگ ئەوێ!**

○ تا این کار بخواهد انجام بگیرد، قیر سیاه، سفید می‌شود.

● **واتە:** ئەم کارە بەم زووانە سەر ناگرێ.

۳ـ **تا ئەمە سەر بگرێ، کلک وشتر ئەگەیەتە زەوی!**

○ تا این کار بخواهد انجام بگیرد، دم شتر به زمین خواهد رسید.

● **واتە:** ئەم کارە هەر سەرناگرێ.

۴ـ **تا ئێژێ هاڵە، هەنگور پێ ئەگەێ!**

○ تا می‌گوید غوره، انگور می‌رسد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر هێواش و لە سەرخۆ قسە بکات و گوێگران لێی وەڕس ببن.

۵ـ **تا ئێژی کشە کشمیش، فرمێسکی ئەرژێ. (یا: هاتگە)**

○ تا می‌گوئی کیشە کشمش، اشکش سرازیر می‌شود.

● بە یەکێکی دڵ ناسک ئەوترێ کە تاقەتی بیستنی هیچ رەخنەیەکی نەبێ.

**٦ـ تا بەو نەوینی، بەوخانە وە یاد ناکەی.**

○ تا بد نبینی، بد خانه را یاد نمی‌کنی.

● بە یەکێک ئەوترێ کە تووشی کەسێکی خراپ بوو بێ و بە دیتنی ئەو، یادی جێگایەک بکا، وا لەمەو پێش بە خراپی زانیوە.

**٧ـ تا پا نەنن بە سەریا، وەزە ناکا.**

○ تا پا روی سرش نگذارند، نیش نمی‌زند.

● **واتە:** ئەگەر کاریان بە سەریەوە نەبێ، ئەو کارێکی بە سەر کەسێکۆ نی‌یە.

**٨ـ تا تۆ ئەویتە بنیادەم، جوجکەی کەرەکوڵ ئەنیشێتە زەوی!**

○ تا تو آدم بشوی، دُم الاغ دُم کوتاه به زمین می‌رسد!

● **واتە:** بەم زووانە، تۆ عەقڵ ناگری.

**٩ـ تا تۆم نەوەشنی، خەرمان هەڵ ناگری.**

○ تا بذر در زمین نپاشی، محصولی برداشت نمی‌کنی.

معادلِ: نابرده رنج، گنج میسّر نمی‌شود.

● **واتە:** ئەبێ لە پێشدا هەوڵێکت دابێ، ئەوسا چاوەڕوانی بەرهەم بیت.

**١٠ـ تا خان برازۆ، لەشکر مەتازۆ!**

○ تا خان آماده بشود، لشکر می‌تازد.

● بە کەسێکی دێرخێز و تەمەڵ و خاوە خاوکەر ئەوترێ.

**١١ـ تا خاوەن ماڵ هات دز بگرێت، دز خاوەن ماڵی گرت!**

○ تا صاحبخانه آمد دزد را بگیرد، دزد صاحبخانه را گرفت!

● **واتە:** بە جێگەی ئەوە من لە ئەو گلە بکەم، ئەو لە من گلە ئەکا!

کەسێ ئەم مەسیلە ئێژێ کە لە کەسێکی تر گلەی ببێ و ئەوی تر دەس خۆی بخاتە بەرۆ.

**١٢ـ تا درێژ دا ئەنەوێ، کوڵ گشتی کۆ ئەکاتۆ.**

○ تا قد بلند خم می‌شود، قد کوتاه همه را جمع می‌کند.

● بە مرۆڤی بێ شەرم و حەیا ئەوترێ کە نۆرە بە کەس نەدا.

۱۳ـ **تا دۆ زۆر وێت، کەشک ڕەشە.**

○ تا دوغ زیاد باشد، کشک سیاه می‌شود.

● **واتە:** کاری بێ‌حیساب و بێ مەزەنە، ئاکامی پووچەڵە.

۱۴ـ **تاریکی مانگ سەر لە ئێوارە دیارە.**

○ تاریکی ماه از اوّل غروب پیداست.

● **واتە:** چۆنیەتی سەرەنجامی هەر کارێ، لە هەوەڵۆ دیارە.

۱۵ـ **تا ڕێوی قەواڵەی خوەی خوەندەو، کەوڵیان کەند.**

○ تا روباه قبالهٔ خود را خواند، پوستش را کندند.

● **واتە:** خۆت مەخە نێو ئەو ژانە سەرە، با تووشی پرس و جۆیەکی دوور و درێژ نەبی و سەرت لە دەس نەدەی.

۱۶ـ **تا زۆر وێساوێ، قەواڵە بەتاڵە.**

○ تا زور باشد، قباله باطل است.

● **واتە:** لە جێگایەکا کە زۆر وتن حوکم ئەکا، قانوون و یاسا نرخی نی‌یە.

۱۷ـ **تازە تری گۆزەڵە ناشکێنێ.**

○ دیگر گوزش کوزه نمی‌شکند.

● **واتە:** تازە کارێکی لە دەس نایە.

۱۸ـ **تازە خەریکە کای کۆنە شەن ئەکات! (یا: تازە خەریکە کای کۆن بە بـا ئەدات / ئەداتە با)**

○ تازه دارد کاه کهنه را باد می‌دهد!

● **واتە:** مرۆڤ نابێ لە روو داوی کۆن بدوێ و گلە و بنداشتی کۆنە بخاتە روو.

۱۹ـ **تازە راویار وا ئەزانێ، کۆنە راویار چتێ نازانێ.**

○ تازه شکارچی تصوّر می‌کند که کهنه شکارچی چیزی نمی‌داند.

● بە مرۆڤێکی دنیا نەدیدە و بێ تەجروبە ئەوترێ کە خۆی لە پیرێکی دنیا دیـدە و کۆنە کار بە زاناتر بزانێ.

**۲۰- تازه هاته روو، کۆنه کەفته پشت کەنوو! (یا: کونه کەفته گولۆی کەنوو)**

○معادل : نو که آمد به بازار، کهنه شود دل آزار.

● **واته:** تازه هات و کۆنه له بەر چاو کەوت.

**۲۱- تازه هێلکەی داگه دیانەوە!**

○ تازه یاد گرفته که تخم مرغ را به دندان بزند و بیازماید.

● **واته:** له هەوەڵی ئەزموونی ژیاندایه و هێشتا خاوه! هێلکه به دیانا دان، رەسمێکی نەورۆزی‌یه به ناوی هیلکه شکانێ، که لاوەکان لەو کایه نەورۆزی‌یەدا «سەرە» یـان «قوڵە»ی هێلکه که ئەدەن له دیان بزانن سەخته یا خێر.

**۲۲- تا ژیر گەریا بۆ بگار، شێت له ئاو چووه ئەوبەرەوە! (یا: تا ژیر بیری کردۆ شێت له ئاو پەریۆ!)**

○ تا عاقل دنبال پیدا کردن پایاب گشت، دیوانه از آب عبور کرد.

● **واته:** کاتێ جار ئەو کاره که بۆ بێ‌عەقڵێ رێکی دێ بۆ عاقڵێکی تێ‌بین رێک نایه.

**۲۳- تاس ئێژێ: بشکێم نەک بزرم!**

○ کاسه می‌گوید: شکسته شوم ولی به صدا درنیایم.

● **واته:** مردن باشتره له بەد ناوی.

**۲۴- تا سۆزی هەزار کڵاو با ئەیوا!**

○ تا فردا هزار کلاه را باد می‌برد.

● **واته:** له داهاتوو کەس خەبەری نی‌یه.

**۲۵- تا سەر نایخوا!**

○ برای همیشه از آن بهره‌مند نمی‌شود.

● **واته:** لەم حاڵەتەدا که بۆی رەخساوه بەردەوام نابێ.

**۲۶- تا سیر نەخوەیت، بۆی سیر له دەمت نایێ.**

○ تا سیر نخوری، بوی سیر از دهنت نمی‌آید.

● **واتە:** تا تۆ کارێ خراپ نەکەی ترست نەبێ و هیچ کەسیش سەبارەت بە تۆ خراپ نایەژێ.

۲۷ـ **تا فەرز وێساوێ، سوننەت بەتاڵە.**

○ تا فرض باشد، سنّت باطل است.

▣ وەکوو: تا ماڵ وێساوێ بە مزگەوت حەرامە.

۲۸ـ **تاقانە یاگەوج ئەوێ یا دێوانە!**

○ یگانه فرزند یا احمق می‌شود یا دیوانه!

● **واتە:** تاقە مناڵی ماڵ، باوك و دایکی ئەوەنە پێ‌یا ئەگەن، یاگەوجی ئەکەن یا شێت و نایەڵن سروشتی گەورە ببێ.

۲۹ـ **تاکچە نەکا بۆرێ، بۆرێ،کورە ناکاکاری زۆرێ!**

○ تا دختره اعلام آمادگی نکند، پسره اصراری ندارد.

● **واتە:** بەڵا لەکچەوە دا ئەکەوێ.

۳۰ـ **تاکۆسپێ نەروخێ، کەنێ پر ناوێتەو.**

○ تا تپّه‌ای فرو نریزد، گودالی پر نمی‌شود.

● دوای مردنی دەوڵەمەنێ ئەوترێ کە ئیرسی ئەو بگاتە مشتێ رەش و رووتی خزم و کەسی و ئەوان بە نان و نەوایەك بگەن.

۳۱ـ **تاکونایەک ئەگری، سەدکونای تری تێ ئەوێ.**

○ تا سوراخی را می‌گیری، صد سوراخ دیگر در آن ایجاد می‌شود.

● **واتە:** کۆسپ دوای کۆسپ هەر دێ.

۳۲ـ **تاکەنیشکی، ئەمیری؛ شووت کرد، گزیری؛ زکت کرد، پیری.**

○ تادختری، امیری؛ چون شوهر کردی، پاکار(پادو) هستی؛ به محض زاد و ولد، پیری.

● **واتە:** ئافرەت تا ها لە تاوی گەنجی‌داو شووی نەکردووە، سوڵتانە؛ دوای شووکردن وردە وردە ئەکەوێتە نێو عەزیەتی رۆژگار وکە مناڵی بوو، تێ ئەشکێ.

**۳۳ـ تاکەوشەکۆنە لە بیاوانا، نعمەت خواس!**

○ لنگه کفش کهنه در بیابان، نعمت خداست.

● **واتە:** لە تەنگانەی ژیاندا هەموو چتێکی بێ نرخیش، ئەتوانێ بەکەڵک بێ.

**۳۴ـ تاکێفێ نەرمێ کەنەلاێک پر ناوێتەو. (یا: تاکەنێ نەرمێ، کەنەلاتێ پر ناوێتەو)**

○ تا کوهی فرو نریزد، گودالی پر نمی‌شود.

◘ بڕوا بۆ پەندی ژمارە (۳۰)

**۳۵ـ تاگوو نەکا، نازانێ قنگی ها لەکوێنۆ!**

○ تا رفع حاجت نکند، نمی‌داند مقعدش در کجای بدن او قرار دارد!

● بەکەسێکی گێژ و نەفام ئەوترێ!

**۳۶ـ تاگوێرەکە بەگاو ئەوێ، وڵک دایکی بە ئاو ئەوێ!**

○ تا گوساله به گاو تبدیل می‌شود، کلیهٔ مادرش آب خواهد شد.

● **واتە:** تا باوك و دایك منالێ گەورە ئەکەن، ئەتوێنەوە.

**۳۷ـ تالان کریاگ بە ماڵ ئەوێ، زکەرۆ بە ماڵ ناوێ.**

○ شخص غارت شده مجدداً صاحب خانه می‌شود ولی شخص شکمو صاحب خانه و زندگی نمی‌شود.

● **واتە:** زکەڕۆ مەبە.

**۳۸ـ تاڵ و سۆڵ دنیای چەشتگە.**

○ تلخ و شور روزگار را چشیده است.

● بە یەکێکی بە تەجروبە ئەوترێ.

**۳۹ـ تاڵەبەن لە پشت، باخەوەر لە گشت.**

○ آنکه رشته نخ به دور کمر دارد، از همه چیز خبر دارد.

● **واتە:** بە چاوی سوکی تەماشای کەسێکی بە رواڵەت شڕ و شێواو مەکە، چونکە چ مەعلووم ئەو لە هەموو چت خەبەری نەبێ؟

۴۰ـ **تاڵی کەرە و خوەشی کەرەس!**

○ تلخ کن و شیرین کن است.

● **واتە:** هەر تاوێ ها لە سەر بار و مەجازێ.

۴۱ـ **تاڵێ موویش لە ورچ بکەنیتۆ، غەنیمەتە!**

○ یک تار مو هم از خرس بکنی، غنیمت است.

● **واتە:** بەدەس هێنانی خێرێکی کەم، لەو کەسە، هەر زۆرە.

۴۲ـ **تا ماڵ وێساوێ بە مزگت حەرامە.**

○ تا خانه احتیاج داشته باشد برای مسجد حرام است.

● **واتە:** نیازی ماڵ و منالّت لە پێشا دابین بکە، ئینجا، خێر و خێرات بکە.

۴۳ـ **تا مانگا بەرەڵابێ، کەڵەگا جەژنیە.**

○ تاماده گاو ول باشد، عید گاوگشن است.

● **واتە:** ئەگەر ئافرەت وێڵ بێ، هەرزەکار لە خۆشیدا پلەزیقان ئەکا.

۴۴ـ **تا ماوو کەوشێ نەو بیکاتە پای، وەختارێ کە مرد حەفت جفت لە سەرجای.**

○ تاز نده بود کفشی نداشت به پا کند. وقتی مرد هفت جفت کفش کنار رختخوابش بود.

● **واتە:** تا عومری بوو هیچ کەس قەدرێکی لێ نەئەنا، وەختێ مرد پرسە کەرو ئاو و گۆشت خۆری بۆ راستەوە بوو.

۴۵ـ **تا من وتم: «بسم‌الله»، ئەو وتی: «خوا زیاییکات».**

○ تا من گفتم: «بسم‌الله»، او گفت: «خدا زیادش کند».

● **واتە:** تا من دەسمکرد بە خواردن، ئەو تەواوی کرد.

۴۶ـ **تا نانەکە نەجاوی، ناچێتە خوارۆ.**

○ تا نان را نَجَوی، از گلو فرو نمی‌رود.

● **واتە:** هەموو کارێ تەنانەت نان خواردنیش زەحمەتی هەیە.

**۴۷ـ تانجی ئێمە کەوریشک تۆ ناگرێ!**

○ تازی ما خرگوش تو را صید نمی‌کند.

● **واتە:** ئێمە لە عاستی تۆ دەرنایین.

**۴۸ـ تانجی، بەگزادەی سەگە.**

○ تازی، بیگ زادەی سگ است.

○ بە یەکێکی بێ نرخ ئەوترێ کە خۆی لە ناو هاومالانیا بە ماقوڵتر بزانێ.

**۴۹ـ تانجی تسن، بەچکەی گووکەری ئەوێ!**

○ تازی چُسو، تولهٔ عنو می‌زاید.

● **واتە:** لە بنە تووی گەن، چتی گەن ئەکەوێتۆ.

**۵۰ـ تانجی خوێری لە وەخت راوا (یا: نەچیرا) گووی تێ!**

○ تازی بی عرضه به هنگام شکار ریدنش می‌گیرد.

● بە مرۆڤی وەخت نەناس ئەوترێ.

**۵۱ـ تانجی رەش کوژ، لە دەڵ تسن ناکەوێتۆ.**

○ تازی زیرک، از ماده سگ چسونمی‌زاید.

● **واتە:** کوڕی ئازا و بەغیرەت لە ژنی تەمەڵ و نەتوانکار ناکەوێتۆ.

**تانجی رەش کوژ:** تانجی‌یەکی خێرایە کە لەکاتێکداکە عەرز رەش بێ و کەروێشک توند دەرچێ، بتوانێ بیگرێ.

**۵۲ـ تانجی‌یەکەی قرووکە، لە وەخت راواگووی تێ.**

○ تازی «قروک» است؛ به هنگام شکار ریدنش می‌گیرد.

● بە یەکێکی وەخت نەناس ئەوترێ.

**۵۳ـ تانجی وەتەن، کەورێشک وەتەن ئەگرێت.**

○ تازی وطن، خرگوش وطن را می‌گیرد.

معادل: شغال بیشهٔ مازندرانی نگیرد جز سگ مازندرانی

● **واتە:** مرۆڤ لە هاو زوان و هاو رەگەزی خۆیەوە زیاتر تووشی زەرەر ئەبێ.

**٥٤ـ تان و پۆ هەورێشمە.**

○ تار و پودش از ابریشم است.

● بە تەوس ئەوترێ بە یەکێکی خۆ لێ گۆڕاو یا بە گزادە.

**٥٥ـ تا نەچێتە جەواڵ ناوێتە ماڵ.**

○ تا داخل جوال نرود، مال تو نمی‌شود.

● **واتە:** تا ئەو چتە دەستت نگرێ نابێ بە هی خۆتی بزانی.

**٥٦ـ تا نەکوتیاگین با بیخوەین.**

○ تا گور کوبمان نکردەاند از مال و دارائی خود استفادە کنیم.

● **واتە:** تا عومرێکمان ماوە، با ماڵی خۆمان بخۆین، ئەگینا دوای خۆمان قەبرەکەمان ئەدنە بەر تێلا و دەرمان دێنن.

**ئەم مەسیلە لەم حیکایەتە وەرگیراوە:** پیاوێکی زۆر رژد و دەوڵەمەن و ماڵات و ئاژاڵ دار لە دێیەکدا بووە، کە دەسی نەچوتە ماڵەکەی خۆی لێی بخوا، رۆژێ ژنەکەی بە دڵ و جەرگی حەیوان بێزگ ئەکا و بە شووەکەی ئێژێ با یەکێ لەم گیسکانە سەرببڕین و من جەرگەکەی بخۆم؛ کابرا بەوە رازی نابێ و ئێژێ ئەچم بۆ شار دڵ و جەرگت بۆ ئەسێنم؛ بەیانی ئەچێ بۆ شار و بە رەسمی ئەو زەمانە شەو ئەبێ بە میوانی ماڵێکی نەناس؛ ماڵەکە رێزی لێ ئەنێن و ژنی خاوەن ماڵ بەرلەوەی شێو بخۆن، بە شووەکەی ئێژێ: بخوەین و بیکوتین یان بیکوتین و بخوەین؟! کابرای میوان زۆر ئەترسێ و رەنگی زەرد ئەبێ، چونکە وا ئەزانێ مەبەستیان ئەوەیە ئەو بکوتن. خاوەن ماڵ تێ ئەگا کە کابرای میوان زۆر ترساوە، ئێژێ براگیان مەترسە، لەگەڵ تۆمان نی‌یە؛ بەڵکو باسمان لە خاوەنی پێشووی ئەم ماڵەیەکە بە رژدی مرد و ماڵەکەی خۆی نەخوارد و من دوای ئەو ژنەکەیم خواست و ئەمە ژنی ئەوە، جاکابرامان لە ناو حەوشی ئەم ماڵە دا ناوەتە قەبر و هەرچی شەوە بەر لە خواردنی شێو یا دوای خواردنی شێو من و ئەم ژنە، بە تێلا ئەنیشینە گیان قەبرەکەی و ئەیکوتین؛ ئەوا ئێستا ژنەکە هاتووە و ئێژێ ئیمشەو بەر لە شێو قەبرەکە بکوتین یان دوای شێو؟

کابرای رژد کە ئەمە ئەبیسێ زۆر سەری سووڕ ئەمێنێ و لە بەر خۆیەوە ئێژێ: ئەمە حیکایەتی من و دوارۆژی منە و ئەبێ بە خۆمابێم! بەیانی لەو ماڵە خواحافیزی ئەکا و بە

پەلە دێتۆ بۆ ماڵێ خۆیان وگورج کاوڕێ سەر ئەبڕێ وگۆشت و دڵ و جەرگە کەی ئە کا بە کەباب و ئەیدا بە ژن و مناڵە کانی. جا ژنە کەی لەم کارەساتە زۆر سەری سوورِ ئەمێنێ ولێی ئەپرسێ : ئەری شوووە کە ئا ئەمە چی بوو تۆ کردت؟ پیاوە کە ئێژێ : ژنە کە قسەی لێ مە کە تا نە کوتیاگین با بیخۆین!

**۵۷ـ تا نەیچەشی، نازانی.**

○ تا آن را مزّه نکنی، نمی‌فهمی.

● **واتە:** ئەبێ خۆت ئەو چتە بچێژی تا بزانی چلۆنە. یان: ئەو کـارە دەس پـێ‌بکەی تا لە چۆنیەتی ئەوە، تێ‌بگەی.

**عەرەب ئەڵێ:** مَنْ لَمَ یَذُقْ لَمْ یَدْرِ. تا کەسێ نەیچەشتبێ، دەرکی ناکا.

**۵۸ـ تانەی مەردم لە عەزاو قەور خراوترە!**

○ طعنهٔ مردم از عذاب قبر بدتر است!

● **واتە:** لە ئاکامی ئیشی خۆت بیر بکەرۆ تا بەر شەپۆلی تانەی خەڵکی نە کەوی.

**۵۹ـ تاوانکار ها بە لای یارۆ، (یا: بارۆ) بێ تاوان سەری ها بە دارۆ!**

○ گناهکار در کنار یار نشسته است، بی‌گناه سرش بالای دار است.

● **واتە:** حەق بە حەقدار نە گەیشتووە.

**۶۰ـ تاوسان، باوک هەتیمە.**

○ تابستان، پدر یتیم است.

● **واتە:** هەتیو لە هاوینا، نیازێکی گرینگی بە سەندنی جل و بەرگ نی‌یە و رەحەت‌تر ئەژی.

**۶۱ـ تاوسان رۆیی وکراس هەتیم دریا.**

○ تابستان رفت و پیراهن یتیم پاره شد.

● **واتە:** فەقیر و هەژار لە هاوینا باشتر ئەژین چونکە پێویستیان بە جل و بەرگی زۆر نی‌یە، جا رۆیشتنی هاوین بۆ ئەوان عازیەتی‌یە.

**۶۲ـ تاوسان رۆیی و لیباس فەقیر دریا.**

○ تابستان رفت و لباس فقیر پاره شد.
▣ وه‌کوو مه‌سیله‌ی پێشوو.

**۶۳ـ تاوێ گه‌شه و تاوێ ره‌شه.**
○ گاهی سرحال است و گاهی بدحال.
● **واته:** کاتێ وا له خۆشیا و کاتێ وا له تاڵیا.

**۶۴ـ تایفه‌ی ژن، له یه‌ک هه‌ڵئه‌گرن، له یه‌ک ناکوژن.**
○ گروه زنان از یکدیگر کش می‌روند، امّا یکدیگر را نمی‌کشند.
● **واته:** ژن خراپه به یه‌کتری ئه‌که‌ن، به‌ڵام له یه‌کی ناکوژن.

**۶۵ـ تایی گان ئه‌کا، دۆڵاوی ئه‌ی بژێرێ!**
○ اهل «طا» مرتکب خطا می‌شوند، اهل «دولاب» تاوان آن را می‌پردازند.
● **واته:** که‌سێ کارێکی ناشیرین ئه‌کا و ئه‌بێ که‌سێکی تر تاوانی ئه‌و کاره ناپه‌سه‌نده، بداتۆ.
«تا» و «دۆڵاو» ناوی دوو گوندن له نزیکی شاری «سنه» له رێگه‌ی کامیاران.

**۶۶ـ ترازو شه‌رمی له که‌س نی‌یه.**
○ ترازو از هیچکس شرم ندارد.
● **واته:** ترازو راست ئه‌نوێنێ.

**۶۷ـ تر به ته‌ورداسیه‌وه چه؟**
○ گوز چه ارتباطی با داسکاله دارد؟
● **واته:** ئه‌م قسه چ پێوه‌ندی‌یه‌کی هه‌یه به سه‌ر له‌و قسه‌وه؟ ئه‌م دوو چته هیچ پێوه‌ندی‌یه‌کیان پێکه‌وه نی‌یه.

**۶۸ـ ترپیان هه‌ڵکه‌ند، گه‌زه‌ر نیشته جێگه‌ی!**
○ تُرُب را از ریشه در آوردند، هویج جای آن را گرفت.
● **واته:** ئه‌و که‌سه‌یان لابرد و که‌سێکی تر هه‌ر وه‌کوو ئه‌ویان نایه جێگه‌ی.

**٦٩ـ ترپیش خوەی بە مێوە حەساو ئەکات!**

○ تُرُب نیز خود را جزو میوەجات بە حساب می‌آورد

● بە کەسێکی بێ وجوود ئەوترێ کە خۆی بە مرۆڤێکی بە نرخ بدا لە قەڵەم.

**٧٠ـ تر خوەم و سر خوەم.**

○ تیز خودم و راز خودم.

● **واتە:** چاکە و خراپەی خۆم با هەر بۆ خۆم بێ.

**٧١ـ ترس برای مەرگە.**

○ ترس برادر مرگ است.

● **واتە:** ئەگەر بترسی وەکوو ئەوە وایە کە بمری.

**٧٢ـ ترسەنۆک دوو جار ئەمرێ و ئازا جارێک!**

○ ترسو دوبار می‌میرد و شجاع یک بار.

**واتە:** مرۆڤی ترسەنۆک لە هەر کارێکدا دڵی بەردەوام ئەلەرزێ و مرۆڤی ئازا تاکاتی مەرگ ئەو دەڵە لەرزەیە نی‌یە.

**٧٣ـ ترێشتە بۆ خوەی ئەتاشێ.**

○ تیشە رو بە خودش می‌تراشد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەر بۆ لای خۆی بیکێشێ.

**٧٤ـ تری گۆزەڵە ئەشکنێ!**

○ تیزش کوزە می‌شکند.

● بە یەکێکی بەدەعیە و دەماراوی ئەوترێ.

**٧٥ـ تف خوەت بکە و برۆ!**

○ تفت را بکن و برو.

● ئەمە قسەی کەسێکە وا سەری بە کێکی تری نابێ بە کوسپێکۆ و دوای ئەوە گاڵتەی پێ بکا.

**ئێژن کابرایەک** لە قەراخی چەمێکی پڕ ئاودا وێسابوو، هەرچی ئەکرد زاتی نەبوو بدا

لە ئاوەکە و بچێتە ئەو بەرۆ ؛کابرایەکی تر لە دووروٚ هات و وتی: ئەرێ برا ئەوە بۆ پەژارە دایگرتوی؟ ئەویش وتی: زاتم نییە بدەم لەم ئاوە، ئەترسم بم با! ئەم کابرایە وتی: کورە ماڵت نەشێوێ مەترسە و لێیدە، هیچ نییە ناتبا، کابرای ترسەنۆک وتی: ئەگەر بردمی چی؟ ئەمیش وتی: ئەگەر بردتی تفێکم لێکە! کابرا، ئەدا لە ئاو و ئاو دایئەتلێنێ و ئەیبا و لەوکاتەدا دەس ئەکا بە هاوارکردن و ئەقیڕێنێ : خۆ ئاوەکە بردمی ماڵت کاول بێ، فریامکەوە! ئەمیش ئەقیڕێنێ :وەمن چی، مەگەر نەم وت ئەگەر ئاوەکە بردتی، تفێکم لێکە؟ ئیسە تف خۆت بکە و بڕۆ!

**٧٦ـ تف سەربەرەوژوور، ناوچاو خوەت ئەگرێتۆ.**

○ تف سربالا، توی صورت خودت برمی‌گردد.

● **واتە:** خراپەکردن لەگەڵ قەوم وکەسا، بۆ خودی مرۆڤ هەڵئەگەڕێتۆ.

**٧٧ـ تف لە دەمما وشک بووا!**

○ تُف در دهانم خشک شد!

● **واتە:** لەو قسەیە، یان لەوکارە، زۆر سەرم سووڕما و هیچم پێ نەوێژرا.

**٧٨ـ تۆ ئاغە و من ئاغە، کێ جێگەمان بۆ داخا؟**

○ تو آقا و من آقا، پس چه کسی برایمان رختخواب بیندازد؟

● **واتە:** ئەگەر هەر دووکمان خۆ بە زل بزانین کارمان پێش ناچێ.

**٧٩ـ تۆبەی گورگ عومر نۆحی گەرەکە.**

○ توبۀ گرگ عمر نوح می‌خواهد.

● **واتە:** ماوەیەکی زۆری گەرەکە تا زاڵم دەس لە خۆ و کردەوەی دەس‌درێژی هەڵبگرێ و بێتە سەر رێگەی راس.

**٨٠ـ تۆبەی گورگ مەرگە.**

○ توبۀ گرگ مرگ است.

● **واتە:** مەگەر مەرگ دەسی زاڵم لە زوڵم کۆتابکا.

**٨١ـ تۆپین کەر، زەماوەن سەگە.**

○ سَقَط شدن خر، سور سگ است.

● **واتە:** دەرد و رەنج و مەرگی کەسێ بۆ کەساتێکی بێ‌نرخ، جێگەی خۆشی‌یە.

**۸۲ـ تۆ رازی و من رازی، داریێ بە قنگ قازی!**

○ تو راضی و من راضی، چوبی به ک... قاضی!

● **واتە:** وەختێ من و تۆ لە یەک رازی بین نیازێکمان نی‌یە کەسێکی‌تر بکەوێتە بەینمان.

**۸۳ـ تورشی نیشان نەخوەشین‌دار ئەدات.**

○ ترشی به آدم مریض نشان می‌دهد.

● **واتە:** بە ئەو کەسەی وا تامەزرۆی چتێکە، ئەو چتە نیشان ئەدا و پێی نادا.

**۸۴ـ تورمە هەرچەن کۆنەیش بێ، بە پاتاوە ناکرگێ.**

○ ترمه هر چند کهنه نیز باشد، آن را پاپیچ نمی‌کنند.

● **واتە:** مرۆڤی خانەدان ولێ‌قەوماو، هەر جێگەی رێز و ئیحتیرامە و نابێ بە چاوی سووکی‌یەوە پێیدا بڕوانن.

تورمە: کووتاڵێکی بەنرخە لە جنسی کورک، نەوعی کشمیری و کرمانی‌یەکەی مەشهوورە.

**۸۵ـ توروشکە لە خوەی دوو شکە!**

○ تُرشَک از خود مشکوک است!

● بە کەسێ ئەوترێ کە بە کاری خۆی شکی ببێ و بە هەر پێش هاتێک راچەڵەکێ.

**۸۶ـ تۆزێکی لێ بوو ۆ.**

○ غباری از آن ایجاد شد.

● **واتە:** چتێکی لێ‌هەڵوەرا، نەختە خێرێکی لێ بە دەس هات.

**۸۷ـ تۆزی لێ ناوێتۆ.**

○ غباری از آن حاصل نمی‌شود.

● **واتە:** خێرێکی لێ بە دەس نایەت.

**۸۸ـ تۆشەکەت گاڵە، زوو بەرەو ماڵە!**

○ توشەات ارزن است، زودتر به خانه برو.

● **واتە:** زوو فریای خۆت کەوە ئەگینە ئەیدۆڕێنی.

**۸۹ـ تۆشەی مەردم برسی‌یەتی ناشکێنێ.**

○ کلوچهٔ مردم رفع گرسنگی نمی‌کند.

● **واتە:** نابێ چاوت بە دەسی خەڵکەوە بێت و دڵ بە ماڵی مەردم خۆش بکەیت.

**۹۰ـ توڵ بێت وکوڵ بێت و رووشەیشی ناو بێت!**

○ توله باشد و دم بریده باشد و اسمش هم روشه باشد

روشه: بی‌شرم، شرور.

● **واتە:** عەیبی ئەوکەم نەبوو عەیبێکی تریشی لێ زیاد بوو.

**۹۱ـ تۆ لە تەک عام، نەک عام لە تەک تۆ.**

○ تو با عامهٔ مردم، نه عامه با تو.

● **واتە:** تۆ خۆت پێوەندی بدە بە جەماعەت و تەمات نەبێ جەماعەت بێن بۆ لای تۆ.

**۹۲ـ تۆم کرد بە جۆڵا مەکۆم بدزی؟**

○ تو را جولاهی آموختم که ابزار کارم را بدزدی؟

● بە یەکێکی سپڵە و بێ‌سفەت ئەوترێ کە جەزای خزمەتی مەردم بە خراپی بداتۆ.

مەکۆ: ئامرازی جۆڵایی‌یە.

**۹۳ـ تۆم کۆنە لە دڵیا وەشیاگە.**

○ بذر کهنه در دلش کاشته شده است!

● **واتە:** رقی زووتری لە دڵدایە.

**۹۴ـ تون بیگری، شل تێ؛ شل بیگری، هیچ نایە.**

○ محکم بگیری، چیزی مختصر گیر می‌آوری؛ بی اهمیّت بگیری، هیچ چیز گیرت نمی‌آید.

● **واتە:** ئەگەر لە سەر ئەنجامی کارێ گەرم و گوڕ بی، هەر چتێکت دەس ئەکەوێ؛

بەڵام ئەگەر لە سەری سوور نەبی، هیچت دەس ناکەوێ.

**٩٥ـ تووڵ جەم کەر، برای سەوەتە چنە.**

○ آن که شاخه‌های تر و نازک را جمع می‌کند، برادر شخص سبد باف است.

● بە یەکێکی بێ وجوود ئەوترێ کە لە یەکێکی تر هەر وەکوو خۆی بچێ.

**٩٦ـ تووڵێ بە تەری نەچەمێتۆ، دواجار ناچەمێتۆ. (یا: تووڵ بە تووڵی ئەچەمێتۆ / تووڵ بە تەری ئەچەمێتۆ).**

○ نوشاخه‌ای که در حالت تری خمیده نشود، بعداً خم نخواهد شد.

● **واتە:** لاوان ئەبێ لەکاتی لاویدا شان بخەنە ژێرکار تا فێری کارکردن ببن ؛یان: مناڵ ئەبێ هەر لەو دەورەی مناڵی‌یەوە، لە لایەن باوک و دایکیەوە تەربیەت بکرێ، ئەی‌نە ئەگەر تەمەنی تێپەڕکا، لە دەس دەر ئەچێ و کارێکی پێ ناکرێ.

**٩٧ـ تۆ هائەکەی من هوو ئەکەم، تۆ ژن تێری من شوو ئەکەم!**

○ تو می‌گوئی «ها» من می‌گویم «هو»، تو زن می‌گیری من شوهر می‌کنم!

● **واتـە:** تۆ چیت ئەوێ منیش چتێکی هەر وەکوو ئەوەم ئەوێ و جیاوازی‌یەك لە بەینمانا نی‌یە.

**٩٨ـ تۆ هەنگاوێ روو بە من بێ تا من دە هەنگاو روو بە تۆ بێم.**

○ شما یک قدم به سوی من بردار تا من ده قدم به طرف شما بردارم.

● **واتە:** تۆ ئەگەر مەیلی دۆستیت لەگەڵ ئێمەدا هەیە، نیشانی دە تا ئێمەیش بەگەرمی، پێشوازیت لێ بکەین.

**٩٩ـ تۆیش نەوی بە یارم، خوا ئەسازنێ کارم.**

○ تو نیز یارم نباشی، خدا کارم را روبراه می‌کند.

● **واتە:** ئومێدی لای خوام هەیە و بەخەڵکی دڵ نابەسم.

**١٠٠ـ تەپڵی دریاگە.**

○ طبل او پاره شده است

● **واتە:** رێزی نەماوە.

**۱۰۱ـ تەپڵی زریاگە.**

○ طبل او به صدا درآمده است. معادل: طشت او از بام افتاده است.

● **واتـە:** حەیای چووە. بە کەسێ ئەوترێ کە عـەیبێکی بـووبێ وئـێستائەو عـەیبەی دەرکەوتبێ.

**۱۰۲ـ تەحل تەحل بێرۆ، شەل بنیشێ وەلای کوێرۆ.**

○ بیا بیا، تا شل در کنار کور بنشیند.

● یەکێک ئەمە ئێژێ کە کەم وکوڕی یەکی ببێ و لە کەسێکی وەکوو خۆی بە تەوس داوا بکا، کە بێت و بەلایەوە دابنیشێ تا پێکەوە دەردە دڵ بکەن.

تەحل: کرداری ئەمری عەرەبییە، واتە: تعال = بێ.

**۱۰۳ـ تەختە و پنە و قیمەکێش، رێ کەفتگن قەوم و خوێش.**

○ تخته و پنو و قیمه کش، راه افتاده‌اند قوم و خویش.

پنو: تخته‌ای است که خمیر را روی آن پهن می‌کنند.

● **واتە:** هەموو قەوم و خوێش تێ‌ڕژاون.

**۱۰۴ـ تەر و وشک بە یەکۆ ئەسوتن.**

○ تر و خشک با هم می‌سوزند.

● **واتە:** لەم رووداوە گوناحکار و بێ گوناح، زیان ئەبینن.

**۱۰۵ـ تەر و هەسی چێشت مشتێکە.**

○ رقیق و غلیظ بودن آش یا سوپ یک مشت آب فرق دارد.

● **واتە:** لە بەینی ئەو دوحاڵەتەدا، جیاوازی یەکی بەرچاو نی یە.

**۱۰۶ـ تەرەتۆڵەی پێ ناگەیە.**

○ هیچ شفتی (کم بهائی) به پایش نمی‌رسد.

● **واتە:** ئەو چتە زۆر هەرزانە.

**۱۰۷ـ تەرە، هەسە، هەر ئەوەسە!**

○ رقیق است یا غلیظ، همان است که هست.

● **واتە:** هەرچی هەیە، هەر ئەوەیە!

**١٠٨ـ تەشت تەڵا بنەبان سەرتەو.**

○ طشت طلا روی سرت بگذار.

● **واتە:** دنیا ئەمن و ئەمانە و هیچ مەترسی‌یەك نی‌یە و بۆ هەر کوێ ئەڕۆی، بڕۆ و مەترسە.

**١٠٩ـ تەشی رێس ئەگەر تەشی رێس بێت، بەکلک کەریش تەشی ئەرێسێت.**

○ دوک ریس اگر دوک ریس باشد، با دم الاغ نیز دوک می‌ریسد.

● **واتە:** مرۆڤی ئازا و بە غیرەت بۆ ئەنجامی ئیشی خۆی دانامێنێ و بە هەر ئامرازێ بۆی دەست بدات کاری رەوای خۆی پێش ئەبا.

**١١٠ـ تەق تەقەی کەوشان، شای دەورێشان.**

○ صدای کفشهای پا، شاه فقرا.

● بە یەکێکی فەقیر ئەوترێ کە چتێکی تازەی دەس کەوتبێ و فیزی پێوە بکا.

**١١١ـ تەقەی سەری تێ.**

○ معادل : چیزی سرش نمی‌شود.

● **واتە:** هیچی لێ حاڵی نەبووە.

**١١٢ـ تەک ماڵ یا قووبەگا بزن ئەورێتۆ!**

○ با خانۀ یعقوب بیگ موی بز می‌چیند.

● بە کەسێکی بەدەمار و دەعیە ئەوترێ.

**١١٣ـ تەک هەویرگیرا هەڵ ئەسێ و تەک شاترا ئەچێتۆ.**

○ با خمیر گیر از خواب بیدار می‌شود و با شاطر به خانه برمی‌گردد.

● **واتە:** زوو دێت و دێر ئەڕواتۆ.

**١١٤ـ تەماتە ماسی بگریت و قولت تەر نەوێ؟**

○ انتظار داری ماهی بگیری و پایت خیس نشود؟

● **واته:** هەموو کارێ زەحمەتی تایبەتی خۆی پێویستە.

**١١٥ـ تەمەڵ، راوێژکەرە!**

○ تنبل، رأی و اندیشه صادر می‌کند!

● **واته:** کاری مرۆڤی لەش قورس، هەر راوێژ کردنە و خۆی عەمەلی نی‌یە.

**١١٦ـ تەمەڵ، غەیب زانە!**

○ تنبل، غیب می‌داند!

● بە تەوس ئەوترێ بە مرۆڤی تەمەڵی زۆر وێژی بێ کردار.

**١١٧ـ تەمەڵێ ئەونەی حەفتا وەزیر ئەزانێ!**

○ یک آدم تنبل به اندازهٔ هفتاد وزیر می‌داند!

● **واته:** مرۆڤی تەمەڵ هەر ئەتوانێ ئەوەندەی چەن کەس بیر وڕا بدات، بەڵام عەمەلی نی‌یە.

**١١٨ـ تەنگی پێ هەڵچنیگە!**

○ او را تحت فشار قرار داده است.

● **واته:** زۆری بۆی هێناوە و دەست و پای لە عەرز بڕیوە.

**١١٩ـ تەنوور تاگەرمە نان ئەکا. (یا: نان ئەدا)**

○ تنور تا داغ است نان می‌دهد.

● **واته:** کار ئەبێ گەرماوگەرم بکرێ.

**١٢٠ـ تەور بە زەرب دەسەی دار ئەشکنێ.**

○ تبر با نیروی دسته‌اش چوب می‌شکند.

● **واته:** مرۆڤ بە یارمەتی کەس و کاری دڵسۆزی خۆی ئەتوانێ بە سەر کۆسپی ژیاندا زاڵ ببێ.

**١٢١ـ تەور دەسەی خوەی ناورێ.**

○ تَبَر دستهٔ خودش را نمی‌بُرَّد.

● مرۆڤ بۆ کەس و کاری نزیکی خۆی زەرەری گیانی نابێ.

**١٢٢ـ تەویر شەو، ئاوەنیای رۆژ.**

○ تدبیر شب، آبیاری روز.

● **واتە:** بەر لەئەوەی دەس بدەیتە کارێ، لەو بارەوە پرس و ڕات لەگەڵ ماڵ و منداڵ و دڵسۆزانی خۆتا بێ.

ئاوەنیا: بەو عەرزە ئەوترێ کە بۆ کشت و کاڵ ئاوی لێ بەسرابێ.

**١٢٣ـ تێغی ئیسە ئەونە ناورێ.**

○ تیغش حالا دیگر چندان نمی‌بُرَّد.

● **واتە:** ئەو کەسە ئیتر کارێکی لە دەس نایە.

**١٢٤ـ تێر ئاگای لە برسی نی‌یە.**

○ سیر از گرسنه خبر ندارد.

● **واتە:** دەوڵەمەن نازانێ هەژار چی ئەکێشێ.

**١٢٥ـ تیر ئەخات و کەوان ئەشارێتەو.**

○ تیر می‌اندازد و کمان را مخفی می‌کند.

● بە کەسێك ئەوترێ کە دەسێ بوەشێنێ و شوێن گومکێش بکا.

**١٢٦ـ تێرکوتایە برسی، وتی: هەرزانی هەی هەرزانی!**

○ آدم سیر کوبید به آدم گرسنه و گفت: ارزانی آی ارزانی.

● **واتە:** مرۆڤی بێ نیاز لە چاوی خۆیەوە بۆ هەژار و فەقیر ئەڕوانێ و ئەوانیش وەکوو خۆی بە تێر و بێ‌نیاز ئەزانێ.

**١٢٧ـ تێر،گوێز لە هەوانەی خوەی ئەژمێرێ.**

○ آدم سیر، گردو از کیسهٔ خودش می‌شمارد.

● **واتە:** تێر لە چاوی خۆیەوە بۆ هەموو کەس ئەڕوانێ.

**١٢٨ـ تێر لە برسی خەوەری نی‌یە.**

○ سیر از گرسنه خبر ندارد.

▣ وەکوو پەندی ژمارە (١٢۴)

**١٢٩ـ تیر لەکەوان دەرچێ، ناگەڕێتۆ.**

○ تیر از کمان بگذرد، برنمی‌گردد.

● **واتە:** قسەیەك لە دەم دەرچوو ناگەڕێتۆ. کەوا بوو بزانە چۆن قسە ئەکەی.

**١٣٠ـ تێر نەخواردن لە باوک مردن ناخوەشترە!**

○ سیر نشدن از پدرمردگی بدتر است!

● **واتە:** نیوە تێری دەردێکی گرانە.

**١٣١ـ تیکەی خوەش و رێگەی لاوەلا.**

○ لقمۀ خوش و راه ناهموار.

● **واتە:** ئەگەر خورد و خۆراکی خۆش بێ نالەباری رێگە قەیدی نی‌یە.

**١٣٢ـ تیکەی زل دەم ئەدرێت و قنگیش!**

○ لقمۀ بزرگ هم دهان را پاره می‌کند هم مقعد را!

● **واتە:** مرۆڤ نابێ زیادتر لە توانی خۆی دەعیە بکا.

**١٣٣ـ تیکەیەک بگرە پێت بخورگێ.**

○ لقمه‌ای بگیر که بتوانی آن را بخوری.

● لە ئەندازەی خۆت دەعیەت بێ.

# ج

## ١- جا ئەمجار بە خوەت بکەنە!

○ حالا دیگر بە خودت بخند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە گاڵتە بکا بە کەسێکی زانا و گەورەتر لە خۆی و لە ناکاو،هەڵەیەک لە خۆی روو بدا و ئەمجار وای پێ بڵێن.

**پیاوێکی پیر و زانا** لە مەجلیسێکا بوو، مناڵێکی تووش هەر دەمەلاسکێی ئەوی ئەکردۆ و پێی پێ ئەکەنی، پیرەمێردە کە هەر ئەیوت: باوکم دەس هەڵگرە، کەم پێ بکەنە؛مناڵە کە شێرگیر ببوو وە دەستی لێ هەڵ نەئەگرت؛لە ناکاو مناڵە کە ترێکی داوە و بێ دەنگ سەری داخست! پیاوەپیرە کە رووی تێ کرد و وتی: جا ئەمجار بە خوەت بکەنە!

## ٢- جارێک خەڵەتانمت، خوا بتگرێ؛ دوو جار خەڵەتانمت، خوا بمگرێ.

○ یک بار مرا فریب دادی، موآخذە باشی؛ بار دوم فریبم دادی، خودم موآخذە باشم.

● **واتە:** هەوەڵ جار فریووتم خوارد و تۆ تاوانبار بووی؛ بەڵام جاری دوهەم کە تۆم ناسی نە ئەشیا فریووتم بخواردبایە، کە وا بوو ئەم جار خۆم خەتابارم.

## ٣- جام وتی: بشکم وەلێ نەزرم!

○ کاسە گفت: بشکنم ولی بد نام نشوم.

● **واتە:** مردن لە رسوایی باشترە.

**٤ـ جا مەن بێرا و بێ‌پێوە!**

○ حالا من بیاور و پیمانه کن.

● **واتە:** ئەو بەڵێنە وا دام بە تۆ، هەمووی درۆ و گاڵتە بوو.

**ئەگێرنەوە** پیاوێ ئەچێتە سەر دار گوێزێك بۆ کەندنەوەی گوێز، لەو بانەوە کە زۆر بەرز ئەبێ، ترس هەڵی ئەگرێ و هاوار ئەکا لە خوا و ئێژێ: خواگیان لەم دارە بێ مزەرەت بچمە خوارۆ پەنج مەن گوێز لە رێگای تۆدا ئەکەم بە خێر وئەی بەخشم!کاری گوێز تەکاندنی تەواو ئەبێ و روو ئەکا لە خوارۆو دێتە نیوەی دارە کە و ئێژێ: خواگیان سێ‌مەن ئەکەم بە خێر! نەختێ تر دێتە خوارۆو ئێژێ: خواگیان دوو مەن! نزیکی عەرز ئەبێتۆ و ئێژێ: خواگیان مەنێ!هەر ئەونە پای ئەکەوێتە عەرز، بۆی دەرئەچێ و هاوار ئەکا: جا مەن بێرا و بێ‌پێوە! واتە: هیچ!

**٥ـ جامێ گۆشت لە هەزار شایەت باشترە!**

○ یک کاسه گوشت از هزار نفر شاهد بهتر است!

● **واتە:** قازی بە بەرتیل بسێنە و شایەت بۆ مەحکەمە مەبە.

**٦ـ جانماز ئەکێشێتە ئاوا!**

○ جا نماز آب می‌کشد!

● بە یەکێك ئەوترێ کە راس یا درۆ دەعیەی پاکی بکا.

**٧ـ جانماز بە پاپێچ ناوێ!**

○ جانماز تبدیل به پاپیچ نمی‌شود.

● **واتە:** چتی پاك کۆنەیشی هەر بە نرخەو نابێ بە چاوی سووکی پێیا بڕواندرێ.

**٨ـ جانمازی لە بان ئاوەو ئەگەرێ!**

○ جانمازش روی آب می‌چرخد.

● بە تەوس ئەوترێ بە یەکێکی نوێژ نەخوێن و بێ عیبادەت.

**٩ـ جفت بە بزن ناکرگێ.**

○ با بز نمی‌شود زمین را شخم زد.

● **واتە:** هەر کەسێ بۆ کارێ خەلق کراوە.

**١٠- جفتێ گای لە بێوڵەتیا ئەگەرێ!**

○ یک جفت گاوش در فقر و نداری کار می‌کند.

● بە یەکێکی بێکار و دەس‌تەنگ ئەوترێ.

**١١- جگەر ناوێ بە دگەر.**

○ جگر گوشه، «دیگری» نمی‌شود.

● **واتە:** مناڵ بۆ باوک و دایک هەر خۆشەویسە و بە بێگانە نابێ.

**١٢- جواو بۆغمە، سنانە!**

○ جواب خفه، درد است.

مثل: جواب خفه‌شو، زهر مار است.

● **واتە:** هەرچی بە هەر کەس بێژی، هەر ئەوەت پێ ئێژێتۆ. لە گەڵ خەڵکا چۆن بی، لە گەڵتا هەروا ئەبن.

**بۆغمە:** نەخۆشی دو شاخەیە (خوناق) واتە: وس، بێ‌دەنگ بە.

**سنان:** نەخۆشی ژانە زکە، بە تایبەت یەک سم ئەیگرێ واتە: دەرد.

**١٣- جواو دەوڵ کوت ئەشێ سورناژەن بیاتۆ! (یا: جواو دەوڵچی سورناچی ئەیداتۆ.)**

○ جواب دُهُل‌زن را باید سُرنازن بدهد.

● **واتە:** هەر کەس زوانی تایبەتی خۆی پێویستە کە لە گەڵیا قسە بکرێ.

**١۴- جواو سڵام، عەلەیکە.**

○ جواب سلام، علیک است.

● **واتە:** جوابی چاکە، چاکەیە.

**١۵- جۆ ئەکەنە بەر سەگ و پێشە ئەخەنە بەر کەر!**

○ جلو سگ جو می‌ریزند و به الاغ استخوان می‌دهند.

● **واتە:** هەموو کارێ پێچەوانە بووەتۆ.

**١٦ـ جوجەڵە ئەکوژێت و هێلکە هەڵتێرێ!**

○ جوجه را می‌کشد و تخم را جوجه می‌کند!

● بەکەسێ ئەوترێ کە دووکاری دژی‌یەك بکا؛ لە لایەکەوە هەوڵ و تەقالا بدات و لە لایەکی ترەوە دەس رەنجی خۆی بە با بدا.

**١٧ـ جوجەڵە لە ئاخر پایزا ئەژمێرن.**

○ جوجه را آخر پاییز می‌شمارند.

● **واتە:** چۆنیەتی هەرکارێ لە ئەنجاما مەعلووم ئەبێ.

**١٨ـ جورە ماڵ کەر بێ، لە هەر لایەکا بێ، گر و گاڵ کەرە.**

○ چکاوک اگر بخواهد خانه بسازد، در هر کجا باشد، گال و بوغ می‌کند.

● **واتە:** کەسێ مەیلی کارکردنی ببێ، لە هەر لایەکا بێ، ئەتوانێ کاری خۆی بکا.

**١٩ـ جۆگەلە دەریا لێڵ ناکا.**

○ جویبار دریا را گِل آلود نمی‌کند.

● **واتە:** مرۆڤی گەورە بە قسەی خەڵکی بێ نرخ، سووك نابێ.

▣ وەکوو ئەڵێن: دەریابە دەم سەگ، گلاو نابێ.

**٢٠ـ جومعەی پێ تەواو ناوێ.**

○ نماز جمعه به وجود او به حد نصاب نمی‌رسد.

● بە یەکێکی بێ نرخ ئەوترێ کە لە سەری حیساب نەکرێ.

نوێژی جومعە بە (٤٠) کەس ئەخوێندرێ؛ بەڵام ئەوکەسەی کـە ئـەم مـەسیلەیە بـۆ ئەوترێ، لە سەر حیسابی عاقڵ و باڵغ نی‌یەکە بشێ (٣٩) کەسی جومعەی پێ بکرێ بە (٤٠) کەس.

**٢١ـ جوان دانیشێ بە لای پیرەوە، وەسە زیندانی بە زەنجیرەوە.**

○ شخص جوان اگر در کنار شخص پیر بنشیند، مانند یک نفر زندانی است که به زنجیر بسته شده باشد.

● **واتە:** ژن و شوو ئەبێ تەمەنیان پێکەوە نزیك بێ؛ نەك یەکێکیان پیر بێت و ئەوی

تریان گەنج وگەنجە کە بە دیتنی پیرە کە هەموو کات هەناسەی بێ هاومالی هەڵبکێشێ.

**٢٢- جوان مەنێرە بۆ ژن خواستن، پیریش مەنێرە بۆ ئەسپ سەندن.**

○ شخص جوان را برای خواستگاری مفرست، شخص پیر را نیز برای خریدن اسب مفرست.

▣ بڕوانە بۆ پیتی «پ»: پیر مەنێرە بۆ ئەسپ سەندن و ...

**٢٣- جەحانم لە بەر درگاکەیشیا بگەریتەو هەر خاسە.**

○ جهنّم اگراز جلو دروازەاش نیز برگردی باز هم خوب است.

● **واتە:** زەرەر لە هەر کوێوە بەری بگری هەر خێرە.

**٢٤- جەژن تەک هاومالا خوەشە.**

○ انجام مراسم عید باهمسایه لذّت‌بخش است.

● **واتە:** لە خۆشیدا بیرت بە لای دۆس و هاوماڵەوە بێ.

**٢٥- جەنگ زەرگەرانەس!**

○ جنگ زرگری است.

● **واتە:** شەڕی مەسەڵەحەتی‌یە.

**٢٦- جەنگ شمشێر ئەیکا و سەوا پوولْ.**

○ شمشیر وسیلهٔ جنگ است و پول وسیلهٔ معامله.

● **واتە:** هەرکارێ ئامرازی تایبەتی خۆی هەیە.

**٢٧- جەنگ لەسەرکەمی سفرەس!**

○ جنگ بر سر کم بودن محتوای سفره است.

● **واتە:** شەڕ و ئاژاوەی ناو ماڵ، لە سەرکەم وکورتی دەخڵ و دان و دەس تەنگی‌یە.

**٢٨- جەنگ لە کۆنە قینەو هەڵئەسێ.**

○ جنگ از کینهٔ قبلی ناشی می‌شود.

● **واتە:** بەعزە شەڕێ، بناغەی قینەوەری کۆنی هەیە.

**٢٩- جێگەی پام بێتەو، جێگەی سەریشم ئەکەمەو.**

○ جای پایم باز شود، جای سرم را نیز باز خواهم کرد.

● **واتە:** هەر ئەونە دەسم گیر ببێ، بە ئاکامی ئەگەیەنم.

**٣٠- جێگەی سەرم بێتەو جێگەی پام ئەکەمەو.**

○ جای سرم باز شود، جای پایم را نیز باز خواهم کرد.

▣ بڕوانە بۆ مەسیلەی ژمارە (٢٩)

**٣١- جێگەی شاوازان، کۆرکۆرە وازان!**

○ بەجای شهبازها، زَغَن‌بە پروازدرآمدەاست!

● **واتە:** ئەو ئینسانە بە نرخ و لێهاتووانە رۆیشتن و کەسانی بێ نرخ و ناوە جاخ، لە جێگەی ئەوانا دانیشتوون.

**٣٢- جێگەی کوتەک خوەش ئەویتەو، جێگەی قسە رەش ئەوێتەو!**

○ اثر کتک بهبود می‌یابد، اثر سخن تلخ سیاه می‌شود!

● **واتە:** قسەی تاڵ قەد لە بیر ناچێتۆ.

**٣٣- جێگەی کولۆ، کوچکە.**

○ جای کلوخ، سنگ است.

▣ بڕوانە بۆ پەندی ژمارە (١٢)

**٣٤- جێگەی مشت پالەقەس!**

○ جای مشت، لگد است.

▣ بڕوا بۆ پەندی ژمارە (١٢)

**٣٥- جێگەی نێزەکە بکەرەو، جا بیدزە.**

○ جای پنهان کردن نیزە را ترتیب بدە، سپس آن را سرقت کن.

● **واتە:** هەر کارێ ئەکەی دوا بینی بکە.

**۳۶ـ جێی حەیاو عیسمەت، ماڵ باجی زەمزەم!**

○ محل حیا و عصمت، خانۀ باجی زمزم!

● تەوسە بۆ ماڵێکی بێ عیسمەت و بێ‌حەیا.

١- **چاروای ترن کوریلەی فیرن ئەخاتەوا**

○ مادیان گوزو، کُرّهٔ لاغر و ریخن می‌زاید.

● **واتە:** له مرۆڤی ناوەجاخ و بێ‌نرخ، چتی وەکوو خۆی ئەکەوێتۆ.

٢- **چارەی بێچارە تامڵ و سەورە!**

○ چارهٔ شخص بیچاره تأمل و صبر است.

● **واتە:** یەکێ کە دەسەڵاتی نەبێ، ئەبێ هەر سەبر بکا.

٣- **چارەی نەخوەر، بخوەرە!**

○ چارهٔ نخور، بخور است.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا ماڵی خۆی ناخوا، ئەبێ ماڵی بخۆن.

٤- **چاو برسی، ئاورووی نی‌یە.**

○ چشم گرسنه، آبرو ندارد.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا هەر چاوی ها بە دەستی مەردمۆ، سووکە.

٥- **چاو بە چاو ئەکەفێ و روو بە روو.**

○ چشم، چشم را می‌بیند و چهره با چهره روبرو می‌شود.

● **واتە:** مرۆڤ ئەگەر کارێکی کرد یان لە پاشە سەری کەسێ قسەیەکی کرد، ئەبێ بیری دوا رۆژی بێ.

٦ـ **چاو بێشێ دەری تێرن.**

○ چشمی را که درد بکند درمی‌آورند.

● **واتە:** نزیکترین کەسی مرۆڤیش ئەگەر خراپ و ترۆ بێ، ئەبێ تەرکی کەی.

٧ـ **چاو تێر، ئاو رووداره.**

○ چشم سیر، آبرودار است.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا چاوی بە ماڵی مەردمۆ نی‌یە، رێز و ئیحتیرامی هەیە.

٨ـ **چاو چووە خەو، قنگ ئەچێتە پاوشایی!**

○ چشم که به خواب برود، مقعد به سلطنت می‌رسد!

● **واتە:** کاتێ کە مرۆڤ خەوت ئیتر ئیختیاری لێ‌ئەبڕێ و چی ئەقەومێ دەسەڵاتی نی‌یە!

٩ـ **چاوکەوگ، تۆشەی پێغەمەر دزە!**

○ چشم آبی، آذوقۀ پیغمبر را می‌دزد!

● **واتە:** مرۆڤی چاوشین جێگەی مەترسی‌یە!

١٠ـ **چاو لە چاو شەرم ئەکات.**

○ چشم از چشم حیا می‌کند.

● **واتە:** حەیای مرۆڤ لە چاویایەتی.

١١ـ **چاوی بەرپای خوەی ناوینێ!**

○ چشمش جلو پای خود را نمی‌بیند.

● **واتە:** زۆر بە دەمارە!

١٢ـ **چاوی چەرمگەو بووگە!**

○ چشمش سفید شده است.

● **واتە:** خەریکە ئەمرێ. یان: مردووە.

١٣ـ **چاوێ دوژمن خوەی نەناسێ، کوێربێ.**

○ چشمی که دشمن خود را نشناسد، کور باد.

● **واته:** مرۆڤ ئەبێ دۆس و دوژمنی خۆی بناسێ.

**١٤ـ چاوی رەشتکە بە خوەڵە کەوگ ؛ شوو ئەکا بە کەرە کەوگ!**

○ چشمش را با خاکستر سرمە زدە است ؛ با الاغ کبود ازدواج می‌کند!

● **واته:** خۆی رازاندوەتەوە و بڕوای وایە کارێکی بە نرخ و گرینگ ئەکا، بەڵام وا نی‌یە.

**١٥ـ چاوی رەشتکە بە کڵە دوو ؛ شوو ئەکا بە سڵپە گوو!**

○ چشمش را با دودینە سرمە زدە است ؛ باتفالە گُه ازدواج می‌کند.

▣ بڕوانە بۆ مەسیلەی ژمارە (١٤)

**١٦ـ چاوی لە زکی گەورەترە!**

○ چشمش از شکمش بزرگتر است.

● **واته:** چاوی تەماعی بڕیوەتە دنیا و بە هیچ چتێ تێر ناخوا.

**١٧ـ چرا شەوقی بۆ بن خوەی نی‌یە.**

○ چراغ نورش برای زیر پای خودش نیست.

● **واته:** خێری ئەو کەسە بە خۆی و نزیکانی خۆی ناگا، بەڵام بۆ دوورتر خێری هەیە.

**١٨ـ چرایەک بۆ ماڵ رەواس ؛ بۆ مزگت حەرامە.**

○ چراغی که به خانه رواست ؛ به مسجد حرام است.

● **واته:** ئەوەی کە مرۆڤ خۆی پێویستیەتی، حەرامە بدرێ بە یە کێکی تر.

**١٩ـ چ کەرە کە بوەیتە لای بارە کە، چ بارە کە بوەیتە لای کەرە کە!**

○ چه الاغ را ببری نزد بار، چه بار را ببری پیش الاغ!

● **واته:** ئەو دوو کارە لە هەر حاڵەت دا هەر یە کێکە.

**٢٠ـ چل نان و قەرزیان نەوتگە!**

○ چهل نان و قرض را نگفته‌اند.

● **واتە:** قەرزیش ئەندازەی هەیە.

**٢١- چما هیلکەی تەلامان بۆ ئەکات!**

○ گویی تخم طلا برایمان می‌گذارد.

● بە تەوس ئەوترێ بە کەسێ کە زۆر دەعیەی ببێ بەلام عەمەلی نەبێ.

**٢٢- چوار پای قورسی‌یەک و رەشە ولاخێک و دێزەیەک.**

○ چهار پایۀ یک کرسی و گاوی و یک خمره.

● بە مالێکی هەژار ئەوترێ کە بار بکەن و لە مالی دنیا چتێکی بەرچاویان نەبێ.

**٢٣- چوار چت لە چوار چت تێر ناون: ژن لە شووی خـاس، زەوی لە بـاران، ئینسان لە زانین، چاو لە رووی یاران.**

○ چهار چیز از چهار چیز سیر نمی‌شوند:

زن از شوهر خوب، زمین از باران، انسان از یادگرفتن، چشم از دیدن دوستان.

**٢٤- چوار دیواری و ئیختیاری!**

○ چهار دیواری و اختیاری!

● **واتە:** هەر کەس لە مالی خۆیا سەربەستە.

**٢٥- چۆپێ بەرە دەس سەگۆ ئەیکێشێ بۆ لای دۆلەی نانەکە!**

○ چوپی به دست سگ بده آن را به طرف دولچۀ نان می‌کشد.

● بە کەسانێکی بێ نرخ و پووچەل ئەوترێ کە هەر دەرفەتێکیان بۆ برەخسێ، بۆ لای خۆیانی ئەکێشن و مافی مەردمیان بە لاوە گرینگ نی‌یە.

**٢٦- چۆلەکە! هازت کامە تا بازت کام بێ؟**

○ ای گنجشک! نیرویت کدام است تا پروازت چگونه باشد؟

● بە کەسێ ئەوترێ کە چتێکی لە دەس نەیە و بەلێنی درۆ بدات.

**٢٧- چووم بۆ دێی «نەران»، ساقەکانیان بە کۆڵ کەر ئەگەران!**

○ رفتم به آبادی «نران» سالم‌هایشان رابردوش الاغ حرکت می‌دادند.

● بە جێگایەک ئەوترێ کە هەموویان نەخۆش بن و ساقیان تیا نەبێ.
نەڕان: گوندێکە لە نزیکی شاری سنەدا.

**٢٨ـ چۆن حەریر ئەدرگێ بە پینەی گۆنیا؟**
○ چطور حریر برای پینهٔ گونی به کار می‌رود؟
● **واتە:** چتی بە نرخ نابێ بە هۆی چتێکی بێ نموودەوە، بێ نرخ بکرێ.

**٢٩ـ چۆنەر بە تەنکی.**
○ چغندر جای تُنُک می‌خواهد.
● **واتە:** گەشە کردن، جێگە و رێگەی بەربڵاوی ئەوێ.

**٣٠ـ چۆنەر تەک کەسێکا بووەشنە، ئەو بە چۆنەر با لە تۆ و تویش بە چۆنەر بەی لە ئەو.**
○ چغندر با کسی کاشت کن، که او با چغندر تو را بزند و تو نیز با چغندر او را بزنی.
● **واتە:** لە گەڵ کەسێکا هەڵسە و دانیشە، کە هاوکووفی خۆت بێ، نە زیاتر نە کەمتر.

**٣١ـ چۆنەر لانسار بنی قەوی‌یە، پاخەسوو ئەترێ خەتای وەویە!**
○ چغندر کشتزار رو به جهت غربی ریشه‌ای قوی دارد. ینگه (زن همراه عروس) تیز می‌دهد و تقصیر آن را به گردن عروس می‌اندازد.
● **واتە:** ئەو کارانە هیچ پێوەندی‌یەکیان بە یەکەوە نی‌یە. ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ؟

**٣٢ـ چوو بۆ ریش سمێڵیشی نیا بانی!**
○ رفت برای ریش، سبیلش را نیز از دست داد.
● بە یەکێک ئەوترێ کە بچێ بۆ کارێک یان بۆ چتێ، بەڵام نە تەنیا بەو چتە نەگا، بەڵکو چتێکیش لە دەس بدا.
کۆسە چوو بۆ ریش ...

**٣٣ـ چوویتە شارکوێران، دەس بگرە بە چاوتۆ!**
○ اگر به شهر کوران رفتی، دست بگذار روی چشمت.

معادل: خواهی نشوی رسوا، هم رنگ جماعت شو.

● **واتە:** خۆت لەگەڵ چۆنیەتی کۆمەڵدا یەک بخە تا بتوانی لە ناویانا ژیان بەسەربەری.

**٣٤ـ چەپڵە بە دەسێ ناتەقێ.**

○ با یک دست نمی‌شود کف زد.

● **واتە:** ئەو کارە بە یەک کەس جێ بەجێ نابێ.

**٣٥ـ چەپەرە شرێ چ پێوە بدرێ چ پێوە نەدرێ!**

○ چپر پارە چە بستە شود چە بستە نشود!

چَپَر: دَر یا دیواری کە از چوب یا علف و گیاە ساختە می‌شود.

● **واتە:** ئەو چتە، بوون و نەبوونی وەکوو یەک وایە.

**٣٦ـ چەپەڵ بە چەپەڵا ئەروێ.**

○ کثیف با کثیف دفع می‌شود.

● چتی پیس بە چتی پیسی وەکوو خۆی لائەچێ.

**٣٧ـ چەرخ لە چەمەری دەرتێرم! (یا: چەرخ لە چەمەرگەران. یا: چەرخي لە چەمەر دەر تێرن.)**

○ چرخ از چنبرش در می‌آورم.

● **واتە:** زۆر باش سەرکوتی ئەکەم و جەزای ئەدەم.

**٣٨ـ چەقۆ دروس ئەکا و دەسەی لێ ناخا.**

○ چاقوی بی دستە درست می‌کند.

● **واتە:** زۆر درۆزن و فێڵە بازە.

**٣٩ـ چەقۆ دەسەی خوەی ناورێ.**

○ چاقو دستۀ خودش را نمی‌بُرّد.

● **واتە:** مرۆڤ، زەرەری گیانی بۆکەس و کاری نزیکی خۆی نابێ.

**٤٠ـ چەقۆگەییە ئێسقان!**

○ چاقو به استخوان رسید.

● **واته:** له عاستی ئەو کەسە یان ئەو کارە، تەحەممول و تاقەت تەواو بووە.

**٤١ـ چەقۆی لێ بەی، خوێنی دەرنایەت!**

○ به او چاقو بزنی، خونش بیرون نمی‌زند.

● به کەسێ ئەوترێ که له بیستنی خەبەرێ یا رووداوێ زۆر تووڕە و ناڕەحەت بێ.

**٤٢ـ چەقەڵ بێڵێ، گورگ و مەڕ بە یەکەو ئاو ئەخوەنەو!**

○ شغال بگذارد، گرگ و گوسفند با هم آب می‌خورند.

● **واته:** کوڵە فتوور بێڵێ، دوژمنایەتی نامێنێ.

**٤٣ـ چەقەڵ، خوەی لێ بووە بە تاوس!**

○ شغال، خودش را طاووس تصوّر کرده است.

● به کەسێ ئەوترێ که بایی هەوا بووبێ.

**٤٤ـ چەقەڵ گان ئەکاو رێوی ئەتۆرێ!**

○ شغال جفتگیری می‌کند و روباه قهر می‌نماید.

● به یەکێك ئەوترێ له چتێ بتۆرێ که پێوەندی به ئەو نەبێ.

**٤٥ـ چەم بێ چەقەڵ ناوێ!**

○ رودخانه بدون شغال امکان ندارد.

● **واته:** بێستان بێ سەرەخەر نابێ ؛ له هەموو لایەك کەسێکێ سەره خەر هەر هەیە.

**٤٦ـ چەن ساڵە خادەمە نازانێ شەو جومعە کامە!**

○ چند سال است خادم مسجد است شب جمعه را تشخیص نمی‌دهد.

● **واته:** ئەو کەسە دوای عومرێ، هێشتا لە کاری خۆیا شارەزا نی‌یە!

**٤٧ـ چەن مێرد مردوو بخوازە، تەڵاقدراوێ مەخوازە.**

○ با زن چند شوهر مرده ازدواج کن، ولی با زنی که طلاقش داده‌اند ازدواج مکن.

● **واتە:** ژنی تەڵاق دراو ئەبێ عەیبێکی بیێ و خواستنی ئەو جێگەی مەترسی یە، بەڵام ژنی چەن مێرد مردوو ئەو عەیبەی نی یە.

**٤٨- چەنێ لارمە، قارسەقولێ بارمە!**

○ چقدر بختم برگشته، بار من سرگین است.

● **واتە:** ئەونە بەختە کەم شەڕە، رەفیقی رێگەم بووە بە چتێکی هیچ و پووچ.

**٤٩- چێشت خوەش بە بۆیا دیارە.**

○ غذای خوشمزه از بویش پیدا است.

● **واتە:** کاری چاك یان چتی باش خۆی هاوار ئەکا.

**٥٠- چێشت مجەورە!**

○ غذای خدمتگزار مسجد است.

● **واتە:** ئەو چتە لە هەموو بابەتێکی تێدایە. یان: چۆنیەتی وەزعەکە شێواوە و کێ بە کێ یە.

**چێشتی مجێور،** بریتی بووە لە ئەو چێشتەکە لە رۆژانی جەژنی قوربان یان رەمەزاندا لە لایەن ماڵانی گوندەکانۆ ئەچوو بۆ مزگەوت بۆ پیاوانی ماڵان کە لە مزگەوت بوون؛ دیارە ئەو چێشتانە هەرکام لە جۆرێ بوون و ئەماوە بۆ خزمەتکاری مزگەوت کە پێیان ئەوت مجەور یامجێور، ئەویش هەمووی تێکەڵ ئەکرد و ئەیبردۆ بۆ ماڵی خۆی و ماڵ و منالی بۆ چەن رۆژ لەو چێشتە هەمە چەشن و هەموو بابەتەیان ئەخوارد کە چەن تام و چەن بۆی لێ ئەهات! جا بەو چێشتە رەنگاو رەنگەیان ئەوت: چێشتی مجێور!

**٥١- چێشتێ ئاشپەزی دوان بێ،یا سۆڵە یا بێ خواس.**

○ غذائی که آشپز آن دونفرباشد، یا شور است یا بی نمک.

● **واتە:** کارێکی تایبەتی کە ئەبێ یەك کەس ئەنجامی بدا ئەگەر کەسێکی تریش دەستی تێ ببات خراپ ئەبێ.

**٥٢- چێو خوا سەدای نی یە.**

○ چوب خدا صدا ندارد.

● **واته:** دەسی تۆڵەی حەق لە تاوانبار، بێ دەنگ ها لەکارا.

**٥٣ـ چێو لە تاریکی ئەکوتێ!**

○ در تاریکی دارد چوب می‌زند.

● **واته:** بێ حیساب قسە ئەکاو ئاگای لەکارەکە نی‌یە.

**٥٤ـ چێو مەکەرەکونا زەردەواڵا یان؛ چوکڵە مەکەرەکونە هەنگەژاڵا.**

○ چوب در سوراخ زنبور فرو مکن.

● **واته:** بە دەستی خۆت بۆ خۆت ئاژاوە چاخ مەکە.

**٥٥ـ چێو هەڵگرە، سەگ دز دیارە.**

○ چوب بلند کن، سگ دزد معلوم می‌شود.

● **واته:** خەیانەتکار ترسەنۆکە و زوو ئەناسرێ.

عەرەب ئەڵێ: الخائِنُ خائِفٌ

# ح

۱- **حاجی مرد و وشتر وێڵ بوو.**

○ حاجی مرد و شتر ول شد.

● به یه‌کێک ئه‌وترێ که دوای مه‌رگی ئه‌و، ماڵ و منالّی وێڵ ببن.

۲- **حاشا له ماڵ گه‌ن، که‌س نایه‌ژێ به چه‌ن؟**

○ حاشا از جنس بد، زیرا کسی نمی‌گوید بهای آن چند است؟

● **واته:** هیچ که‌س له چتی گه‌ن لانا کاته‌وه.

۳- **حاشا له‌و خوێنه شه‌و هاته سه‌ریا!**

○ حاشا از خونی که شب بر آن گذشت!

● **واته:** تۆڵه له زاڵم ئه‌بێ گه‌رماوگه‌رم بسێنرێته‌وه.

۴- **حاشا له‌و قافڵه وا سه‌رقافڵه‌ی (یا: وا پێشاهه‌نگی) که‌ره!**

○ حاشا از آن قافله‌ای که سر قافله‌اش الاغ باشد.

● **واته:** ئه‌و جه‌ماعه‌ته‌ی وا رێبه‌ریان مرۆڤی نه‌زان بێ، ئاکامێکی تاریکیان هه‌یه.

۵- **حاڵی بوون له پڵاو خواردن خوه‌شتره.**

○ چیز فهمیدن از پلو خوردن لذّت بخش تر است.

● **واته:** تێ گه‌یشتن بۆ مرۆڤ له هه‌موو چتێ باشتره.

۶ـ **حمام بە ترگەرم ناویٚ.**

○ حمام با گوز گرم نمی‌شود.

● **واتە:** ئەو کارە بە قسەی بیٚ‌مایە ئەنجام نابیٚ.

۷ـ **حوکم حاکمە و مەرگ مفاجات!**

○ حکم حاکم است و مرگ آنی!

● **واتە:** ئەم ئەمرە ئەبیٚ زۆر زوو جیٚ‌بەجیٚ بیٚت.

۸ـ **حوکمی تونە!**

○ حکمش تند است!

● **واتە:** زاڵمە و قسەی زۆر ئەکا.

۹ـ **حول حولی مەزەو، لیٚ مەکە تەڵەو.**

○ از هُرهُری مذهب چیزی طلب مکن.

● بە مرۆڤی بیٚ سوبات ئەوتریٚ کە جیٚگەی متمانە نی‌یە.

۱۰ـ **حەبیب کوڵک و موو ئیمشەو ژن تیٚری، هەرکە دەعوەتە کەلە قەن بیٚری.**

○ حبیب پشمالو امشب عروسی می‌کند، هر کس دعوت شده است کلّه قند بیاورد.

● بە یەکیٚکی چرووک و رژد ئەوتریٚ کە تەنانەت زەماوەنیش بۆ ئەوەی بکا کە خەڵکی دیاری بۆ بیٚنن.

۱۱ـ **حەتا مرۆچەیش سیٚوەری هەس.**

○ حتی مورچە نیز سایە دارد.

● **واتە:** هەموو چتیٚ بۆ خۆی قەدرو حورمەتیٚکی هەیە.

۱۲ـ **حەساو بە دینار، بەخشش بە خەروار.**

○ حساب بە دینار، بخشش بە خروار.

● **واتە:** موعامەلە لەگەڵ بەخشین و ئیحسانا لە یەک جیاوازن.

۱۳ـ **حەساو حەساوە، کاکە برادەر.**

○ حساب جساب است و کاکا برادر.

● **واته:** موعامەلە لە جێگەی خۆیا و برایەتیش بە جێگەی خۆی.

**١۴- حەش ئەگەر بێژن هیلکەی کرد، کردگیە!**

○ اگر بگویند خرس تخم گذاشت، لابد گذاشته است!

● ئەم مەسیلە مانای تەوسی هەیە بۆ مرۆڤی لامل واتە: ئەگەر بێژن ئەوکەسە کارێکی دوور لە باوەڕی کردووە، جێگەی سەرسووڕی نی‌یە!

**١۵- حەفت حەفت ئەکوژێ!**

○ هفت هفت می‌کشد!

● بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر هاشە و هووشە بکا وگەرەکی بێ سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆی راکێشێ!

**١۶- حەفت نانی خوارد بە پیازۆ، حەفتیشی خوارد بە نازۆ، دایکی بمرێ گوڵەوشان ناشتای نەخوارد بردیشیان!**

○ هفت نان با پیاز خورد، هفت نان دیگر با ناز خورد، مادرش بمیرد «گل افشان» ناشتایی نخورد و او را بردند.

● ئەم مەسیلە قسەی ئەو دایکەیە واکچە زۆر خۆرەکەی دابوو بە شوو، ئەو رۆژە وا خستیانە رێ بۆ ماڵی زاوا، دایکی بەر لە رێکەوتنی کچە، چواردە نانی پێداوە خواردویەتی و دوای رێکەوتنی، بۆی ئەگری و تێژێ: گوڵەوشانی دایك مردوو، بەرقلیانی نە خوارد و بردیان بۆ ماڵی زاوا!

**١٧- حەفتی بمرێ لە باوان، کلەی ناورگێ لە چاوان!**

○ اگر هفت نفر نیز از خانوادهٔ پدریش بمیرد، باز هم سرمهٔ چشمان او کم رنگ نمی‌شود.

● بە ئافرەتێك ئەوترێ کە زۆر بێ‌شەرم و شکۆ بێ و هیچ کاتێ لە هەڵە و هەرزەیی و ئارایشی خۆی نە کەوێ.

**١٨- حەق بزن کۆڵ بە سەر شاخدارۆ نامێنێ.**

○ انتقام بز بی شاخ از شاخدار گرفته می‌شود.

● **واته:** مرۆڤ نابێ لە ناکامی کردەوەی خۆی غافڵ بێ.

**١٩ـ حەق تایی لە دۆڵاوی ئەسێنێ!**

○ انتقام اهل (طا) را از اهل (دولاب) می‌گیرد!

● بە یەکێک ئەوترێ کە بە کەسێ کە حەقی ئەوی خواردووە نەوێرێ و لە کەسێکی تر کە بێ تاوانە، تۆڵە بسێنێ.

▣ **وەکوو:** بە شێر ناوێرێ و بە کۆپان رەپەڕەپیە. «تا» و «دۆڵاو» دوو گوندن لە بەینی سنە و کامیارانا.

**٢٠ـ حەق کفن دەربێ، مردگ گۆر بە گۆر!**

○ بهای کفن تأمین بشود، مرده گور به گور.

● بە کەسێ ئەوترێ کە سوودی خۆی لە هەرچی چتە بۆی گرینگ‌تر بێ.

**٢١ـ حەق کۆنە ئەوێ، بەڵام نافەوتێ.**

○ حق کهنه می‌شود، ولی از بین نمی‌رود.

● **واتە:** گرتنی حەق دێر و زووی هەیە بەڵام ناسووتێ.

**٢٢ـ حەق مردگ‌شۆر بگەیەت، مردگ گۆر بە گۆر!**

○ مزد مرده شور برسد، مرده گور به گور!

▣ وەکوو مەسیلەی ژمارە (٢٠)

**٢٣ـ حەق نادرگێ، ئەسێنگێ.**

○ حق دادنی نیست، گرفتنی است.

● **واتە:** حەق ئەبێ بە زۆر لە زاڵمی بسێنی ئەینە بە رجا نات‌داتێ.

**٢٤ـ حەقە، بۆیە رەقە!**

○ حق است، به این علت، سخت است.

● **واتە:** قسەی حەق، بە گوێی ئەوانەی وا ناتوانن بی‌بیسن، سەختە.

عەرەب ئەڵێ: الحقُّ مُرٌّ واتە: حەق تاڵە.

**٢٥ـ حەقە حەقدارە، بەشە بەشدارە.**

○ اگر حق است فلانی حق دارد، و اگر تقسیم سهم است، سهم دارد.

● **واتە:** حەق ئەبێ بە حەق‌دار بگا و بەش بە بەش دار.

**٢٦ـ حەکایەت دایک عیسا مەکە.**

○ داستان مادر عیسی نقل مکن.

● **واتە:** بەو قسە ئەوەندە پەرە مدە و درێژدڕی مە کە.

**٢٧ـ حەڵاڵ بنی باریکە و سەری قەوی ؛ حەرام بنی قەوییە و سەری باریک.**

○ بیخ حلال باریک است و سر آن قوی ؛ بیخ حرام قوی است وسرآن باریک.

● **واتە:** حەڵاڵ ئەگەرچی کەمیش بێ هەر پیت و بەرکەتی هەیە، بەڵام حەرام ئەگەر زۆریش بێ، پیتی نی‌یە.

**٢٨ـ حەنجەرە دەرنەچێ لە پەنجەرە.**

○ صدای حنجره از پنجره خارج نشود.

● **واتە:** دەنگی ناو ماڵ نابێ بچێتە دەرەوە.

**٢٩ـ حەیا تکێکە، داکەفت، جەمەو ناوێ.**

○ حیا یک قطره است، اگر ریخت دیگر جمع نمی‌شود.

● **واتە:** مرۆڤ ئەبێ هەموو کاتێ لە بیری راگرتنی ئابڕوی خۆیا بێ.

**٣٠ـ حەیا تۆریا و باری کرد، بێ حەیایی شاری گرت!**

○ حیا قهر کرد و کوچ نمود، بی حیایی شهر را فرا گرفت!

● سکاڵایە لە بێ حەیایی.

**٣١ـ حەیادار لە حەیای خوەی ئەترسێ ؛ بێ حەیا ئێژێ لە من ئەترسێ!**

○ آبرومند از آبروی خود می‌ترسد ؛ بی آبرو می‌گوید از من می‌ترسد!

● **واتە:** ئینسانی بەشەرم و حەیائەبێ خۆی لە بێ‌حەیا لادا،ئەگەرچی بەترسنۆ کیشی بدەن لە قەڵەم.

**٣٢ـ حەیا ها لە چاوا.**

○ حیا در چشم است.

● **واتە:** چاو شەرم ئەیگرێ.

**٣٣ـ حیز بە خاڵۆ خۆ فێرە!**

○ هیزی کە فقط بر دائی خود مسلّط است.

● بە یەکێکی بێ‌غیرەت ئەوترێ کە بەکەسی غەریبە نەوێرێ و زۆری بە سەر خزم و کەسی خۆیا بشکێ.

**٣٤ـ حیزیش بە بەختە.**

○ هیزی هم بە شانس است.

● **واتە:** کاری خراپ بۆ هێندێ کەس ئەیگرێ.

**٣٥ـ حیزی و قەرزاری لە بیر ناچنەو.**

○ هیزی و بدهکاری فراموش نمی‌شوند.

● کاری هەڵە کە ببێ بە هۆی رسوایی، لە بیر ناچێتۆ.

# ■ خ

۱- **خاست‌کرد ئەسپت نەسەند؛ حەسەن لە دەستی ئەسەند!**

○ خوب کردی اسب نخریدی، زیرا حسن از چنگت درمی‌آورد.

● بە تەوس یان بە گاڵتە بە یە کێک ئەوترێ کە نەتوانێ لە مافی خۆی پارێزداری بکا.

۲- **خاسی کەرە خوەڵ وە سەرە!**

○ انسان نیکوکار، خاک بر سر است!

● **واتە:** جەزای پیاوەتی، ناپیاوی و قوڕ بە سەرییە.

۳- **خاکەنازە هەرگ، بە دەس مەردمەو سۆکە!**

○ بیل گِل، در دست دیگران سبک به نظر می‌رسد.

● **واتە:** کەسێ خۆی لە کارێکدا هیلاک نەبووبێ، ئەوکارە بە ئاسان دێتە بەرچاوی.

۴- **خالۆ، خالۆی منە و خەرج بە خان ئەدات!**

○ دائی، دائی من است و مالیات به خان می‌دهد.

● **واتە:** من حەقم بە سەر تۆوە هەیە نەک کەسێکی تر وا تۆ رووت تێ کردووە.

۵- **خالۆی کەپر سەوز!**

○ دائی کَپَر سبز!

● بە کەسێکی عەوداڵ و بێ‌جێگە و رێگە ئەوترێ کە قۆناخی خۆشی ژێر داران بێ.

٦ـ **خاڵۆی تەماکۆ فرۆش! ئەگەر قنگت نی‌یە بە جۆش، چیتە لە خاڵۆی تۆماتێز فرۆش؟**

○ خالوی تنباکو فروش! اگر کونت به جوش نیامده، چه کار داری به خالوی گوجه فرنگی فروش؟

● **واتە:** کەسێ قنگی بە کەڵ نەبێ، چی داوە لە خەڵکی؟

٧ـ **خاڵۆی دەسەوسان چ لە گەرمیان چ لە کێوسان.**

○ دائی لاعلاج چه قشلاق چه ییلاق.

● **واتە:** بۆ یەکێک وا بێ‌عیلاج بێ، گەرمیان و کوێستان بۆی فەرقی نی‌یە.

٨ـ **خانم لە ناو پەنج دەری، کتکە دی گۆشتە بەری، عاری هات ختەکەری!**

○ خانم در اتاق پنج دری بود، گربه را دید که گوشت را برد، عارش آمد گربه را دور کند.

● بە ژنێکی بە دەمار و خۆ بین ئەوترێ کە کاری بچووکی پێ عەیب بێ بیکا ئەگەرچی کاری ماڵی خۆیشی بێ.

٩ـ **خاوەن ماڵ دەسی هەڵگرت، دز ئەیوت: ئەیگەیەنمە حەقە جێگە!**

○ صاحب خانه دست برداشت، دزد می‌گفت موضوع را به نتیجه می‌رسانم.

● کاتێ ئەوترێ کە دز و درۆزن بە سەر ماڵ و کەرامەتی گەلێکدا زاڵ ببن و خۆیان بە بەشدار و تەنانەت بە خاوەن ماڵ بزانن و دەس هەڵگر نەبن.

١٠ـ **خراوی بە گش کەس، خاسی بە کەم کەس.**

○ بد بودن می‌تواند کار هر کس باشد ولی خوب بودن کار هر کسی نیست.

● **واتە:** هەرچی کەسە ئەتوانێ خراپە بکا، بەڵام چاکە کردن کاری هەموو کەس نی‌یە.

١١ـ **خڕو مڕ بێ و کۆڵەکەی پڕ بێ!**

○ جمع و جور باشد با کوله باری پر.

● **واتە:** ئەوەی جێگەی سەرنجە، دەستی پڕی ئەوە.

**١٢- خزمەت قالاو بکەی، چاوت دەرتێرێ.**

○ کلاغ را پرورش کنی، چشمت را در می آورد.

● **واتە:** جەزای خزمەت کردن بە مرۆڤی پێنەزان و ناوەجاخ، شەڕە.

**١٣- خزمەت قنگ کردن، خەڵاتی تسە!**

○ بە کون خدمت کردن، خلعتش چُس است!

▣ وەکوو پەندی ژمارە (١٢).

**١٤- خزمەت نەکردە یاخییە.**

○ خدمت نکردە یاغی است.

● **واتە:** لەوەی کە نەتمناسیبوو، داوای لێبووردنت لێ ئەکەم.

**١٥- خلیسکیان، جیرەی پەلەکارە!**

○ لغزیدن، جیرۀ شخص عجول است.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا لە کارا پەلە ئەکا، بە هەڵەدا ئەچێ و تێ ئەگلێ.

**١٦- خنجێر دەوان لە کێلانا ناوێسێ!**

○ خنجر بُرّندە (یا جوهردار) در غلاف باقی نمی‌ماند.

● **واتە:** مرۆڤی ئازا و بە جەرگ لە کاتی خۆیا ئازایەتی خۆی نیشان ئەدا.

**١٧- خوا با مەرگم، زاوا نەکا بەرگم.**

○ خدا مرگم بدهد ولی داماد برایم لباس تهیّه نکند.

● **واتە:** مرۆڤی بە غیرەت و بە کەرامەت تەنانەت بە مردنیشی ناڕواتە ژێر باری منەتی هیچ کەس.

**١٨- خوا بۆ دەعبای کوێر هێلانە ئەکا.**

○ خداوند برای جانور کور لانه می‌سازد.

● **واتە:** خوا بە مەخلوقی زوبری خۆی رەحمی زۆرترە.

**١٩- خوا بیبا، هێڵێکی بەسە.**

○ خدا بدهد، یک شخم کافی است.

● **واته:** خوا مەیلی بێ، بە بیانوویەکی بچووکیش بە عەبدی خۆی مەرحەمەت ئەکا.

**٢٠ـ خوا پا بە مار نەدات.**

○ خدا پا بە مار ندهد.

● **واته:** خوا نەکا، زاڵم هەلی بۆ بڕەخسێ!

**٢١ـ خوا تەختە تاش نی‌یە، تەختە رێک خەرە.**

○ خدا تختە تراش نیست، ولی تختەها را با هم جور می‌کند.

● بە دوو کەس ئەوترێ کە زۆر باش پێکەوە رێک هاتبێتن ؛وەکوو دوو هاوسەر کە خۆ و رەوشتیان وەکوو یەک بێ.

**٢٢ـ خوا، خوایی ئەکاو بەنە قێخایی!**

○ خدا، خدایی می‌کند و بندە کدخدائی!

● بە کەسێ ئەوترێ وا لە کاری ئافەرینش دا، دەخاڵەت ئەکا.

**٢٣ـ خوا دەرێ ئەگرێ و دەرێکیش ئەکاتەو.**

○ خدا دری را می‌بندد و دری دیگر را می‌گشاید.

خدا گر بە حکمت ببندد دری بــە رحـــمت گشــاید در دیگـری.

● **واته:** مرۆڤ بەردەوام لە تەنگانەدا نامێنێتۆ و نابێ لە رەحمی خوا نائومێد بێ.

**٢٤ـ خوا دێرگیرە و سەخت گیر.**

○ خدا دیر انتقام می‌گیرد ولی بە سختی انتقام می‌گیرد.

● **واته:** زاڵم ئەگەرچی دێریش بێ هەر بە جەزای زوڵمی خۆی ئەگا و نابێ لە ئاکامی زوڵمی خۆی غافڵ بێ.

**٢٥ـ خواردی تیکە وکردی فیکە.**

○ لقمە را خورد و شروع بە سوت زدن کرد.

● بە یەکێک ئەوترێ وا دوای تێر خواردن یان کەڵک وەرگرتن لە کەسێک، ئیتر بڕواو گوێی لە دوای خۆیەوە نەبێ.

**٢٦ـ خوا سەرما بە ئەنازەی بەرگ ئەدات.**

○ خدا سرما به تناسب لباس می‌دهد.

● **واتە:** لە هەر کەس بە ئەندازەی هێز و توانی ئەو، تەکلیف ئەکرێ.

**٢٧ـ خوا سەری داکڵاویش ئەدا.**

○ خدا که سر داد، کلاه هم می‌دهد.

● **واتە:** لە نەبوونی رزق و رۆزی مەترسە؛ خوا ئەیدات.

**٢٨ـ خوا عەقڵ بە منالْت با.**

○ خدا عقل به فرزندت بدهد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە قسەکردنا تێنەفکرێ و قسە فرە دات ؛ جاپێی ئێژن : خۆت لەدەس چوویت، خوا عەقڵ بە منالْت با.

**٢٩ـ خوا غەزەو بگرێ لە بزن، ئەچێ نان شوان ئەخوا.**

○ خدا اگر بز را مورد قهر قرار دهد،می‌رود نان چوپان رامی‌خورد.

● بە یەکێکی سپڵەوپێنەزان ئەوترێ کە ئەبێ بە جەزای پێنەزانین‌وخەیانەتی خۆی بگا.

**٣٠ـ خوا غەزو بگرێ لە مرۆچە، باڵی پێ ئەدا.**

○ اگر خدا مورچه را دچار قهر خود کند، به او بال می‌دهد.

● بەکینایە ئەوترێ بە کەسێ وا زیاتر لە ئەندازەی خۆی پا دابکێشێ و لە ئاکامدا تووشی زەرەر ببێ.

**٣١ـ خواکێف ئەوینێ و بەفری لێ ئەوارێنێ.**

○ خداکوه را می‌بیند و بر آن برف می‌باراند.

● **واتە:** لە هەر کەس بە پای هێز و توانای، تەکلیف ئەکرێ.

**٣٢ـ خوا لە سوڵتان مەحموو گەورەترە.**

○ خدا از سلطان محمود بزرگتر است.

● **واتە:** بە رەحمی خوا دڵ ببەسە، نەک بە بنیادەم.

۳۳- **خوا ماڵ ئەدات بە مووسایی و کێر بە نێرەکەر.**

○ خدا ثروت به یهودی می‌دهد و کیر به نرّه خر.

● سکاڵای کەسێکی دەس تەنگە لە بەختی خۆی.

۳۴- **خوا نانی بریگە و پیغەمەر دۆ!**

○ خدا نانش را قطع کرده و پیغمبر دوغش را!

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر هەژار و رووت و قووت بێ.

۳۵- **خوا نەکا کەسێ گولۆڵەی بکەفێتە لێژی.**

○ خدا نکند کسی گلولهٔ بختش به سرازیری بیفتد.

● **واتە:** کەسێ نەهاتی بێت، پشت لە سەر پشت گیرۆدەی کۆسپ ئەبێ.

۳۶- **خوانێ لە ماڵ خانەو دەرهات، توتەکۆڵەیەک، کەفتە شۆنی!**

○ یک سینی غذا از خانهٔ خان خارج شد، توله‌ای به دنبال آن راه افتاد.

● **واتە:** خان بەخشیویەتی، دەس و پا نایبەخشن!

۳۷- **خوا یار بێ، با دوژمن هەزار بێ.**

○ خدا یار باشد، بگذار دشمن هزار باشد.

● **واتە:** پشت بە خودا ببەسە و ترست لە دوژمن نەبێ.

۳۸- **خوایشی گەرەکە و خورمایش.**

○ هم خدا را می‌خواهد هم خرما را.

● **واتە:** دو چتی گەرە کە وا پێکەوە دەس‌نەدا.

۳۹- **خوای قولی، نیایە ملی.**

○ خدای قُلی، تیغ انتقام به گردنش نهاد.

● **واتە:** خوا تۆڵەی ئەو مەزڵوومەی لەو زاڵمە سەند.

۴۰- **خوای گەر دای لە بن مەر.**

○ خدای گر در گوسفند تأثیر کرد.

● **واتە:** دەسی تۆڵەی تەقدیر وا لە کارا.

**۴۱ـ خوایە شوکرم بەم بەشە، ئەمە ئاوکانی رەشە!**

○ خدایا شاکرم به این قسمت، این آب چشمۀ سیاه است.

● شوکری چتێکی بێ ئەرزش کە جێگەی نەبێ.

**۴۲ـ خۆ دایک کراس کەوگ نەمردگە!**

○ مادر پیراهن کبود که نمرده است.

● **واتە:** ئەمە نە یەکێکی تر!

**۴۳ـ خورمایش لە مەنەلی (یا:بەغا) فرەس.**

○ خرما در مندلی (یا: بغداد) نیز فراوان است.

● **واتە:** بە ئێمە چی، ئەو چتە وا ئێستا ئێمە پێویستمانە لە جێگایەکی‌تر زۆرە.

**۴۴ـ خوری خوەی ئەداتە نیمە رێسی و خوەی بۆ خەڵک تەشی ئەرێسێ.**

○ پشم خود را می‌دهد دیگران نصف ونصف برایش بریسند و خـودش بـرای مردم دوک ریسی می‌کند.

● بە کەسێ ئەوترێ کە پێی عەیب بێ کاری خۆی بکا، بەڵام کارکردن بۆ خەڵکی پێ عەیب نەبێ.

**۴۵ـ خۆ لای خۆ سۆکە.**

○ خودی نزد خودی بی‌ارزش است.

● **واتە:** قەوم و خوێش رێزی یەکتری ناگرن (بەڵام بێگانە پەرستن).

**۴۶ـ «خولە» بار ئەکاو «بلە»، کەپر ئەوەسێ!**

○ «خوله» کوچ می‌کند و «بله» کپر می‌سازد.

● **واتە:** هەر کەس، وا لە بیری ئیشی خۆیا و چاوی لە کەسانێکی‌ترەوە نی‌یە.

**۴۷ـ خولە ... بەش خوەی بری!**

○ «خوله» ... و سهم خود را از دست داد.

● **واتە:** بەو کارە ناپەسەندە واکردی، لە ماف بێبەش کرا.

**۴۸- خۆ ماس نی‌یه بەلای دەمتۆ دیار بێت.**

○ ماست نیست که بر کناره دهانت پیدا باشد.

● به یه کێک ئەوترێ کە کارێکی کردبێت و گەرەکی بێ حاشا بکا و بیشارێتۆ، بەڵام نەشاردرێتۆ.

**۴۹- خۆ نانم به سەر ساجۆ نەسووتیاگە!**

○ نانم که روی ساج نسوخته است.

● **واته:** پەلەم نی‌یە.

**۵۰- خۆ نەکردگ، خوا بۆکردگ.**

○ خود نکرده و خدا به او داده.

● به یه کێک ئەوترێ کە بێ ئەوەی خۆی هەوڵ بدا، بگەیە بە ماڵ و نیعمەتێکی زۆر.

**۵۱- خوەت پیادە و رزقت سوارا**

○ خودت پیاده و روزیت سوار!

● دۆعای شەڕە، واتە: بە رزق و رۆزی خۆت نەگەی. یا: رەخنەیە، واتە: تۆ ئەوەندە کوڵۆڵی هەرچی ئەکەی بە رزقی خۆت ناگەی.

**۵۲- خوەت دز و خوەت دلێر.**

○ خودت دزد و خودت دلیر.

● به یه کێک ئەوترێ کە خۆی هەڵەیەک بکا و بشپرسێ: کێ ئەو هەڵەیە کردووە؟

**۵۳- خوەت مەکوژە جەفتە.**

○ خودت را مکش جَفت است.

«جفت» مادەای است در گیاهان سبز، بخصوص در پوست بلوط با خـاصیّت استحکام بخشی به پوست مشک.

● **واته:** خۆت بەو کارەوە هیلاک مەکە، ئاکامی نی‌یە.

جەفت، جەوت: ماددەیەکە، لە نێو گیای سەوزا، بە تایبەت لە پێسی دار بەڕووا زۆر هەیە؛ لە تەنشتی پێسی ماڵات دا، ماددەیەکی سەخت پێک دێنێ و بۆ ئەو تایبەتمەندییە

کە هەیەتی، لە دەواخیدا بەکار ئەهێنرێ و لەگوندە کانا بە جەوتی بەڕوو، مەشکە خۆش ئەکەن.

جەوت دروس بووە لە سێینەی: کەربون، هیدرۆژن، ئوکسیژن.

**٥٤- خوەت نەکەی خوا با پێت!**

○ خودت تلاشی نکنی و خدا به تو بدهد.

● بەکەسێ ئەوترێ کە بێ عەزیەت بە ماڵ و دەوڵەتێکی زۆر بگا.

**٥٥- خوەرەتاو لچ بان دەوامی نی‌یە.**

○ آفتاب لب بام دوام ندارد.

● **واتە:** عومرێ کە تێپەڕ بوو، ئیتر ئومێدی بەردەوامبوونی لێ ناکرێ.

**٥٦- خۆزەگەم بە قومەشکەن وا دەنگی ناژنەوێت!**

○ خوشا به حال چاه‌کن که صدایش را نمی‌شنود.

● **واتە:** دەنگی ئەوەندە ناخۆشە تا لێی دوور بی چاکترە.

**٥٧- خۆەزگەم بەو باخە ورچی لێ ئەتۆرێ!**

○ خوشا به حال آن باغی که خرس از آن قهر می‌کند.

● بە یەکێکی شەڕ ئەوترێ کە هەرچی زیاتر دووری بگرێ، خەڵکی لە شەڕ و شۆڕی رزگارتربن.

**٥٨- خوەشە ئاگر خوەشە دوو، برا خاسە نە وەک شوو.**

○ آتش و دنبه هر دو خوب‌اند، برادر خوب است امّا نه مانند شوهر.

● قسەی ئافرەتێکە وا لە شووەکەی تۆراوە و ها بە لای براکەیەوە و ئێستا لە تۆرانی خۆی پەشیمانە و بیری رابوردوو ئەکاتۆ.

**٥٩- خوەی ئەیبرێت و خوەیشی ئەیدورێت!**

○ خودش قیچی می‌کندو خودش هم می‌دوزد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە خۆی قسەیەک بکات و خۆیشی لە سەری شایەتی بدات.

**٦٠ـ خوەی ریشی نی‌یە بەکۆسە ئەکەنێ!**

○ خودش ریش ندارد به کوسه (بی‌ریش) می‌خندد.

● بەکەسێ ئەوترێ کە خۆی عەیبێکی بیێ و لەو بارەوە لەکەسانی‌تر رەخنە بگرێ.

**پیاوێ بوو،** لووتی نەبوو، بە جێگەی لووت، دوو کونە لووتی مابوو، منگە منگیش قسەی ئەکرد، بە هەرکەس ئەگەیشت، ئەیوت: تف نەو نووتە! یانێ: تف لەو لووتە!

**٦١ـ خۆی شیری هەتا پیری.**

○ خوی شیرخوارگی تا عهد پیری.

● **واتە:** خولق و خۆیەك لە منالّیدا فێری منالّ بکرێ، تاکاتی پیری هەر لەگەلّیدایە.

**٦٢ـ خوێنی بۆگەرۆلّی خاسە!**

○ خونش برای دوای گری به درد می‌خورد.

● بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ.

**٦٣ـ خوێنی کردە کاسە.**

○ خونش را در کاسه ریخت.

● **واتە:** زۆر قسەی ناشیرینی پێ کرد. یا: بوو بە سەبەبی لە بەین چوونی.

**٦٤ـ خۆیەک فێر بی بە شیری تەرک ناوێ بە پیری.**

○ خلق و خویی که در بچگی بیاموزی، در بزرگسالی ترک نمی‌شود.

● **واتە:** ئەوەی کە لە منالّیدا مرۆڤ فێری ئەبێ، لە پیریدا بۆی تەرك نابێ.

**٦٥ـ خەتاکار ها لە لای یارۆ بێ‌تاوان پای ها بە دارۆ!**

○ گناهکار نزد معشوق نشسته است و بی گناه پایش از چوبه‌ی دار آویزان است.

▣ بڕوانە بۆ پیتی «ت»: تاوان بار هالە لای یارۆ...

**٦٦ـ خەتای من چییە بەختەکەم شەرە، کۆچم ئاوێتەی کۆچی سەگ وەرە.**

○ من چه تقصیری دارم‌که‌بختم برگشته و باروکوچ من بـا کـوچ عـوعو سگ درآمیخته است.

● **واتە:** لە بەختی شەڕ، تووشم بووە بە تووشی گرۆیەکی بێ حەیا و دەمەزەن و قەرەچناخ.

٦٧ـ **خەت خوار، هالە بن سەرگای پیرا.**

○ خط پایین، زیر سر گاو پیر است.

● **واتە:** چۆنیەتی ئەوکارە، هالە ژێر سەری ئەوکەسە پیرەدا.

٦٨ـ **خەتە سوورە لە خوەم دوورە.**

○ خط سرخ، این رویداد از من دوراست.

● **واتە:** من لەم کارە خراپە بە دوورم.

٦٩ـ **خەتەنە سوننەتە نەک لە بنا!**

○ ختنه سُنّت است نه از بیخ.

● **واتە:** هەرچی کارە، ئەندازەی خۆی هەیە.

٧٠ـ **خەس بێ و تراو بێ، هەر نان تەرکا.**

○ غلیظ باشد یا رقیق، فقط نان را تر کند.

● **واتە:** ئێمە پێویستمان بە پێخۆرە، هەرچی و هەر چۆن بێ، قەیدی نییە.

٧١ـ **خەس و تراوی چێشت مشتێکە!**

○ غلیظ یا رقیق شدن آش یک مشت آب تفاوت دارد.

● **واتە:** خاس و خراپی ئەوکارە پێوەندی بە تێبینییەکی بچووکەوەیە.

٧٢ـ **خەسوو ئەترێ، تەخسیر وەوییە!**

○ مادر شوهر می‌گوزد، عروس مقصّر است!

● بە خەسوویەک ئەوترێ وا هەرچی هەڵە و لاری خۆیەتی، بیخاتە پای بووکەکەی.

٧٣ـ **خەسوو بە وەوی ئێژێ: ئارد ئەتەقنێ، قنگ ئەلەقنێ!**

○ مادر شوهر به عروس می‌گوید: آرد غربال می‌کند، باسن تکان می‌دهد.

● بە خەسەوویەک ئەوترێ کە بڕوبەهانەی هیچ و پووچ لە بووک بگرێ.

**۷۴ـ خەسوو لە جفتێ گا خاسترە.**

○ مادر شوهر از یک جفت گاو بهتر است.

● **واتە:** خەسوو بۆ زاوا زۆر دڵسۆزە و خێری لە جووتێ گا بۆ ئەو زیاترە.

**۷۵ـ خەڵاتەکەی خان ئەحمەو خانە!**

○ خلعت خان احمد خان است.

● بە خەڵاتێ ئەوترێ کە خاوەنەکەی‌لە سەری پەشیمان ببێتۆ.

**ئێژن خان ئەحمەد خان،** دەسێ لیباسی خۆی دابوو بە نۆکەرەکەی، کاتێ نۆکەر لیباسی کردە بەری، زۆر پێی ئەکەوت و لە بەریا رێك و پێك و جوان بوو. خان کە ئەمەی دی، پەشیمانۆ بوو، لیباسەکەی لێ سەندۆ و خۆی کردیە بەری!

**۷۶ـ خەڵک سەگی لێ ئەوەرێ و من پشیلە!**

○ دیگران مورد حملە سگ قرار می‌گیرند و من مورد حملهٔ گربە.

● **واتە:** من نەگبەت رووی تێ کردووم!

**۷۷ـ خەلە فرۆش هەواڵ من ئەپرسێ.**

○ گندم فروش سُراغ «من» را می‌گیرد.

● **واتە:** هەرکەس وا لە بیری ئامرازی کاری خۆیا.

**۷۸ـ خەنە فرە بێت،گونیشی تێ ئەنن.**

○ حنا زیاد باشد، بەآلت هم می‌مالند.

● **واتە:** چت کە زۆر بوو، بێ نرخ ئەبێ.

**۷۹ـ خەو شەو، شەرمەساری رۆژە.**

○ خواب شب، شرمساری روز را بە دنبال دارد.

● لە جێگایەکدا ئەوترێ کە شەو مەترسی تاڵان‌کردنی ماڵەکەت لە بەینا بێ و پێویست بکا بەو شەوە خۆت و ماڵەکەت دەرباز کەیت ؛ بەڵام بێ خەیاڵ بخەویت و ماڵەکەت تاڵان بکەن. جا سبەینێ بۆ ئەو هەڵە، بەر تانە و تەشەری خەڵك بکەوی و شەرمەزار ببی.

**٨٠ــ خەوەر بوەن بۆ میران، نۆکەر نۆکەری ئەگیران! (یا: کارەکەرکارەکەری ئەگیران)**

○ خبر بدهید به امیران، نوکر برای خود نوکر اجیر می‌کرد.

● بەنۆکەرێک ئەوترێ والە نۆکەری عاری بێت و ئیشی نۆکەری‌یەکەی خۆی بەکرێ بدا بە یەکێکی تر بۆی بکا.

**٨١ــ خەیاڵ پڵاوە!**

○ خیال پلو است.

● **واتە:** خەیاڵێکی دوور و درێژە و دەس نایگاتێ.

**٨٢ــ خێر بۆ خوێش نەک بۆ دەروێش!**

○ سود برای قوم و خویش نه برای بیگانه.

● **واتە:** ئەوەی بۆ قەوم و کەسی موحتاجت پێویستە، بەکەسێکی غەریبە ناشێ.

**٨٣ــ خێرم پێ ناکەیت کەشکۆڵم مەشکنە!**

○ به من احسان نمی‌کنی، کشکولم را نیز مشکن.

● **واتە:** ئەگەر پیاوەتیت لێ‌نایە، ناپیاویش دەر حەقم مەکە.

**٨٤ــ خێر و بێرەکەی بۆ ناریێ و تر و تسەکەی بۆ شاریێ!**

○ سود آن برای «ناری» و بو و گند آن برای «شاری».

● **واتە:** خێر و سوودی ئەوکەسە یا ئەو چتە یەکێکی‌تر بیبات و شەڕ و بۆگەنی بۆ کەسێکی تر بێت.

**٨٥ــ خێری نی‌یە و شەری وەک سەگ ئەوەریێ!**

○ سودی ندارد و زیانش چون سگ عوعو می‌کند.

● بە یەکێکی بێ خێر بەڵام شەڕ دروس‌کەر ئەوترێ.

**٨٦ــ خێڵ بار ئەکاو پیرەژن کەلار ئەوەسێ!**

○ قبیله دارد کوچ می‌کند و پیره‌زن مشغول درست کردن کلار است.

● **واتە:** هەر کەس وا لە بیری کاری خۆیا.

«کەلار» یان «کەلارە»: دەفرێکە لە شیاکە درووسی ئەکەن بۆ وردە تەپاڵە.

**۸۷ـ خێڵە خوار و خێڵە ژوور، گێسکە قوت و جاجمە سوور.**

○ قبیله چه به ییلاق برود یا به قشلاق، او فقط یک بزغالهٔ قُد و یک جاجیم سرخ رنگ دارد.

● بە یەکێکی هەژار ئەوترێ کە بۆ هەر لایەك بار بکا، چتێکی زۆری بۆ بارکردن و رێ کەوتن نەبێت.

# ▣ د

۱ـ **داران له دورۆ سەریان سەوزە.**

○ درختها از دور سرشان سبز است.

● **واته:** رواڵەتی دورور جێگەی باوەڕ نی‌یە.

۲ـ **دارا و نەداراگرفتار خەمە ئەویشە وا هەسی هەر ئێژێ کەمە.**

○ دارا و ندار گرفتار غم اند و آن کسی هم که دارد می‌گوید باز هم کم است.

● **واته:** هەموو کەس لەم رۆژگارەدا هەر هەوڵی ماڵی دنیا ئەدەن و تێر نابن.

۳ـ **دار ئاوەسوو وە ... خەسوو، دار تەموورە وە ... خەزوورە.**

○ چوب آب خورده به ... مادر شوهر ( یا مادر زن)، چوبِ طنبور به ... پدر شوهر (یا پدر زن).

● ئەمە ئەبێ قسەی زاوا، یا بووکێ بووبێ کە رقیان بووە لە «خەسوو» و «خەزوورە».

۴ـ **دار ئێژێ: تەور ئەگەر دەسەکەی لە خوەم نەوایە، نەیەتوانی بم‌برێ.**

○ درخت می‌گوید: تبراگر دسته‌اش از جنس خودم نبود، نمی‌توانست مرا قطع کند.

● **واته:** تا قەوم و خوێش یارمەتی دوژمن نەدەن، دوژمن ناتوانێ زەفەر بە مرۆف بیا.

**۵ـ دار بەرزۆکە سەگ دز دیارە.**

○ چوب بلند کن سگ دزد معلوم می‌شود.

● **واتە:** خەیانەتکار زوو دەر ئەکەوێ.

**۶ـ دار بێ سەمەر بۆ برین خاسە.**

○ درخت بی ثمر برای قطع کردن خوب است.

● **واتە:** مرۆڤی بێ خێر یان چتی بێ کەڵک بێ قەدرە.

**۷ـ دار پوازی لە خوەی نەوێ ناقڵیشێ.**

○ چوب اگر بَرازی از جنس خود نداشته باشد نمی‌شکافد.بَراز(یا: گاز،بغاز)آن قطعه چوبی‌است که در شکاف چوبی دیگر جای می‌دهند تا چوب بزرگ بشکافد.

● **واتە:** قەوم و کەس پشتی مرۆڤ ئەشکێنن.

**۸ـ داردەس خەڵک مەوە.**

○ چوب دست مردم مباش.

● **واتە:** مەبە ئامرازی دەستی خەڵکی.

**۹ـ داردەیلەکانێ، هەرکەس کار خوەی خاس ئەزانێ!**

○ تاب بازی، هر کس کار خودش را خوب بلد است.

● **واتە:** هەموو کەس بەکار و باری خۆی شارەزایە.

**۱۰ـ دار کرمی لە خوەیە.**

○ کرم درخت از خود درخت است.

● **واتە:** عەیبی مرۆڤ لە خۆیەوە دائەکەوێ.

**۱۱ـ دار لە تەک تۆمە، دیوار بژنەوە.**

○ تیرچە به تو می‌گویم، دیوار بشنو.

● قسەیەک بۆ کەسێ بکرێ، بەڵام مەبەست یەکێکی تر بێ.

ئەمە کینایەی تەعریزی‌یە.

**۱۲ـ دار لە تەک لار بوو، سێوەری لارە.**

○ درخت که کج شد، سایهٔ آن نیز کج است.

● **واتە:** لە مرۆڤی بەد زات، چاوەڕێی راسی ودرووسی ناکرێ.

**۱۳ـ دار لە سەر ریشەی خوەی سەوز ئەوێ.**

○ درخت روی ریشهٔ خود می‌روید.

● **واتە:** مرۆڤ ئەکێشێتەوە سەر رەگەزی خۆی.

**۱۴ـ دارەکەی سەرکەل، پردەکەی قشلاخ!**

○ درخت بالای گردنه، پل قشلاق!

● **واتە:** ئەو دوو قسە یان ئەو دووکارە لە یەک دوورن و فرپیان بە سەر یەکەوە نی‌یە. لە کوێوە بۆ کۆی‌یە!

«داری سەرکەل»: تاقەدارێکە لە نیوەی رێگەی کێوی ئاویەری شاری سنە دا.

«پردی قشلاخ»: پردێکی کۆن و مێژینەیە لە بەرگوندی قشلاخ نزیکی شاری سنە.

ئەو دوو جێگە کەوتوونەتەخۆرنشین وخۆرهەلاتی شاری سنە ودوورن لەیەک

**۱۵ـ دار هەر دارە و پەلک هەر پەلکە، قەوم هەر قەومە و خەلک هەر خەلکە.**

○ درخت همان درخت است و سپیدار نیز سپیدار است، قوم و خویش همچنان قوم و خویش اند و بیگانه نیز بیگانه‌است.

● **واتە:** زات، ناگۆڕدرێ.

**۱۶ـ دار هەر دوو سەرگواوی (دار هەر دوو سەر پیس).**

○ چوب هر دو سر آلوده.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە دوو سەرەوە، بەد ناو بێ.

**۱۷ـ داشتم، داشتم حەساو نی‌یە ؛ دیرم، دیرم حەساوە.**

○ داشتم، داشتم بی فایده است ؛ دارم، دارم اعتبار دارد.

● **واتە:** قسە لەو چتە ئەبێ بکرێ کە ئێستا هەیە ؛ چونکە رابوردوو تازە ناگەڕێتەوە.

«داشتم»، «دیرم» دوو وشە لە زاراوەی کرماشانی‌یە.

**١٨ـ داگیه بەگەنەی دەماخیا.**

○ بوي آن به دماغش خورده است.

● **واته:** لەر خەبەرەی بیستورە.

**١٩ـ داکتە لە دارگەڵات پێوە نەهێشتگە.**

○ به درخت زده‌اي و برگي بر آن باقي نگذاشته‌اي.

● **واته:** هیچت نەهێشتورە.

**٢٠ـ داگیه لە حەفت ئاو قولی تەر نەوگە.**

○ به هفت آب زده و پايش خيس نشده است.

● بەکەسێکی ساختەچی و فێڵەباز ئەوترێ.

**٢١ـ داگیه لە سەری بای بەوەسیری، لەمە جوانی‌یەسی خوڵ بە سەر پیری!**

○ باد بواسير به سرش زده است، اين دورهٔ جواني اوست خاک بر سر دوران پيري وي!

● بە جوانێکی نەخۆش و لەڕ و لاواز ئەوترێ.

**٢٢ـ داڵکە! تا ئۆ مۆچیاری من کردی، سەدوسی مەگەس وەگون خەرە ئاڵەوە شماردم.**

○ مادرا در طول مدتي که تو مرا پند مي‌دادي، من صدوسي مگس بر روی بیضهٔ الاغ سیاه شمردم.

● بەکەسێکی گەوج و گێژ ئەوترێ کە گوێی لە ڕێنموونی کەسەوە نەبێ.

**٢٣ـ داماگی،سەرِ پیاگ ئەکاتە درگای نامەردا.**

○ احتياج، انسان را مجبور مي‌کند که به در خانهٔ نامرد روي بگذارد.

● **واته:** هەژاری و دەست تەنگی، مرۆڤ موحتاجی نامەرد ئەکا.

**٢٤ـ دانا بە ئیشارە، نادان بەکوتەک.**

○ دانا به اشاره، نادان به کتک.

● **واته:** مرۆڤی زانا بە ئاماژەیەک تێ‌ئەگا، بەڵام نەزان ئەبێ بە زۆر تێی گەیەنی.

**٢٥- دانا بە درکە، کەر بە نەقیزە.**

○ دانا بە اشارە، نادان بە کتک.

● **واتە:** زانا بە ئیشارە و نەزان بە کوتەک.

**٢٦- دانگێ روو لە شەش دانگ ملّک خاسترە!**

○ یک دانگ روداری از شش دانگ ملک بهتر است!

● بە یەکێکی بێحەیا و روودار ئەوترێ کە بێ ئەوەی بیر لە ئابروو بکاتەوە، بۆ هەر کارێك سەری پێەوە نێ.

**٢٧- دانوولەیان بە یەکەو ناکولّێ.**

○ نخودشان با هم در یک دیگ نمی‌جوشد.

● **واتە:** ناکەونەیەك، قسەیان یەك ناگرێ.

**٢٨- دانە برێشکە ئەخوات و بە ساون رەقی دەس ئەشۆرێ!**

○ گندم بو دادە می‌خورد و با صابون مخصوص دست می‌شوید.

● **واتە:** دەماری بەرزە و فیز قۆزە.

خواردنی دانە برێشکە، دەست چەور ناکاکە پێویستی بە سابوون بێ.

وەکوو ئەوەی لەفارسیدا ئێژن : پز عالی، جیب خالی!

**٢٩- دانەمان بە یەکەو ناکولّێت!**

○ دانۀ ما با هم نمی‌جوشد.

◘ بڕوانە بۆ ژمارە (٢٧)

**٣٠- دانەیەکیان پێ نەئەدا، داوای دوانی ئەکرد!**

○ یک دانە بە او نمی‌دادند، او دو تا می‌خواست.

● بە یەکێکی بێ شەرم و تەماعکار ئەوترێ.

**٣١- داوا بوو، داواکوژیاوە؛ کەچەڵ بۆ دار ئەخولیاوە!**

○ نزاع بود، نزاع پایان یافت؛ کچل بە دنبال چوب می‌گشت!

● بە یەکێکی گێج و کەم عەقڵ ئەوترێ کە دوای کەسانی تر لە ئاکامی‌کارێ

سەر دەربێنێ.

۳۲ـ **داوا لە سەر تەنگی سجافە.**

○ دعوا بر سر تنگی طراز است.

● **واتە:** شەڕ و شۆڕیان لە بەر دەست تەنگی‌یە.

سجاف: پەراوێز

۳۳ـ **دایک بوینە و کەنیشک بخوازە.**

○ مادر را ببین و با دخترش ازدواج کن.

● **واتە:** رەنگ و روالّەت و خولق و خۆی کچ لە ئاکامدا ئەکێشێتەوە سەر دایکی، کە وا بوو دایک ئاوێنەی دوا رۆژی کچە.

۳۴ـ **دایک دز شەوێ سینە ئەخوات و شەوێ سینە ئەکوتێ!**

○ مادر شخص دزد یک شب سینهٔ مرغ می‌خورد و یک شب بـر سینهٔ خـود می‌کوبد.

● **واتە:** ئاکامی دزی و دەس پیسی، مەرگە. دایکـی دز شـەوێ لە بـەرهەمی دزی کوڕەکەی سێنگی مامر ئەخوا و شەوێکیش لە ئاکامداکە کوڕەکەی ئەگیردرێ و ئەی کوژن، سێنگی بۆ ئەکوتێ.

۳۵ـ **دایک کراس کەوگ نەمردگە!**

○ مادر پیراهن کبود نمرده است.

● **واتە:** ئەمە نە، یەکێکی تر.

۳۶ـ **دایک وە قوروان دەس و کەوچکی، دانێک لە کاسەو دوان لە زکی!**

○ مادر فدای دست و قـاشقش، یک قـاشق در کـاسه مـی‌ریزد و دو قـاشق می‌خورد.

● بە کچێکی تازە کار و چلّێس ئەوترێ کە هەر لە بیری زکی خۆیا بێت.

۳۷ـ **دایکی شل پێچاگیەسەو.**

○ مادرش او را شُل پیچیده است.

● بە یەکێکی شل و ول ئەوترێ.

**٣٨- دایە بوینە و دوختەر بخوازە.**

○ مادر را ببین و با دخترش ازدواج کن.

▣ بڕوانە بۆ مەسیلەی ژمارە (٣٣)

**٣٩- دایە نەمەندەن، باوە نەباسا، بۆ خوەت بگەرە، قەڵەندەر ئاسا.**

○ مادر مرده است و پدر نیز بحثی نمی‌کند، تو نیز قلندر آسا هر جا می‌خواهی برو.

● بە کچ یا کوڕێ ئەوترێ کە دایکی مردبێ و باوکیشی لێی نەپرسێ و ئەویش بە سەربەستی و بێ ئەوەی کەسێ ڕێگەی لێ بگرێ، بەم لاو بەو لادا بەڕەڵا بێ.

**٤٠- درک ئەکێڵی، درک تێتە ڕێگەت.**

○ خار می‌کاری، خار در راهت می‌روید.

● **واتە:** خراپە بکەی، خراپە ئەبینی.

**٤١- درک هەنگور ناگرێ.**

○ خار، انگور به بار نمی‌آورد.

● **واتە:** کاری خراپ، ئاکامی چاکی لێ وەر ناگیردرێ.

**٤٢- درکێ لە دەسم دەر نەیەری، پووشێ لە چاوت دەر نایەرم.**

○ خاری از دستم بیرون نیاوری، خاشاکی از چشمت بیرون نمی‌آورم.

● **واتە:** تا دەستی هاوکاری بۆ لای من رانە کێشی دەستت بۆ لا راناکێشم.

**٤٣- درگای خوەت بوەسەو سەگ هاوساماڵ بە دز مەکە.**

○ در خانه خودت را ببند و سگ همسایه را به دزدی متّهم مکن.

● **واتە:** تێبینی کاری خۆت بکە و کەس تاوان بار مە کە.

**٤٤- درگای شار ئەوەسگێ، درگای دەم مەردم ناوەسگێ!**

○ دروازهٔ شهر را می‌شود بست، دَرِ دهان مردم را نمی‌شود بست.

● **واته:** مرۆڤ نابێ هەڵەیەکی وا بکات، کە ناوی خراپەی بکەوێتە سەر زمانی مەردم.

**۴۵ـ دەرگای کەس مەتەقنە، تا درگات نەرەقنن!**

○ در خانه مردم را مکوب، تا در خانه‌ات را نکوبند.

انگشت مکن رنجه به در کوفتن کس    تا کس نکند رنجه به در کوفتنت مشت

● **واته:** بە مەردوم خەیانەت مەکە، تا خەیانەتت پێ نەکەن.

**۴۶ـ درۆزن بە درۆزن ئێژێ: رووت رەش!**

○ دروغگو به دروغگو می‌گوید: رویت سیاه!

▣ **وەکوو:** قالاو بەقالاو ئێژێ: روو رەش

● بە یەکێک ئەوترێ، خۆی عەیبێکی ببێ و لەکەسانی تر بۆ ئەو عەیبە، رەخنە بگرێ.

**۴۷ـ درۆزن تەنیا دەفعەیەک ناشتا ئەکا! یا، درۆزن جارێک ناشتا ئەکا.**

○ دروغگو تنها یک بار ناشتائی می‌خورد.

● **واته:** کەسێ کە درۆ ئەکا، خەڵکی هەر جارێ باوەڕی پێ ئەکەن.

**۴۸ـ درۆزن کەم حافیزەس!**

○ دروغگو کم حافظه است.

● **واته:** درۆزن، زوو لە بیری ئەچێتۆ کە چی وتووە و بەوسەبەوە دوو قسەی ئەو یەک ناگرن.

**۴۹ـ درۆ شیرینە، بەری تاڵە!**

○ دروغ شیرین است ولی میوهٔ آن تلخ است.

● **واته:** درۆ بۆ ماوەیەکی کورت خۆش دیمەنە، بەڵام ئاکامێکی تاڵی هەیە.

**۵۰ـ درۆکراهە نی‌یە لە پایا.**

○ دروغ کرایه ندارد.

● **واته:** درۆ کردن دەست مایەی ناوێ. بە کەسێک ئەوترێ کە بێ حیساب درۆ بکا.

**۵۱ـ درۆ،گوێرەکە نی‌یە بکەفێتە دوات و بقۆرنێ.**

○ دروغ، گوساله نیست که دنبالت راه بیفتد و صدا کند.

● به یه کێک ئەوترێ که درۆ بکات و حاشای لێ بکا.

**٥٢ـ درۆ نه فەرزه و نه سوننەت.**

○ دروغ نه فرض است و نه سنّت.

● **واته:** درۆ وەختێ ئەوەنده بێ نرخه ئەبێ بۆ چی بکرێ؟

**٥٣ـ درۆ هێشتا له دەم دەر نەهاتگه، لۆقه ئەکا!**

○ دروغ هنوز از دهان خارج نشده است، می‌لنگد.

● **واته:** قسەی درۆ هەر له هەوەڵی قسه کردنەوه نیشانه کانی دیاره که چەندی تەق و لەقه.

**٥٤ـ درێژ درە!**

○ یاوه گو است.

● **واته:** زۆر وێژه.

**٥٥ـ درێژی خوەت ئەوینی، پانی خەڵکیش بوینه!**

○ درازای خودت را می‌بینی، پهنای مردم را نیز ببین.

● **واته:** هەر چاوت به خۆت و خێری خۆتەوه نەبێ، مافی خەڵکیشت له بەر چاو بێ.

**٥٦ـ دز ئازا بێ، تاریکه شەو فرەس.**

○ دزد زیرک باشد، شب تاریک فراوان است.

● **واته:** بۆ مرۆڤی چالاک و لێ هاتوو وەختی ئیش کردن زۆره.

**٥٧ـ دز ئەونەیه ستەمه کەلەوەر رەش کا.**

○ مشکل دزد تا لحظه‌ای است که سایه فرا برسد.

● **واتـه:** دز ماتڵی تاریک بوونی هەوایه، دوای ئەوه ترسی نامێنێ و دەستی خـۆی ئەوەشێنێ.

**٥٨ـ دز بدوێنه، هەر باس پەینجەت بۆ ئەکا.**

○ دزد را وادار به حرف زدن بکن، از نردبان برایت سخن می‌گوید.

● **واتە:** هەر کەس لە چتێ قسە ئەکات کە پێویستیەتی یان خۆی خـۆشی لێ دێ. دزیش پەینجەی بۆ دزی گەرەکە و دڵی وا بەلایەوە.

**٥٩ـ دز بۆ بازار ئاڵۆز ئەگەرێ.**

○ دزد دنبال بازار آشفته می‌گردد.

● **واتە:** کەسێ کە خراپەکار و دەس پیس بێ، لە شلۆغی و قەرەباڵغی زۆرتر کەڵک وەرئەگرێ.

**٦٠ـ دز بە ئاشکرا بێت، فرە ئەوات!**

○ دزد آشکارا بیاید، زیاد می‌برد. **معادل:**« چو دزدی با چراغ آید گزیده‌تر برد کالا»

● **واتە:** دزی ئاشکرا بێشکە، چونکە ئەو کەسە بە دز نازانن و ئەویش لێی ئەکەوێ و ئەوەی نەخت و باشە ئەیبا.

**٦١ـ دز بە ڕێگەیەکا ئەروێت و ماڵ دزیاگ بە هەزار ڕێگا.**

○ دزد از یک راه می‌رود و دزد زده از هزار راه.

● **واتە:** ڕێگەی دز مەعلومە بەڵام ماڵ دزراو شکی بۆ هەزار کەس ئەڕواو نازانێ چی بکا؟

**٦٢ـ دز بە و بە ئینساف بە.**

○ دزد باش و با انصاف باش.

● **واتە:** لە ناپیاویشا، جێگەی پیاوەتی هەر هەیە.

**٦٣ـ دز تاریکە شەو ناگیرگێت.**

○ دزدی که در شب تاریک دستبرد می‌زند، دستگیر نمی‌شود.

● **واتە:** کەسێ کە زۆر بە نهێنی خەیانەت ئەکا، ناناسرێت.

**٦٤ـ دز خۆماڵی ناگیرگێ.**

○ دزد خودی دستگیر نمی‌شود!

● **واتە:** خەیانەتکاری خۆیی دێر ئەناسرێ.

**٦٥ـ دز، دز ئەناسێ.**

○ دزد، دزد را می‌شناسد.

● **واتە:** هەر کەس، هاوکاری خۆی باش ئەناسێ.

**٦٦ـ دز دووکراسی هەس، دانێکی ها لە بەر خوەیا و ئەویاکەیشی ها لە بەر تەواو دنیا.**

○ دزد دو پیراهن دارد، یک پیراهن در تن خود اوست و یک پیراهن در تن همه مردم.

● **واتـە:** دز لە بیری خۆیا ماڵی هەموو کەس بە ماڵی خۆی ئەزانێ، چونکە پێی وایە رۆژێ‌لەرۆژان ئەتوانێ بیدزێ.

**٦٧ـ دز لە ژمارە ناپرسێ.**

○ دزد به شمارش جنسی که می‌دزد توجّه ندارد.

● **واتە:** بۆ دز، چەن و چۆنی ماڵی دزیەتی، فەرقی نی‌یە.

**٦٨ـ دز لە سێوەر خوەیشی ئەترسێ.**

○ دزد از سایهٔ خودش نیز بیم دارد.

● **واتە:** مرۆڤی نادرووس و ناپاک لە هەموو چـتێ ئـەترسێ تـەنانەت لە سـێبەری خۆیشی.

**عەرەب ئەڵێ:** الخائنُ خائفٌ.

**٦٩ـ دز مەیل دزی بێت، تاریکە شەو فرەس.**

○ دزد آرزوی دزدی داشته باشد، شب تاریک زیاد است.

● **واتە:** کەسێ گەرەکی بێ کارێ بکا، وەخت زۆرە.

**٧٠ـ دز ناشی کایەن ئەبرێ.**

○ دزد ناشی به کاهدان می‌زند.

● **واتە:** کەسێک لە کارێکدا ناشارەزا بـێ و دەسـی پـێ بکـات، کـەلەوەر ئـەخاتە ئەو کارەوە.

**۷۱ـ دز نەگرفتە سوڵتانە!**

○ دزد نگرفته سلطان است.

● **واتە:** کەسێ هەڵەیەکی کردبێ و پێی نەزانن خۆی بە بەختەوەر ئەزانێ!

**۷۲ـ دز نەوەرە!**

○ دزد او را نمی‌برد.

● بە ئافرەتێکی ناشیرین ئەوترێ.

**۷۳ـ دز و ساحێو ماڵ دەس بەن بە دەس یەکۆ، گا لە رۆچنۆ هەڵئەکێشن.**

○ دزد و صاحب خانه اگر با هم توافق کنند، گاو را از روزنۂ بام بالا می‌کشند.

● **واتە:** ئەو زیانەی کە دوژمن ئەیدا لە مرۆڤ، ئەگەر دەسی خەیانەتی خۆیی تێدا بێ قورس ترە.

**۷۴ـ دز یەکێکە و شک هەزار.**

○ دزد یکنفر است و شک هزار.

● **واتە:** مرۆڤی ماڵ دزراو، لە هەموو کەس بەشکە.

**۷۵ـ دگەر، ناوێ بە جگەر.**

○ بیگانه، خودی نمی‌شود.

● **واتە:** مناڵی خەڵك نابێ بە جگەرگۆشەی خۆت.

**۷۶ـ دڵ ئایەنەی دڵە.**

○ دل آینۂ دل است.

● **واتە:** دڵی مرۆڤ خەبەر ئەداکە کەسانی تر چەندە ئەویان گەرەکە.

**عەرەب ئەڵێ:** القلبُ مِرآةُ القلب

**۷۷ـ دڵ بە درۆ ناسوتێ.**

○ دل به دروغ نمی‌سوزد.

● **واتە:** خۆشەویستی و دڵ سووتاندن ناتوانێ درۆ بێ.

**۷۸- دڵ خۆ سفرە نی‌یە بە لای گش کەسێکەو بیکەیتەو. یا: دڵ خۆ سفرە نی‌یە بۆ گش کەس هەڵی رژنی.**

○ درون آدمی که سفره نیست تابخواهی نزد هر کس آن را پهن کنی.

● **واتە:** ناکرێ دەرد و رازی خۆت بە لای هەموو کەسێکەوە بێژی.

**۷۹- دڵ کەس رێش مەکە، رێشت کرد بێ ئەنێش مەوە.**

○ هیچکس را آزرده خاطر مکن، اگر آزرده کردی فارغ از انتقام مباش.

**معادل:** «چو بد کردی مباش ایمن زآفات که واجب شد طبیعت را مکافات».

● **واتە:** خراپە ئاکامی خراپی هەیە.

**۸۰- دڵ لە دڵ ئەروانێ.**

○ دل به دل نگاه می‌کند.

● **واتە:** دڵی تۆ چۆن بێ بۆ من، دڵی منیش بۆ تۆ هەروایە.

**۸۱- دڵ لە دڵ خەوەری هەس!**

○ دل از دل آگاه است، دل به دل راه دارد.

▣ وەکوو ئەڵێن: دڵ ئاوێنەی دڵە.

**عەرەب ئەڵێ:** القلبُ یهدی الی القلب.

**۸۲- دڵم خوەشە دایک کوڕم، بە زک برسی و شواڵ شڕم!**

○ دلم خوش است مادر پسر هستم، در حالی که شکمم گرسنه و پاپوشم پاره است!

● ئەمە قسەی دایکی کوڕێکی بێ غیرەتە کە سکاڵا ئەکا لە کوڕەکەی وا لە بیری برسی‌یەتی و رووت و قووتی دایکی هەژاریا نی‌یە!

**۸۳- دڵ و دڵخواز، ئەوێتە نان و پیاز.**

○ میانهٔ عاشق و معشوق، پس از مدتی چون نان و پیاز می‌شود.

● **واتە:** دوو دڵخواز دوای ماوەیەک پێکەوەبوون، لە یەک ئەتاوسێنەوە و بەینیان سارد ئەبێتۆ.

**۸۴ـ دڵێکەو شاعەباس بردگیە.**

○ دلی است و شاه عبّاس آن را ربوده.

● **واتە:** دڵێکەو دراوە بەو کەسەو پەشیمانی تێدا نی یە.

**۸۵ـ دڵی وەک گون هەلاج لێ ئەدا.**

○ دلش مثل آلت حلاّج می‌لرزد.

● **واتە:** زۆر ئەترسێ.

**۸۶ـ دنیا ئاو بیوا ئەو ها لە خەوا.**

○ دنیا را آب ببرد او در خواب است.

● **واتە:** ئەو کەسە زۆر بێ خەیاڵە.

**۸۷ـ دنیا ئەحمەوو مەحمووە.**

○ دنیا احمد و محمود است.

● **واتە:** کاری دنیا ئەم‌دەس و ئەودەس کردنە.

**۸۸ـ دنیا با ئەیوات و تۆکورەکە کەما ئایتە بەری!**

○ دنیا را باد می‌برد و تو می‌خواهی با بوتۀ کما جلو آن را سدّ کنی.

● **واتە:** بەڵای گەورە، نابێ بچووك لێی بڕوانی.

**۸۹ـ دنیا بەهەشت کەرگەلە.**

○ دنیا بهشت خرها است.

● **واتە:** مرۆڤی زانا دڵ بە دنیا خۆش ناکا و نەزان تێیدا شادومانە.

**۹۰ـ دنیا بێژێ گاڵ، تۆ بتەپە ماڵ!**

○ اگر همه بگویند ارزن، تو بخز توی خانه.

● **واتە:** هەر کەس هەرچی ئێژێ با بێژێ، بەڵام تۆ حەقی هیچ قسەیەکت لەم بارەیەوە نی‌یە!

**۹۱ـ دنیا دەسەوامە.**

○ کارهای دنیا چون وام دستی است.

● **واته:** چۆن لەگەڵ خەڵکا رەفتار بکەی وات لەگەڵ دا رەفتار ئەکەن.

**٩٢- دنیاس وگەزگەزێن، دەسم ئەروێت و ئەت گەزم ادەست رۆیی بمگەزە.**

○ دنیا است و گزیدن، حالا من می‌توانم و تو را می‌گزم؛ تو نیز اگر توانستی مرا بگز.

● **واته:** ئەمرۆ من ئەتوانم و تۆڵەت لێ ئەستێنم؛ تۆش ئەگەر توانیت دەستی خۆت بوەشێنە.

**٩٣- دنیا سەری بە پوش نەگیریاگە.**

○ سقف دنیا را با پوشال نپوشانده‌اند.

● **واته:** حیساب و کتێبێک هەیە.

**٩٤- دنیاکێ خواردی؟ زۆردار یا بێعار!**

○ از دنیا چه کسی بهره گرفت؟ زورمند یا بی آبرو!

● **واته:** لە ئەم دنیایە، زاڵم و بێشەرم، زۆرتر کەڵک وەر ئەگرن.

**٩٥- دنیاکێ خواردی؟ زوان لووس، لووس و پووس، بێ نامووس.**

○ از دنیا چه کسانی بهره بردند؟ چاپلوس، لوس و هیز، بی‌آبرو.

● **واته:** دنیا رەپێڵگەیە و ماساوکەر و حیز و تەرەس بەهرەی لێ وەر ئەگرن و دڵیان پێ خۆشە.

**٩٦- دنیا ها بە دەس زۆردار و بێ عارەو.**

○ دنیا در دست زورمند و بی عار است.

● هەر بووە تا بووە.

**٩٧- دنیا هەورە وگورگ دەمی چەورە.**

○ دنیا ابر است و گرگ دهنش چرب است.

● **واته:** دنیا نائەمنە و لە وەختگێڕان، بەموورادی خۆیان گەیشتوون و خەریکی دزی و تاڵانن.

**٩٨ـ دنیا هەی هەیەوکۆسە بەڵمەریش!**

○ دنیا دچار آشوب است و شخص کوسه به فکر ریش دراز است.

**معادل:** هر که به فکر خویش است، کوسه به فکر ریش است.

● **واتە:** مرۆڤی نەزان لە ئاژاوڵێی دنیایش دا هەر ها لە بیری خۆیا هەروا کە کۆسە لە هەموو کاتێکا وا لە بیری ریشێکی درێژا.

**٩٩ـ دنیای بە هەر دوو دەس گرتگە.**

○ دنیا را با دو دست گرفته است.

● **واتە:** زۆر بە دنیا دڵی خۆشە و هەوڵی بۆ ئەدا.

**١٠٠ـ دوان زۆرە و یەکێ کەم!**

○ دو تا زیاد است و یکی کم.

● **واتە:** منالٚ یە کێکی کەمە چونکە تاقانەیە و ئەگەر نەمێنێ دەردی گرانە و دوانیشی زۆرە چونکە بەخێو ناکرێن.

**١٠١ـ دوای باران کەپەنک!**

○ بعد از باران کپک!

● **واتە:** هەرچتێ لە وەختی خۆیا خۆشە و کاتی بەهرەمەندی ئەو چتە ئەگەر بە سەر چوو ئیتر بە کەڵک نایە.

**١٠٢ـ دوای تالاّن تەشت تەلا!**

○ بعد از غارت شدن طشت طلا.

● **واتە:** دوای تالاّن، خەفەتێک نامێنێ چونکە چتێ نەماوە.

**١٠٣ـ دوای ترێ خەمشە برێ!**

○ بعد از رسوایی دیگر چه بیمی!

● دوای رسوا بوون ئیتر ترس لە چی؟

**١٠٤ـ دوای تەنگانە، فەرعانە.**

○ بعد از رنج و زحمت. آسایش و راحت.

● **واتە:** هەر ناخۆشی‌یەکێ خۆشی‌یەکێ ها بە دوایەوە.

**۱۰۵ـ دوای لێزمە و باران کەپەن؟**

○ بعد از بارش شدید باران کپک؟

● **واتە:** هەرچی چتە لە وەختی خۆیا خۆشە.

◙ وەکوو: «دوای باران کەپەنک»

**۱۰۶ـ دۆ بەرە بێ دۆ، واتەزانێ ماس کوڵیاگە.**

○ دوغ بده به کسی که در خانهٔ خود دوغ ندارد، آن را ماست جوشیده تـصوّر می‌کند.

● **واتە:** مرۆڤی برسی هەموو چتێ بەلایەوە گرینگە.

**۱۰۷ـ دۆ تا نەیژەنی کەرە نادا.**

○ دوغ را تا به هم نزنی کره نمی‌دهد.

● **واتە:** هەموو کارێک عەزیەت و هیلاک بوونی پێویستە، تا بە بەرهەم بگا.

**۱۰۸ـ دوژمن ئەهۆنەوکە، ئانجا تەپ بەرە سەری.**

○ دشمن را آرام کن، آن‌گاه به او حمله‌ور شو.

● **واتە:** هەوەڵ خاوی دوژمن بچنە، ئەوسا پڕی تێ‌دە.

**۱۰۹ـ دوژمن خوەی بە شەکەر ئەخنکنێ.**

○ دشمن خود را با شکر خفه می‌کند.

● **واتە:** ئەونە لێ زانەکە بە زوانی خۆش ئەتوانێ دوژمنی خۆی سەرکوت کا و لە بەینی بەرێ.

**۱۱۰ـ دوژمن دوژمنت بە دۆس بزانە.**

○ دشمن دشمنت را دوست خود بدان.

● وایە.

**۱۱۱ـ دوژمنێ فرەس و هەزار دۆس کەمە!**

○ یک دشمن زیاد است و هزار دوست کم.

● **واته:** دوژمن کەمیشی هەر زۆرە و دۆس، زۆریشی کەمە.

**١١٢ـ دۆس لەوەسە پتگیرێنێ، دوژمن لەوەسە پتکەنێنێ!**

○ دوستِ آن است که تو را بگریاند، دشمن آن است که تو را بخنداند.

● **واته:** دۆسی دڵسۆز چونکە عەیبەکانت پێ ئێژێ و قسەکانی حەلە و حەقیش تاڵە، پێی قەڵس ئەبێ. بەڵام دوژمن بۆ ئەوەی فریوت بدا، بە درۆ ئەت نێتە باڵ و شادت ئەکا.

**١١٣ـ دۆس بۆ سەر ئەروانێ و دوژمن بۆ پا.**

○ دوست به سر و صورت تو می‌نگرد و دشمن به پایت نگاه می‌کند.

● **واته:** رواڵەتی شادمانی تۆ، دۆستت شاد ئەکا و پێڵاوەکانت بۆ دوژمن سەرنج راکێشەرە، بۆ ئەوەی دوژمن لەو روانگەوە تێ ئەگا چەندەتەقالای ژیانت داوە.

**١١٤ـ دۆسی دوژمنت، دوژمنِ تۆس.**

○ دوستِ دشمنت، دشمن توست.

● رایە.

**١١٥ـ دۆس وەک تۆم بێت، دوژمنم بۆچەس؟**

○ دوستی چون تو را داشته باشم، به دشمن چه نیازی دارم؟

● یەکێ بە دۆسێکی خۆی ئێژێ کە چاوەڕێی پیاوەتی لێ ئەکا، کەچی ئەو لە دوژمن خراپتر بۆی تێوە ئەچێ!

**١١٦ـ دۆشاو فرە بێ تارەتی پێ ئەگرن!**

○ دوشاب زیاد باشد با آن طهارت می‌گیرند.

● چتی زۆر بێ نرخە.

**١١٧ـ دوش لە دوشمەنیەو تێت و خەسوو لە خوسوومەتەو!**

○ دُش از دشمنی گرفته شده است و خسو از خصومت!

● **واته:** دوش بۆ ئەوەی کە لەگەڵ بووک دا خراپە پێی ئێژن «دوش» واتە دوژمن ؛

خەسوویش بۆ ئەوەی کە خوسوومەتی لەگەڵ بووک دا هەیە، ناویان ناوە «خەسوو»!

**١١٨ـ دۆڵەی پڕ، ئاشتی ماڵە!**

○ ظرف پُر(وفور آذوقه)، آشتی منزل است.

● **واتە:** ئەو ماڵەی وا تێرو تەسەلن، ئاژاوەی برسی‌یەتی تێدا نی‌یە.

**١١٩ـ دۆم بێت و کڵاش بۆ خوەی بکات!**

○ گیوه کش باشد و گیوه برای خودش بدوزد!

● **واتە:** ئوساکار، لە بەرهەمەکەی خۆی، چاکترینی بۆ خۆی یان بۆکەس و کاری خۆی هەڵ ئەبژێرێ.

**١٢٠ـ دوو پای بوو دوان تریشی بۆ قەرز کرد!**

○ دو پا داشت دو پای دیگر نیز قرض کرد.

● **واتە:** بە چالاکی دەرچوو.

**١٢١ـ دوو پای کردگەسە کەوشێکا!**

○ دو پایش را در یک لنگه کفش فرو کرده است.

● **واتە:** پای لەو کارە داگرتووە.

**١٢٢ـ دوو پف و سەورێ!**

○ دو پف و کمی صبر.

▣ بڕوانە بۆ «پ»: پف و سەورێ.

**١٢٣ـ دۆ و دۆشاو تێکڵاو ئەکا.**

○ دوغ و دوشاب را قاطی می‌کند.

● بە کەسێ ئەوترێ کە لە رووداوێکدا خاس و خراپ تێکەڵ بکا.

**١٢٤ـ دوور برۆ و درووس بێرۆ!**

○ از راه دور برو و سالم برگرد.

● **واتە:** رێگای دوور و کەم خەتەر، باشترە لە رێگای نزیک و پڕ خەتەر.

**۱۲۵ـ دوور بینی دوا، پەشیمانی نی‌یە بە شۆنیەو.**

○ عاقبت اندیشی، پشیمانی به دنبال ندارد.

● **واتە:** وەختێ کارێک ئەکەی بیری دوا رۆژت پێوە بێ، با پەشیمان نەبیتۆ.

**۱۲۶ـ دوور کوژ و نزیک پووکاوڵ!**

○ از دور زیبامی‌نماید و از نزدیک توی ذوق می‌زند.

● بە کچ یا ژنێك ئەوترێ کە لە دوورەوە زۆر رێك‌وپێك و بەژن و باڵا جوان و دڵ ڕفێن بێت، بەڵام لە نزیکەوە نیشان بدات کە پێچەوانەی ئەوەیە.

**۱۲۷ـ دوور و دۆس!**

○ دوری و دوستی.

● **واتە:** دووربین و دۆس بین باشترە لە وەی نزیك بین و دڵمان لە یەك بێشێ.

**۱۲۸ـ دوورروو، و دووزوان سەری ها بە خوێنەو.**

○ دو رو و دو زبان سر به خون دارد. (خون راه می‌اندازد)

● **واتە:** مرۆڤی دوو زوان، ئاژاوە هەڵ ئەگرسێنێ.

**۱۲۹ـ دووری سێفە سووری ؛ نزیکی مارمزووکی.**

○ تا دور هستی سیب سرخی ؛ نزدیک باشی مار مولکی.

● **واتە:** دوور بەو دۆس بە.

مارمزووك: مارملووك.

**۱۳۰ـ دوو نەفەر موسڵمان لە سەر ماڵ مووسایی‌یەک شەریانە.**

○ دو مسلمان بر سر تصاحب ثروت یک یهودی با هم نزاع می‌کنند.

● شەڕی دوو کەس لە سەر بردنی ماڵی کەسێکی تر.

**۱۳۱ـ دووکراس زیاتری دریگە.**

○ دو پیراهن بیشتر پاره کرده است.

● **واتە:** ئەو کەسە تەمەنی زۆرترە و تەجربەیەکی زۆرتری هەیە.

**۱۳۲ـ دووکەڵ لە تەوق سەری بەرزۆ بووا**

○ دود از کلّەاش بلند شد!

● **واتە:** لە بیستنی ئەو قسە، زۆر سەری سوورِ ما.

**۱۳۳ـ دووکەڵی ئەچێتە چاو خوەتا (یا: خوەیا)**

○ دودش به چشم خودت می‌رود.

● **واتە:** ئاکامی رەشی ئەو کارەساتە داوێنی خۆت ئەگرێ. (یـان: داوێـنی خـۆی ئەگرێ).

**۱۳۴ـ دووکەڵی چاو کەس نەچووە.**

○ دودش به چشم کسی نرفته است.

● **واتە:** لەگەڵ کەسا خراپەی نەکردووە.

**۱۳۵ـ دووگ مەسپێرە دەس کتک. (پشیلە)**

○ دنبه را به گربه مسپار.

● **واتە:** ئەو کەسە جێگەی متمانە نی‌یە، باوەڕی پێ مەکە.

**۱۳۶ـ دووگا لە دۆڵێکا رەنگ یەک ناگرن، خۆی یەک ئەگرن.**

○ دوو گاو در یک درّە رنگ همدیگر را نمی‌گیرند ولی خوی هـمدیگر رامـی گیرند.

● **واتە:** دوو مرۆڤ کە زۆر پێکەوە بن خۆی یەکتری ئەگرن (وەکوو دوو هاوسەر).

**۱۳۷ـ دووگیان سپاردگەسە دەس کتک!**

○ دنبه را به گربه سپرده‌اند.

● **واتە:** ماڵی ئەمانەتیان داوەتە دەس کەسێ کە جێگەی متمانە نی‌یە.

**۱۳۸ـ دوو مووسایی لە سەر ماڵ موسوڵمانێ شەریانە.**

○ دو یهودی بر سر تصاحب ثروت یک مسلمان دعوا می‌کنند!

▣ بڕوانە بۆ ژمارەی (۱۳)

**۱۳۹ـ دوو ناداته تەڵە!**

○ دنبه به تله نمیدهد!

● **واته:** خۆی گیر ناخا.

**۱۴۰ـ دوو نەفەر بچنە لای قازی، یەکێکیان تێتۆ بە رازی.**

○ دو نفر نزد قاضی بروند یکی از آندو راضی برمی‌گردد.

● **واته:** لە کێشەی بەینی دوو کەسا، حەقی حیسابی بە یەکێکیانە.

**۱۴۱ـ دوو هەنی (دوو شووتی) بە دەسێ هەڵ ناگیرگێ.**

○ دو هندوانه با یک دست بلند نمی‌شود.

● **واته:** لە یەک کات دا،دوو کاری گرینگ پێکەوەئەنجام نادرێ.

**۱۴۲ـ دە بە هەشت، هەشت بگرە مشت.**

○ ده به هشت، هشت را در دست نگاهدار.

● **واته:** نەخت و کەم باشترە لە زۆر وقەرز ؛ کەوابوو ئەو زۆر و قەرزە بدە بە کەم ونەخت ولە دەسی مەدە.

**۱۴۳ـ دەبە، هین کوردە و گۆران ئەیکا.**

○ دبه کار کُرد است و گوران به آن دست می‌زند.

● به یەکێک ئەوترێ کە دوور لە رەوشتی خۆی کارێکی نالەبار بکا.

**۱۴۴ـ دەر بەستە، خاوەن ماڵ رەستە.**

○ در بسته، صاحب خانه آسوده خاطر.

● **واته:** درگای ماڵی خۆت موحکەم ببەسە و خەیاڵی خۆت رەحەت کە.

**۱۴۵ـ دەرد جوان، تکەی بان.**

○ درد جوان، چکّه بام.

● **واته:** ئەگەر گەنج نەخۆش کەوێ، دەردەکەی وەکوو دڵۆپەی بان زوو رائەوەستێ و چاک ئەبێتەوە.

**۱۴۶ـ دەرد دڵ، بۆ ژێر گڵ.**

○ درد دل، برای زیر گِل.

● **واتە:** تا زیندووی دەردی دڵی خۆت بە لای کەسەوە مەیەژە.

**۱۴۷ـ دەردەدار ئەزانێ دەردەدار کوێنەی ئێشێ.**

○ درد مند می‌داند که دردمند کجایش درد می‌کند.

● **واتە:** ئەوەی گیرۆدەی تەنگ و چەڵەمەیەک بووبێ، ئەزانێ گیرۆدەی ئەو تەنگ و چەڵەمانە چی ئەکێشێ.

**۱۴۸ـ دەرزی هەڵ خەیت، (یا داخەیت) ناکەفێتە زەوی.**

○ سوزن به هوا بیندازی، بر زمین نمی‌افتد.

● بە جێگایەکی زۆر قەرەبالغ ئەوترێ.

**۱۴۹ـ دەرزی یەک بکەرە خوەتا و جەواڵدۆزێ بکەرە مەردما.**

○ سوزنی به خودت فرو کن و جوالدوزی به مردم.

● **واتە:** ئەگەر زەرەرێکی بچووک لەم بارەیەوە بۆ خۆت رەوا ئەبینی، بۆ خەڵکیش زۆرتری رەوا ببینە.

**۱۵۰ـ دەریا بە دەم سەگ چەپەڵ (یا: گڵاو)ناوێت.**

○ دریا با دهان سگ نجس نمی‌شود.

● **واتە:** بە قسەی تاڵی کەسێکی بێ نرخ، مرۆڤی گەورە بچووک نابێتۆ.

**۱۵۱ـ دەساومان سوێڵە!**

○ آب دست ما شور است.

● بە تەوس ئەوترێ بە یەکێک وا چاکەت لەگەڵ کردووەو پێی نازانێ و بە خراپە جوابت ئەداتەوە. واتە: دەستی ئێمە خێری نەبوو.

**۱۵۲ـ دەس بخەرە لاس، دەم بنەرە ماس.**

○ دست درفضلهٔ حیوانات بینداز، تا ماست بخوری.

● **واتە:** ئەبێ لە کاری ئاژەڵ داریدا باش تێوەچی تا ببی بە خاوەن شیر و ماس.

**۱۵۳ـ دەس‌با، بە پێشوازگەدایی‌یەو ئەروێ.**

○ آدم ولخرج به پیشواز گدائی می‌رود.

● **واتە:** مرۆڤی هەڵە خەرج، زوو ئەکەوێتە هەژاری و موحتاجی.

**۱۵۴ـ دەس بشکێ بەڵام گردەشکێن نەوێ:**

○ دست بشکند ولی کاملاً قطع نشود.

● **واتە:** زەرەر هەر ئەبێ، کەمی قەیدی نی‌یە؛ بەڵام سەر و ماڵی نەبێ.

**۱۵۵ـ دەس بە لە لێوی، شەرح خوەی ئەدات.**

○ او را وادار کن سخن بگوید، همه چیز را فاش خواهد کرد.

● **واتە:** بیدوێنە، هەموو چتێ ئەدرکێنێ.

**۱۵۶ـ دەست بەکەوگیرۆ بێ،چاوت بە هەژار و فەقیرۆ بێ.**

○ دستت به کفگیر بند باشد، نیازمندان رانیز در نظر داشته باش.

● بە یەکێک ئەوترێ کە گەیشتبێتە پایە و مەقامێک و پێی بێژن چاوی بە دەور و بەریەوە بێت.

**۱۵۷ـ دەس چواردە مەعسومی بریگە، بۆ دوانزە ئیمام ئەچێت!**

○ دست چهارده معصوم را بریده،می‌رود تا به دوازده امام برسد.

● بە یەکێکی زۆر ساختەچی و دەس بڕ ئەوترێ.

**۱۵۸ـ دەس خواردن درێژە.**

○ دست خوردن دراز است.

● **واتە:** کەسێ برسی بێ دەس ئەکێشێ بۆ خواردەمەنی و لە خۆی درێغی نی‌یە.

**۱۵۹ـ دەس خوەی برد بە دەما.**

○ دست خودش را گزید.

● **واتە:** لەو کارە پەشیمانە.

**۱۶۰ـ دەس خوەی نی‌یە و ماری پێ ئەگرێت!**

○ دست خودش نیست و با آن مار می‌گیرد.

● **واتە:** بە دەسی دوژمن مار ئەگریٚ! لە خەڵك بۆ خۆی مایە دا ئەنیٚ.

**١٦١ـ دەس، دەس ئەشۆریٚ و دەسیچ دەم و چاو ئەشۆریٚ.**

○ دست، دست را می‌شوید و دست نیز سر و صورت را می‌شوید.

● باس لە هاریکاری ئەکا.

**١٦٢ـ دەس دەس ئەشۆریٚ و دەسیچ هەڵ ئەگەریٚتەو دەم و چاو ئەشۆریٚ.**

○ دست، دست را می‌شوید و دست نیز برمی‌گردد و سر و صورت را می‌شوید.

▣ وەکوو ژمارەی (١٦١)

**١٦٣ـ دەس، دەس ئەناسیٚ.**

○ دست، دست را می‌شناسد.

● **واتە:** ئەگەر چتیٚکت لە کەسیٚ وەرگرت بە ئەمانەت، هەر بیدەرەوە بەو کەسە.

**١٦٤ـ دەس شکیاگ حەواڵەی گەردنە.**

○ دست شکستە حوالهٔ گردن است.

○ قسەی کەسیٚکە وا لە تەنگانەیەکدا گیری کردبیٚ و لە یەکیٚکی خۆیی داوا بکا تیا یارمەتی بدا.

**١٦٥ـ دەس شەیتان بشکیٚ!**

○ دست شیطان بشکند.

● **واتە:** بریا ئەو کارەم بکردبایە. یا: ئەو قسەم بوتبایە.

**١٦٦ـ دەس کار ئەکات و چاو ئەترسیٚ!**

○ دست کار می‌کند و چشم می‌ترسد.

● **واتە:** یەکیٚکی تر زەحمەت ئەکیٚشیٚ وکەسیٚکی تر هاوار ئەکا.

**١٦٧ـ دەس کەس پشت کەس ناخورنیٚ!**

○ دست هیچکس پشت دیگری را نمی‌خاراند.

● **واته:** هیچ کەس وەکوو خۆت دڵسۆزت نی‌یە.

**۱۶۸ـ دەس لە بان دەس.**

○ دست بالای دست.

● **واته:** هیچ کەس لەکارێکدا تەواو نی‌یە وکەسێکی تر لەو بانتر هەیە.

**۱۶۹ـ دەس لە پا درێژترا**

○ دست از پا درازتر.

● بە یەکێک ئەوترێ‌کە چووبێ بۆ ئەنجامی کارێک و سەرنەکەوتبێ و بە پەکەری هاتبێتۆ.

**۱۷۰ـ دەس لە دەس و قەوەت لە خوا.**

○ حرکت از تو ونیرو از خدا.

● **واته:** تۆ دەس بدەرە ئەوکارەوە و خوایش هێزت ئەداتێ.

**۱۷۱ـ دەسمان بەکڵاوە لەتەکەی خوەمانە وگرتگە با نەیوات!**

○ دست به کلاه پارهٔ خودمان گرفته‌ایم تا باد آن را نبرد.

● **واته:** بیرمان وا بە لای خۆمانەوە، کەتووشی ئاڵۆزی رۆژگار نەبین.

**۱۷۲ـ دەس ماندوو بنە سەر زک تێرۆ.**

○ دست خسته را روی شکم سیر بگذار.

● **واته:** مرۆڤ ئەگەر کار بکات و هەوڵ بدات، لە سێبەری ماندوو بوونی خۆیدا موحتاجی کەس نابێ.

**۱۷۳ـ دەسم خاڵی بێ لەکوێر و زەلیل، تێمۆ بۆ «بانتا» بۆگیان ئاخەلیل!**

○ اگر از دست این افراد کور و ذلیل فراغت پیدا کنم، به «بانتا» بر می‌گردم و به حساب آقا خلیل خواهم رسید.

● **واته:** دەسم لەم موشکیلە خاڵی ببێ، ئەوکەسەیش وا پێویست بێ، تۆڵەی لێ ئەستێنم و سەرکوتی ئەکەم.

«بانتا»: گوندێکە لە بەینی سنەو سەقزا.

**١٧٤ـ دەسم هالە هەویرا هەر ئەونەمە هالە بیرا.**

○ دستم در خمیر است و همین تعداد را به یاد دارم.

● **ئەمە قسەی ژنێکی زۆر شوو کردووە** کە خەریکە هەویر ئە کا؛ لێی ئەپرسن چەن شووت کردووە؟ ئەڵێ: پێنج و پێنج و پێنجی تریش، حەسەنە بێ‌ریش، عـەولا قامیش، باوک مناڵە کانیش، ئیتر دەسم هالە هەویرا هەر ئەونەمە هالە بیرا!

**١٧٥ـ دەس مە کە کونا زەردەوالا.**

○ توی سوراخ زنبور دست فرومکن.

● **واتە:** بە دەسی خۆت بۆ خۆت ژانە سەر درووس مە کە و لەم ئاژاوە خۆت دوور بگرە.

زەردەواڵە: هەنگە ژاڵە.

**١٧٦ـ دەس و دڵی سەردەو بووگە.**

○ دست و دلش سرد شده است.

● **واتە:** لە ئەو کارە نائومێدە و دەسی تێ ناچێ بیکا.

**١٧٧ـ دەس و دڵی یەک ناگرێ!**

○ دست و دلش هماهنگ نیست.

● **واتە:** بۆ ئەنجامی ئەو کارە دڵی پێوە نی‌یە.

**١٧٨ـ دەس وشک بە دیوارەو ناچەسپێ.**

○ دست خشک به دیوار نمی‌چسپد.

● **واتە:** کەسێ کارێکی خراپی نە کردبێ، هیچ عەیبێکی پێوە نالکێ.

**١٧٩ـ دەسە چەورە کەی خوەت مەساوە سەر منا!**

○ دست چرب خودت را بر سر من ممال.

● **واتە:** ئەو عەیبە خۆت هەتە، لە منی مەنە!

بە جێگەی «چەور»، «رەش» و «چڵکن»یش وتراوە.

**١٨٠ـ دەسەزرانی دانیشتگە.**

○ دست به زانو نشسته است.

● **واته:** دەستە پاچەیە.

**١٨١ـ دەسێ بە تەنیا تەقەی نایە.**

○ یک دست به تنهائی صدا ندارد.

● **واته:** ئەو کارە بەیەک کەس، ئەنجام نابێ.

**١٨٢ـ دەسی رەشە کاری پێ مەکە.**

○ دستش سیاه است او را به کار مگیر.

● بە یەکێکی دەسڕەش و قۆشمە ئەوترێ.

**١٨٣ـ دەسێ زاڵم بیبرێت، خوێنی نایەت!**

○ دستی را که ظالم ببرد، خون از آن جاری نمی‌شود.

● **واته:** زاڵم هەرچی بکات، حیساب و کتێبی نی‌یە.

**١٨٤ـ دەسێ شەرع بیبرێت خوێنی نی‌یە.**

○ دستی که شرع آن را قطع کند، خون ندارد.

● **واته:** حوکمی شەرع ناحەق نی‌یە.

**١٨٥ـ دەسێکت رۆن بێ و دەسێکت دۆشاو، بیکە بە قورگیا هەر ئەونە دەرت هاوردگازی لێ ئەگرێت!**

○ یک دستت روغن باشد و یک دستت دوشاب، بگذار توی دهانش، به محض اینکه دستت را درآوری، آن را گاز می‌گیرد.

● بە یەکێک ئەوترێ چاکەی کەسانی لە بەرچاو نەبێ و قەدری پیاوەتی کەس نەزانێ و بە خراپەیش جوابی چاکە بداتۆ.

**١٨٦ـ دەسی کرد بە زاخا.**

○ دست او را توی زاج گذاشت.

● **واته:** دەس خەڕەی کرد.

**۱۸۷ـ دەسێکی قورعانە و دەسێکی قەمە!**

○ به دستی قرآن و به دستی قمه دارد.

● بە یەکێکی ساختەچی و ریاکار ئەوترێ کە بە رواڵەتێ خۆی لە نێو مەردما بە مرۆڤێکی بە ئیمان بدا لە قەڵەم و بە رواڵەتێکی تریش تێشو بدا لە ریشەیان.

**۱۸۸ـ دەسی گرتە خەنە.**

○ دستش را حنا گرفت.

● **واتە:** ئەو کەسەی فریو دا.

**۱۸۹ـ دەسی لە بن هەوانەکەوە دەرچوو.**

○ دستش از تە انبان درآمد.

● **واتە:** هەر چی‌یەکی بور لە دەسی دا.

**۱۹۰ـ دەسی لە دنیا دا شۆردگە.**

○ دست از دنیاشسته است.

● **واتە:** ئومێدی ژینی لە دەس داوە. یا: دونیای ناوەتە ئەولاوە.

**۱۹۱ـ دەسی لێ مەدە خراو ئەوێ.**

○ دستش نزن، خراب می‌شود.

● بە یەکێک ئەوترێ کە گەرەکی بێ کارێکی خراپ، خاس بکا بەڵام خراپتری بکا.
**ئەگێرنەوە:** پیاوێ ئەچێتە ماڵی کەسێ بە میوانی، ژنی خانە خوێ روو بە رووی کابرای غەریبە دانیشتووە و ناو پایشی بە دەرەوەیە و خۆی نازانێ. میوان چاوی بەو چتە ئەکەوێ و هەر بۆی ئەڕوانێ!
خاوەن ماڵ دوای ماوەیەک لەو کارەساتە تێ ئەگا و هەرچی هەوڵ ئەدا ژنەکە تێ گەیەنێ باش دانیشێ ژن تێ ناگا، ساحێب ماڵ ناچار ئەبێ بە جۆرێ چاوی میوانی بێ شەرم لە دیتنی ئەو روانگە، هەڵ چەرخێنێ و پێی ئەڵێ: کاکە بە تەمام سرمیچی ئم ماڵە تێک دەم و لە نوێ دارەڕای بکەم، تۆچی ئێژی؟ کابرای میوان بە گورجی سەر بەرز ئەکاتۆو ئەڵێ: دەسی لێ مەدە خراو ئەوێ. دوبارە ئەروانێ بۆ هەمان شوێنی دیاری کراو! خانە خوێ هیچی پێ ناکرێ و گوێزێ لە بەر دەستیا ئەبێ، بە پەلە پیتکە ئەی‌خا بۆ ژنەکە بەڵکوو پای بداتە یەک و باش دانیشێ، بۆچی گوێز نادا بە ناو پای ژناو را

ئەچەڵەکێ و بێ ئیختیار ترێ ئەداتۆ و ئەو جار پا هەڵ ئەکێشێ. جا پیاوی میوان ئەڵێ: کاکە نەم وت دەسی لێمەدە خراو ئەوێ!

**۱۹۲ـ دەسێ نەتوانی بیشکنی، ئەشێ ماچی کەی.**

○ دستی را کە نتوانی بشکنی، باید ببوسی.

● **واتە:** پەنجە لەگەڵ زۆردارا لێ مەدە و لەگەڵیا بسازە.

**۱۹۳ـ دەسی نیا کاسە.**

○ دست او را در کاسە گذاشت.

● **واتە:** نائومێدی کرد.

**۱۹۴ـ دەسی نیا ماڵ خوەی!**

○ مالش را خرج کرد.

● بە تەوس ئەوترێ بە کەسێکی رژد کە بە هەزار کێشە زۆری بۆ خۆی هاوردبێ تا خەرجێکی بێ قابل بکا.

**۱۹۵ـ دەسی نی‌یە بیوا بۆ دەم خوەی!**

○ دست ندارد کە بە دهانش ببرد.

● **واتە:** رژد و پیسکەیە و ماڵی خۆی بۆ ناخورێ.

**۱۹۶ـ دەشایم نی‌یە بیەمە شێڵانە، دایکم ئێژێ ژن بێرانە.**

○ دە شاهی ندارم بدهم زردآلو بخرم، مادرم می‌گوید زن بگیر.

● **واتە:** ژن بە ماڵ دێ، ماڵ نەبوو ژنی چی؟

**۱۹۷ـ دەعبای کوێر خوا هێلانەی بۆ دروس ئەکا.**

○ جانور کور خدا برایش لانە می‌سازد.

● **واتە:** خوا بە عەبدی زویری خۆی زۆرتر رەحم ئەکا.

**۱۹۸ـ دەفی دەنگ نادات.**

○ دف او صدا ندارد.

● **واتە:** لە بەر هەندێ تێبینی لەو بارەوە قسەی پێ ناکرێ.

**۱۹۹ـ دەڵ تسن تانجی رەش کوژی لێ ناوێ.**

○ مادە سگ چسو، تازی زیرک و چالاک نمی‌زاید.

● **واتە:** لە ژنی خوێڕی، رۆڵەی ئازا و چالاک ناکەوێتۆ.

**۲۰۰ـ دەڵەمە دیانی ئەشکێنێ!**

○ دَلَمه دندانش را می‌شکند.

● بە یەکێکی بێ ئیقباڵ ئەوترێ کە لە چتی پووچ، شەڕی بۆ دروس ببێ.

**۲۰۱ـ دەم بوێسێ، سەر سڵامەتە.**

○ دهان سکوت کند، سر سالم می‌ماند.

زبان سرخ سرسبز می‌دهد بر باد.

● **واتە:** مرۆڤ ئەبێ بە سەر زوانی خۆیا زاڵ بێ و قسەی بێ جێگە و بێ حیساب نە کا، تا سەری لە دەس نەدا.

**۲۰۲ـ دەم تەڕ و کاسە وشک!**

○ چرب سخن و کاسه خشک.

● بە یەکێکی سەر و زوان خۆش، بەڵام بێ نان و خوان ئەوترێ.

**۲۰۳ـ دەم چەورو کاسەی خاڵی!**

○ چرب سخن و کاسه خالی.

● بە کەسێکی سەر و زوان خۆش بەڵام بێ نان و خوان ئەوترێ.

**۲۰۴ـ دەم سەگ بە نان بوەسە.**

○ دهن سگ را با دادن نان ببند.

● **واتە:** دەمی شڕ و پیسی خەڵکی بێ‌حەیا بە ماڵی دنیا ببەسە.

**۲۰۵ـ دەمم وتی هانێ، زکم وتی کوانێ؟**

○ دهانم گفت بگیر، شکمم گفت کو؟

● به خواردەمەنی‌یەکی کەم ئەوترێ کە بەش کەس نەکا.

**٢٠٦ـ دەمی بووە تەڵەی تەقیک!**

○ دهانش چون تلۀ خنثی شده، باز شد.

● **واتە:** لەو قسە یا لەو کارەساتە زۆر سەری سوورِما.

**٢٠٧ـ دەمی وەسە قنگ رکێشە!**

○ دهانش مانند دنبالۀ گیاه بارهنگ است.

«بارهنگ» گیاهی از تیرۀ زیتونیان است که برگهایش از ریشه جدا می‌شوند.

● به یەکێکی دەم نەوێسراو ئەوترێ.

«رکێشە» گیایەکە لە تیرەی زەیتونی‌یەکان کە گەڵاکانی لە سەر بنجەکەی ئەڕوێ و بەرهەمی دەرمانیشی هەیە و ئەیخەنە سەر برین.

**٢٠٨ـ دەنگم خوەش بوایە بۆ خوەم ئەگیریام.**

○ اگر صدایم خوب بود، به حال خودم گریه می‌کردم.

● **واتە:** هیچم لە دەست نایە، تەنانەت بۆ خۆیشم.

**٢٠٩ـ دەنگە گەیی، دوکەڵی گەیی.**

○ صدا رسید، دود آن هم رسید.

● **واتە:** ئەو قسەمان بیست و کاری تێ کردین.

**٢١٠ـ دەنگەی دەوڵ لە دوورۆ خوەشە!**

○ آواز دُهُل از دور خوش است.

● **واتە:** زۆر چت و زۆر کەس هەن کە هەر ناو و دەنگیان هەیە بەڵام وەختێ لە نزیکەوە ئەیان بینی، ئەوە نین وا لە دوورەوە بیستبووت.

**٢١١ـ دەنگی هەس و رەنگی نی‌یە.**

○ صدا دارد و تصویر ندارد.

● بە کەسێ یان چتێ ئەوترێ کە ناوی بێ بەڵام نەبینرابێ.

**٢١٢ـ دەوار بە شۆردن چەرمگ ناوێتەو.**

● چادر سیاه با شستن، سفید نمی‌شود.

● **واتە:** مرۆڤی بەد زات بە رێنموونی و تەربیەت کردن دروس نابێ.

**٢١٣ـ دەور «کەوا نان بخۆ»س!**

● دورۀ «قبا نان بخور» است.

● **واتە:** رۆژگارێکە ئەگەر مرۆڤ رواڵەتێکی خاوێن و جل و بەرگێکی پاک و پوختەی نەبێ، کەس رووی دەمی تێ ناکا و بە چاوی رێز بۆی ناڕوانن.

**ئەمە حیکایەتی ئەو پیاوە زانا** بەڵام شڕ و شێواوەیە کە چووە ماڵێک و خاوەن ماڵەکە بە چاوی سووک بۆی روانی و لە خواری مەجلیسەکەوە جێگەی پێ دا؛ وەختێکی تر هەر ئەو زانایە بە جل و بەرگێکی پوختە و رواڵەتێکی ئاراستە رێگەی ئەکەوێتە هەر ئەو ماڵە و ئەمجار هەمان خاوەن ماڵ دێت بە پێشوازیەوە و ئەیباتە سەرۆی مەجلیسەکە و رێزێکی زۆری لێ ئەگرێ و لەکاتی نان خواردنا بە میوان ئێژێ: فەرموو نان‌بخۆ. زاناکەیش قۆڵی کەواکەی خۆی ئەگرێ و رووی تێ ئەکا و ئێژێ: «کەوا نان بخۆ!» ؛خاوەن‌ماڵ کە سەری لەو قسە سووڕ ماوە؛لێی ئەپرسێ مانای ئەو قسە چی‌یە؟ زاناکە ئەڵێ: من هەر ئەو پیاوە رەش و رووتەم وا چەندێ لەمەوپێش هاتمە ئەم ماڵە و تۆ رێزت لێ‌نەگرتم، بەڵام ئەمڕۆکە بەم رواڵەتە هاتمە ماڵەکەت، وا رێزم لێ ئەگری؛کەوا بوو ئەمە قەدری من نی‌یە کە تۆ ئەیگری، قەدری جل و بەرگەکەمە و کەوا ئەبێ نان بخوا، نە من!

**٢١٤ـ دەورێش ئەزانێ کەشکۆڵ چەی هاتیا.**

○ درویش می‌داند که در کشکول چه چیزی وجود دارد.

● **واتە:** هەر کەس خۆی بەناو دڵی خۆی ئەزانێ.

**٢١٥ـ دەوڵ دریا و دەنگی بریا.**

○ دُهُل پاره شد و صدایش قطع گشت.

● **واتە:** عەیبی درۆزن دەرکەوت و ئەو لە قسەکەوت.

**٢١٦ـ دەوڵەمەن گووی چەورە!**

○ عن ثروتمند چرب است!

● به تەوس ئەوترێ واتە: دەوڵەمەن هەموو چتێکی هەر ئەبێ لە گەل کەسانی تـرا جیاواز بێ.

**۲۱۷ـ دەوڵەمەنە و نازانێ گیرفانەکەی ها لەکوێنا!**

○ ثروتمند است و نمی‌داند جیبش در کجا قرار دارد!

● بە پەکێکی تازە پێداکەوتوو ئەوترێ کە هێشتا رێ و رەسمی پیاوەتی فێر نەبووبێ.

**۲۱۸ـ دەوەلیش ئەوێتە دار.**

● درختچە نیز تبدیل به درخت می‌شود.

● **واتە:** منالّیش رۆژێ، گەورە ئەبێ و سەر ناو سەرانا دەردێنێ.

**۲۱۹ـ دیار دۆس چ ساتێ چ سالێ.**

○ دیدار دوست چه یک لحظه چه یک سال.

● **واتە:** ئەگەر ناتوانم زۆرتر لات دانیشم، ببوورە.

**۲۲۰ـ دیاری شوان هەڵەکۆکە.**

○ هدیهٔ چوپان آلەکوک است.

● **واتە:** ئەم دیاریە شیاوی تۆ نی‌یە.

**۲۲۱ـ دیان ئێشان، چارەکێشان.**

○ دلدان اگر درد گرفت باید آن را کشید.

● **واتە:** منالّ و کەسی نزیکیش ئەگەر خراپ بێ، ئەبێ تەرکی کەی.

**۲۲۲ـ دیان تەماعی کەندگە. (یا: کێشاگە).**

○ دندان طمع خود را کشیده است.

● **واتە:** تەماعی ناوەتە ئەولاوە.

**۲۲۳ـ دیان خێری پیا نانێ.**

○ از او به نیکی یاد نمی‌کند.

● **واته:** چاکەی نایەژێ.

**٢٢٤ـ دیانیان لە حەنای یەک چەرمگەو بووگە!**

○ دندانشان در مقابل هم سفید شده است.

● **واته:** رووپان لە یەك داماڵاوە و قسە بە یەك ئەكەن.

**٢٢٥ـ دیانی پیا نانێ.**

○ اعتراف نمی‌کند.

● **واته:** راستی نایەژێ.

**٢٢٦ـ دیانی تێژەوکردگە!**

○ دندانش را تیز کرده است.

● **واته:** خۆی مڵاز داوە بۆ بردن یان رفاندنی ئەو چتە.

**٢٢٧ـ دیانێکی بە ساڵێ دەر هاوردگە.**

○ هر دندانش به یک سال درآمده.

● بە کەسێکی رژد و قیر سیچم ئەوترێ کە هیچی لە دەس دەرنەیە.

**٢٢٨ـ دێ پرە لە دەنگ و باس ، دادە خوەی لێ کردگە کاس!**

○ روستا پر از خبر است و خاتون خودش را به بی‌خبری زده است.

● بە یەکێك ئەوترێ عەیبێکی لێ داکەوتبێ و هەمووکەس پێ‌یان زانیبێ و ئەو خۆی لێ گێل کردبێ.

**٢٢٩ـ دێر هاتگە وگەرەکیە زوو پێ بگەیەت!**

○ دیر آمده است و می‌خواهد زود به‌آن برسد!

● بە مرۆڤی هەوڵ و بە پەلە و پڕ تەماع ئەوترێت.

**٢٣٠ـ دێر هاتم و شێر هاتم!**

○ دیر آمدم و شیر آمدم.

● **واته:** ئەگەرچی دێر هاتم بەڵام دەستم پڕە و پیرۆزم.

**٢٣١ـ دێزە دانیشت و مەلغ گۆزەی لەکردا**

○ خمچه نشسته بود و کوزه را سرزنش می‌کرد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە خۆی عەیبێکی بێ و لەکەسانی تر بۆ ئەو عەیبە رەخنە بگرێ.

**٢٣٢ـ دێزەکەرێ دانیشت و مەنای گۆزەکەریکی ئەکرد.**

○ خمچه گری نشسته بود و کوزه گری را سرزنش می‌نمود.

◘ وەکوو مەسیلەی پێشوو

**٢٣٣ـ دێزەی مەردان وە حەفت ساڵ تێتە قوڵا**

○ دیگ مردان به مدّت هفت سال به جوش می‌آید.

● بە جوامێران ئەوترێ کە لە ئاستی تاڵی و سۆڵیدا سەبر و حەوسەلەیان هەیە.

**٢٣٤ـ دینی نی‌یە شەیتان بیوا و ماڵی نی‌یە رەحمان بیوا.**

○ دین ندارد که شیطان آن را ببرد و مال ندارد که رحمان ببرد.

● **واتە:** نە دینی هەیە و نە ماڵ و سەروەت.

**٢٣٥ـ دیوار تەک تۆمە، پاسار گوێت لێ بێ.**

○ دیوار به تو می‌گویم، لبهٔ بام بشنو.

● قسەیەک بۆ کەسێ بکرێ بەڵام مەبەست یەکێکی تر بێ.

**٢٣٦ـ دێوکەم بوو لە دێوەڵان، ئەویش بێ بکەوێتە کەنەڵانا**

○ دیو در لانهٔ دیوان کم بود، او هم بیاید و در این گودال بیفتد!

● بە تەوس ئەوترێ لە کاتێکدا کە جەماعەتێکی بێ خێر و بیر، لە ماڵێکدا بن و یەکێکی تریش بێت و بەوانەوە بلکێ!

## ■ ر

۱- **راز بە یەکێ بێژە و پرس بە هەزار.**

○ راز خود را به یکی بگو و با هزار نفر مشورت کن.

● **واتە:** نهێنیی‌دڵی خۆت تا ئەتوانی بە کەس مەڵێ، بەڵام لەگەڵ کەسانا پرس و رات ببێ.

۲- **راس و چەپ خوەی لە یەک ناکاتۆ.**

○ راست و چپ خود را تشخیص نمی‌دهد.

● **واتە:** کەم عەقڵ یان مناڵ و کەم تەجروبەیە.

۳- **راسی، رەفتی؛ چەفتی، کەفتی.**

○ به راستی عمل کنی، نجات می‌یابی؛ کج رفتار باشی، سرنگون می‌شوی.

● **واتە:** رزگاری لە راسی و دروسیدایە وئاکامی ناڕاسی،گیری‌وپەشێوی‌یە.

۴- **ران بێ شوان گورگ ئەیخوا.**

○ گلّهٔ بدون چوپان را گرگ می‌خورد.

● **واتە:** هەرگرۆ یا بنەماڵە یا جەماعەتێ بۆ سامانی خۆی پێویستی بەگەورەیەک هەیە.

۵- **رژدی، روسوایی ها بە شۆنیۆ.**

○ خِسّت، رسوائی به دنبال دارد.

● **واتە:** رژد و قیر سیچم مەبە، با سووک و روسوا نەبی.

**٦ـ رسقی سواره و خوەی پیاده.**

○ روزی او سوار است و خودش پیاده.

● **واته:** هەرچی هەوڵ و تەقالا ئەدا، هەر پێی ناگا و دەسی تەنگە.

**٧ـ رۆژان رۆژی لە شۆنە.**

○ روزها روز به دنبال دارد.

● **واته:** بیری دوا رۆژت بەلاوە بێ.

**٨ـ رۆژ بە پەنجە ئەژمێرێ.**

○ روزها را با انگشتان دستش می‌شمارد.

● **واته:** چاوەڕێی چتێ یان کەسێکە.

**٩ـ رۆژ پاک بۆ تەمەڵ شەوە زەنگە!**

○ سفیدی صبح برای تنبل تاریکی مطلق است.

● **واته:** تەمەڵچونکە شەو ورۆژ کاری هەرخەوتنە، رۆژیش بۆئەو هەر وەکوو شەو وایە.

**١٠ـ رۆژێ بەکەڵەشێری نەک هەزار رۆژ بە مامری!**

○ یک روز چون خروس زیستن نه هزار روز چون مرغ زندگی کردن.

● **واته:** مرۆڤ کەم تەمەن بێ و بەغیرەت وسەربەرز، نەك پڕ تەمەن و بێ غیرەت وسەرشۆڕ.

**١١ـ رۆژێ بە مەردی نەک سەد ساڵ بە حیزی.**

○ روزی به مردی نه صد سال به نامردی.

◘ بڕوانە بۆ پەندی پێشوو.

**١٢ـ رۆژی چل چەقۆ دروس ئەکات و دانەیەکی دەسەی لێ نانێ.**

○ روزی چهل چاقو درست می‌کند و یکی را دسته نمی‌اندازد.

● بە یەکێکی زور درۆزن و ساختە چی ئەوترێ.

**۱۳ـ رۆژی کەفتم، حەفت ساڵ خەفتم!**

○ یک روز افتادم، هفت سال خوابیدم.

● قسەی یەکێکی تەمەڵ و لەش قورسەکە بۆ بیانوو ئەگەڕێ تاکار نەکا و پاڵی لێ بداتۆ.

**۱۴ـ رۆژی لە دار و رۆژی لە خوار.**

○ روزی بالا و روزی پایین.

● **واتە:** تووشی گیر و گرفتی رۆژگار بوون.

**۱۵ـ رۆسەمەو دەسێ ئەسڵەحە!**

○ رستم است و یک دست اسلحه!

● **واتە:** ئێمەین و ئەم دەسە جل و بەرگە.

**۱۶ـ رۆشنی رۆژ لە بنە رۆژە دیارە.**

○ روشنی روز از اوّل صبح پیدا است.

● **واتە:** چۆنیەتی هەموو کارێ لە سەرەتاوە دیارە.

**۱۷ـ رۆ لە بەر دایک هەڵئەگرێت.**

○ طفل را از آغوش مادر می‌رباید.

● بە یەکێکی شەڕکەر و زۆر ئازا ئەوترێ.

رۆ: رۆڵە، منداڵ

**۱۸ـ رۆن رژیاگ ئەکاتە خێر باوکی!**

○ روغن ریخته را خیرات پدرش می‌کند.

● **واتە:** لە چتێک ئەبەخشێ‌وئێحسان ئەکا، کە لە دەستی ئەو دەرچووە.

**۱۹ـ رۆن فرە بێ قنگیشی پێ ئەناون!**

○ روغن اگر زیاد باشد، به مقعد نیز می‌مالند.

● **واتە:** چت کە زۆر بوو بێ نرخ ئەبێ.

**۲۰ـ رۆن لە پیاگ بسێنە وگەنم لە ژن.**

○ روغن از مرد بخر و گندم از زن.

● **واته:** هەر کەس دەستی بە چتێکەوە رێژ نەبووبێ قەدری نازانێ و بە فیڕۆ لە دەستی ئەدا. رۆن بە رەنجی ژن پێک دێ و پیاو هەرزان ئەیفرۆشێ؛ گەنم بە رەنجی پیاو پێک دێ و ژن بە فیڕۆ ئەیفرۆشێ.

**٢١ـ روو بە روو ئەکەفێ و چاو بە چاو.**

○ رو بە رو می‌افتد و چشم بە چشم.

● **واته:** هەر کارێ ئەکەی بیری سۆزیت پێوە بێ و ئەوەندەی تێدا بێلاوەکە شەرمەزار نەبی.

**٢٢ـ روو بەی بە مێمان ئەوێتە ساحێو ماڵ!**

○ بە مهمان رو بدهی، صاحب خانە می‌شود.

● **واته:** میوانی بێ شەرم لە پیاوەتی خاوەن ماڵ ئەکەوێتە تەماو پا لە ئەندازەی خۆی زۆرتر درێژ ئەکاتۆ.

**٢٣ـ رووی قەڵخانی تێ کردگە!**

○ سپر بە سوی او گرفتە است.

● **واته:** خۆی ئامادەکردووە بۆ شەڕ لەگەڵیا.

**٢٤ـ رووی نەداری رەش.**

○ روی تنگدستی سیاه.

● **واته:** ئەگەر دەستم تەنگ نەبوایە،ئەو پیاوەتی‌یەم ئەکرد.

**٢٥ـ رەحم کردن بە زۆردار، زوڵم بە هەژارە.**

○ رحم کردن بە ظالم، ستم است بر مظلوم.

● **واته:** زۆردار ئەگەر رەحمی پێ بکرێ، بەهێزتر ئەبێ بو زوڵم کردن بە هەژاران.

**٢٦ـ رەحمەت لە کەفەن دز بەرگ!**

○ رحمت بر کفن دزد قبلی.

● لە کاتێکدا ئەوترێ واکەسێکی زۆر خراپەکار بێتە جێگەی یەکێکی خراپ و بە

دیتنی ئەم دووهەمە، یادی خراپەکاری ئەوەڵ بەخێر بکرێتەوە.

**قسەی ئەو کابرا کفن دزەیە** کە کاتێ مردوویان بە خاک ئەسپارد، شەو ئەچوو مردووەکەی لە قەبرەکە دەر ئەهێنا و کفنەکەی لێ ئەکردۆ و مردووی بێ کفنی ئەخستە ناو قەبرەکەوە و دای ئەپۆشا و کفنی ئەبرد و ئەڕۆیشت.

پێیان زانی، گرتیان و گاوەسەریان کرد. یەکێکی تر پەیدا بوو هەر بەو چەشنە کفنی ئەدزی ؛ بەڵام دوای ئەوەیش دارێکی ئەکرد بە دوای مردووەکاندا! خەڵکی بەویشیان زانی و گرتیان و بە جەزایان گەیاند. وەلێ دییان ئەم دزە نەتەنیا کفنەکەی دزیوە، ئەو کارە خراپەیشی لە گەڵ مردووەکاندا کردووە. خەڵک ئەمەیان بینی بیری کفن دزە پێشوەکەیان بەخێر کردەوە کە ئەو هەر کفنی ئەدزی و کارێکی وا ناشیرین‌تری نەئەکرد. جا وتیان: «ڕەحمەت لە کەفەن دز بەرگ».

**۲۷ـ ڕەز بۆ ڕەزان، بەز بۆ بەزان.**

○ رَز برای رَزبُر، دنبه برای قصّاب.

● **واتە:** هەر کەسێ کارێکی پێ سپێردراوە.

**۲۸ـ ڕەشکەکەمان گاڵی هاتیا!**

○ در جوال مشبّک ما ارزن وجود دارد.

● عوزرمایی پڕوپووچەڵی کەسێکە بۆ ئەوەی نەیەوێ پیاوەتی‌یەک بکا لە گەڵ کەسێکدا کە رووی لێ خستووە.

**۲۹ـ ڕەش و چەرمگ لە یەکۆ ناکاتۆ!**

○ سیاه و سفید را از هم تشخیص نمی‌دهد.

● **واتە:** خوێندن و نووسین نازانێ.

**۳۰ـ ڕەفێق خیکە چەورە، دۆس دێزە ڕەشە!**

○ رفیق خیک چرب است ودوست خُمچهٔ سیاه.

● بە یەکێک ئەوترێ کە چاوی تەماعی بڕیبێتە ماڵی خەڵک.

**۳۱ـ ڕەگ بە ڕیشە و گلێنە بە بنەتوو.**

○ رگ به ریشه و سیاهک به بذر برمی‌گردد.

● **واته:** هەر کەسێ ئەکێشیتەوە سەر ئەسڵ و نیژاد و رەگەزی بنەماڵەی خۆی.

**عەرەب ئەڵێ:** کُلُّ شیءٍ یَرْجِعُ الی اَصْلِهِ. هەر چتێ بۆ ئەسڵی خۆی هەڵئەگەڕێتۆ.

**۳۲ـ رەمەزانت تەواو کرد، نۆرەی شەشەڵانە!**

○ روزهٔ رمضان را به پایان رساندی، حالا نوبت شش روز اوّل شوّال است.

● به تەوس ئەوترێ واتە: ئەوکارە سەختەت تەواو کردووە کە ئێستە خەریکی خۆت ئەخەیتە ناو موشکلەیەکی ترەوە؟

**۳۳ـ رەمەزانمان وە حاڵی خوەش گرت، نۆرەی شەشەڵانە!**

○ رمضان را با حالی خوش روزه گرفتیم، نوبهٔ شش روز اوّل شوّال است.

● **واتە:** لەو ئیشە سەختە بە هەزار کێشە نەجاتمان بوو ئێستە بێین و خـۆمان تـووشی کێشەیەکی تر بکەین.

**۳۴ـ رەنگ زەردی کێشان مایەی بێ دەسەڵاتی‌یە.**

○ تحمّل شرمندگی نشانهٔ بی لیاقتی است.

● **واتە:** مرۆڤ ئەگەر غیرەتی بێ، کار ئەکاو دەسی نیاز بۆ لای کەسان راناکێشێ.

**۳۵ـ رێبوار بخەفێ جێ‌ئەمێنێ.**

○ اگر مسافر بخوابد از کاروان باز می‌ماند.

خواب نوشین بامداد رحـیل　　　　بـاز دارد پـیادەرا ز سـبیل

(سعدی)

● **واتە:** غافڵ مەبە، با جێ‌نەمێنی.

**۳۶ـ رێخ بورگێ لە رۆخانە، هەر خوێش خاسە لە بێگانە.**

○ اگر سنگریزه از رودخانه قطع شود، باز هم قوم و خویش از بیگانه بهتر است.

● **واتە:** خوێش هەرچی بێ هەر دڵسۆزی‌یەکی بۆ قەوم و کەسی خۆی هەیە.

**۳۷ـ رێخ کەفتگەسە کڵاشی.**

○ سنگریزه در گیوهٔ او افتاده است.

● **واته:** قەرار و ئارامی لێ براوە.

**۳۸- ڕێخۆڵەم ڕژیاگەسە زەوی.**

○ رودەام بر زمین ریختە است.

● یەکێک ئەمە ئێژێ کە منالی زۆری بێ و دەور و بەریان گرتبێ و نەتوانێ بەم لاو بەو لادا بڕوا.

یان قسەی دەوڵەمەنێکە وا لە بەر سەروەتە پرژ و بڵاوەکەی نەتوانێ بە هیچ لایەک دا بڕوا.

**۳۹- ڕێزەوڵ ماڵ خوەت مەدە بە پڵاو و خوەرشت مەردم.**

○ ریزە نان خانهٔ خودت را با پلو و خورش دیگران عوض مکن.

● **واته:** بە کەم و کەسری خۆت قەناعەت بکەو روو مەخەرە درگای مەردم.

**۴۰- ڕێسمان بوو بە خوری.**

○ رشتەهامان پشم شد.

● **واته:** هەرچیمان کردبوو، دیسان بوو ۆ بە خۆی.

**۴۱- ڕێس وگورێسە!**

○ ریس وطناب است

● بە درێژ دڕی و حاشیە و پەراوێزی بێ سوود لە قسەی کەسێکدا ئەوترێ.

**۴۲- ریش بوو بە ریشەو ئەشێ شانەی بۆ هەڵگریت.**

○ ریش وقتی کە درآمد باید برای آن شانە برداری.

● **واته:** ئەگەر مرۆڤ تووشی سەخڵەتێک بوو، ئەبێ لە بیری چارەسەر کردنیا بێ.

**۴۳- ریش تەماعکار بە قنگ موفلیس!**

○ ریش طمعکار بە کون مفلس.

● بە یەکێکی تەماعکار ئەوترێ کە موفلیسێ ماڵەکەی خواردبێ و نەیبێ پێی بداتۆ.

**۴۴- ریشم لە بەر خوەرا چەرمگ نەکردگە.**

○ ریشم را جلو آفتاب سفید نکرده‌ام.

● **واته:** دنیایه‌کم دیوه و ته‌جروبه‌م هه‌یه.

**۴۵ـ ریش و قه‌یچی ها به ده‌س خوه‌تۆ.**

○ ریش و قیچی در دست خودت است.

● **واته:** خۆت ئه‌زانی له‌م باره‌وه چی ئه‌که‌ی بیکه‌و ئیختیار به خۆته.

**۴۶ـ ریشه‌ی به‌ستگه، به سووسه با هه‌ڵناکه‌نگێ.**

○ ریشه گرفته است، با باد ملایم از جا کنده نمی‌شود.

● **واته:** بنجی دا کوتاوه، به زۆر نه‌بێ، لا ناچێ.

**۴۷ـ رێگه باریک، شه‌و تاریک.**

○ راه باریک، شب تاریک.

● **واته:** ته‌نگانه‌یه و دنیا به‌کام نی‌یه.

**۴۸ـ رێگه بێ رووین نابرگێ.**

○ راه بدون رفتن، طی نمی‌شود.

● **واته:** تا ده‌سی پێ‌نه‌که‌ی، کاره‌که‌ت له به‌ر ناچێ.

**۴۹ـ رێگه‌ی درۆ نزیکه،**

○ راه دروغ نزدیک است.

● **واته:** به درۆ دڵی مرۆڤ زوو خۆش ئه‌بێ به‌ڵام ئاکامی نی‌یه.

**۵۰ـ رێوی ئه‌یوت: نه‌یه‌ژن بۆ خوه‌ی وا ئێژێ، کولانه‌ی مامر له حه‌وشاوێت خاستره!**

○ روباه می‌گفت: نگوئید به نفع خودش حرف می‌زند، لانهٔ مرغ در حیاط باشد، بهتر است.

● به یه‌کێک ئه‌وترێ که له هه‌ر ته‌دبیرێکدا وا بۆ خه‌ڵکی ئه‌کا، خێری خۆی له پێشدا له به‌ر چاو بگرێ.

**٥١- ڕێوی دەرۆ و شێر ماڵ.**

○ روباه بیرون و شیرخانه.

● بە یە کێک ئەوترێ کە لە دەرەوەی ماڵ بە کەس نەوێرێ، بەڵام لە ماڵەوە بە سەر ماڵ و مناڵیا زاڵ بێ.

**٥٢- ڕێوی گەریە لە شێر خەفتگ خاسترە.**

○ روباه سیّاح از شیر خوابیده بهتر است.

● **واتـە:** مرۆڤی دنیا دیدەو بەتەجروبە، لە خانونشینی خۆ بـەزل زان وبـێ تەجروبە چاکترە.

**٥٣- ڕێوی لە حەنای منا بووەسە شێر.**

○ روباه در برابر من شیر شده است.

● **واتە:** ئەونە نەگبەتمە، هەر خوێڕی‌یەک لێم بووە بە شێر.

**٥٤- ڕێوی لەکونای خوەی هەڵگەڕێتەوگەر ئەوێ.**

○ روباه از سوراخ خودش بازپس گردد گر می‌شود.

● بە یە کێک ئەوترێ دەس لەگەل و نەتەوە و دۆست و قەوم و کەسێ خۆی هەڵگرێ و پاڵ بدات بە بێگانەوە و لە ئاکامدا بێگانەیش بڕوای پێ نەمێنێ و پشتی لێ هەڵکاو ناچار تەفر و تووناى وڵاتان بوێ.

**٥٥- ڕێوی نە ئەچوو بەکونا هەژگێکیشی ئەبەست بە جوجکەیەوا**

○ روباه در سوراخ فرو نمی‌رفت، خار بُنی هم به دمش می‌بست.

● **واتە:** کابرایان ڕێگەی ئەو جێگە نەئەدا، یەکێکی تریشی خستبوە دوای خۆی.

**٥٦- ڕێوی هاتگە سە پیری‌یەو.**

○ روباه به استقبال او آمده است.

● **واتە:** بەخت رووی تێ ئەکا.

**٥٧- ڕێوی هەتا قەواڵەی خوەی خوەندۆ کەوڵیان کەند.**

○ روباه تا قبالهٔ خود را خواند، پوستش را کندند.

● لەکاتێکدا ئەوترێ کە مەجالی دیفاع لە خۆ نەبێ و ئەگەر دیفاع بکرێ گیانی مرۆڤ بکەوێتە مەترسی‌یەوە.

# ز

۱- **زاڵم ئاوی سەر بەرەو ژوور ئەروێت.**

○ ظالم، آب جويش رو به بالا می‌رود.

● **واتە:** کاری زاڵم پێچەوانەی کاری هەموو کەسە.

۲- **زاڵم بوێتە پرد، بە سەریا مەڕۆ.**

○ ظالم بشود پل، بر روی آن عبور مكن.

● **واتە:** بە هیچ چتێکی زاڵم باوەڕ مەکە تەنانەت بە پیاوەتیشی.

۳- **زاڵم زەواڵی بۆ هەس.**

○ ظالم زوال می‌يابد.

● **واتە:** زاڵم لە ئاکام داگیرۆدەی زوڵمی خۆی ئەبێ.

۴- **زام باسام و تیر قۆلانچە!**

▣ بڕوا بۆ پەندی دوایی (۵)

۵- **زام شمشێر و تیر قۆلانچە!**

○ زخم شمشير و تير سوسک.

● **واتە:** ئەو دوو چتە دوورن لەیەک. وەختێ ئەوترێ کە یەکێک لە دەس دەرد و ئێشێکی بچووک هاوار بکات، لە حاڵێکدا زۆر گرینگ نەبێ؛جا پێی ئێژن ئەو دەردەت وەکوو تیری قۆلانچەیە کە تۆ وەکوو زامی شمشێر بۆی ئەڕوانی.

**۶- زامن یا دەس بەکیسە یا دەس بە یەخە!**

○ ضامن یا دست در کیسه یا دست به یقه!

● **واتە:** زامن یا ئەبێ پارەی ئەو زەمانەتە بدا واکردوویەتی، یا ئەبێ دەس بداتە یەخەی کابرای زەمانەت‌کراو و تەحویلی مەحکەمەی بدا تا خۆی نەجاتی بێ.

**۷- زانا بە ئیشارە و نەزان بەکوتەک!**

○ دانا به اشاره و نادان به کتک.

● **واتە:** زانا زوو حاڵی ئەبێ و نەزان مەگەر تێی سرەوێنی تا حاڵی بێ.

**۸- زک برسی ئیمانی نی‌یە!**

○ شکم گرسنه ایمان ندارد.

● **واتە:** مرۆڤی موحتاج، بیری ھا بە لای دەس تەنگی و ھەژاری خۆیەوە و کاری عیبادی کە پێویستی بە ئاسوودە بوونی فیکرەوە ھەیە، بۆی رێک ناکەوێ.

**۹- زک برسی خوا ناناسێ.**

○ شکم گرسنه خدا را نمی‌شناسد.

◙ بڕوانە بۆ پەندی ژمارە (۸)

**۱۰- زک تۆشە ھەڵناگرێ.**

○ شکم ذخیره بر نمی‌دارد.

● **واتە:** ئەوەی کەمرۆڤ ئێستا ئەیخوا، ئەو لە نەخواردنی ژەمێکی تر بێ‌نیاز ناکا.

**۱۱- زک تێر ئاگای لە زک برسی نی‌یە.**

○ شکم سیر از شکم گرسنه خبر ندارد.

● **واتە:** کەسانی بێ‌نیاز کەی وان لە بیری ھەژارانی برسی‌دا؟

**۱۲- زکێ تێرین و ھەزار زک برسی!**

○ یک شکم سیر ھستیم و ھزار شکم گرسنه.

● **واتە:** تا رۆژێ خۆشمان بێ ھەزار رۆژ واین لە تاڵی و ھەژاری و دەس تەنگیدا.

**١٣ـ زمسان بە پینە و پەرۆ، بەهار بە تەنکە مەرۆ.**

○ زمستان با وصله و پینه، بهار با لباس آراسته و شیک.

● **واتە:** زمسان ئەگەر جل و بەرگە کەیشت کۆنە و پینە بێ قەیدی نی‌یە و سەرمایە و کەس بۆت ناڕوانێ؛ بەڵام بەهار وەختی خۆ پیشان دانە و جل و بەرگ ئەبێ ئاراستە و ڕێك و پێك بێ.

**١٤ـ زمسان تەواو بوو، ڕوورەشی بۆ زوخاڵ ماوە.**

○ زمستان به پایان رسید و روسیاهی برای زغال باقی ماند.

● **واتە:** ئەو گیر و گرفتە بە سەر چوو، خەجاڵەتی بۆ ئاژاوەگێڕ و شەڕ هەڵگرسێنەر ماوەتەوە.

**١٥ـ زمسان سەروەشێن نەوێ کلك وەشێنە.**

○ زمستان با سر ضربه نزند، با دُم ضربه خواهد زد.

● **واتە:** ئەگەر زمسان لە ئەوەڵدا خۆی نیشان نەدا، لە ئاخردا هەر زەبری خۆی ئەوەشێنێ.

**١٦ـ زمسان شەوێ پیران تەوێ.**

○ زمستان را شبی و پیران را تبی کافی است.

● **واتە:** لە زمسانا ئەگەر شەوێکیش باش بباریێ قەرەبووی نەبارین ئەکاتەوە ومرۆڤی پیریش ئەگەر دووچاری لەرز و یاوێك بێ، جێگەی مەترسی‌یە.

**١٧ـ زمسان هات و جل و بەرگ فەقیر دریا.**

○ زمستان فرا رسید و لباس فقیر پاره شد.

● **واتە:** وەرزی سەرما هات و هەژاری ڕەش و ڕووت ئەبێ لە سەرمادا بلەرزێ!

**١٨ـ زوان ئامانە!**

○ زبان امان است.

● **واتە:** ڕۆژگارێکی پڕ لە مەترسی‌یە و مرۆڤ ئەبێ بیری بە لای قسەکردنی خۆیەوە بێ.

**۱۹ـ زوان‌باز قسه له دڵیا جێگه ناگرێ.**

○ یاوه سرا، راز نگه‌دار نیست.

● **واته:** مرۆڤی زۆربێژ و درۆزن راز راگیرکه‌ر نی‌یه.

**۲۰ـ زوان بێڵێت (یا، بوێسێ) سه‌ر سڵامه‌ته.**

○ زبان بگذارد، سر سلامت است.

● **واته:** مرۆڤ ئه‌بێ بیری به لای قسه‌کردنی خۆیه‌وه بێ و هه‌رچی ئه‌زانێ له هه‌موو لایه‌کدا نه‌یه‌ژێ تا موشکله‌ی بۆ دروس نه‌بێ.

**۲۱ـ زوان خوه‌ش له به‌هه‌شته‌و هاتگه.**

○ زبان خوش از بهشت آمده است.

● **واته:** زمانی خۆش بۆنی به‌هه‌شت ئه‌دا.

**۲۲ـ زوان خوه‌ش مار له‌کون ده‌رتێرێت.**

○ زبان خوش مار را از سوراخ بیرون می‌آورد.

● **واته:** مرۆڤێ که زمانی خۆش بێ، دوژمنیشی پێوه نزیک ئه‌بێته‌وه.

**۲۳ـ زوانی له ته‌ک سه‌ریا بازی ئه‌کا.**

○ زبانش با سرش بازی می‌کند.

● **واته:** به قسه‌ی بێ حیساب، گیانی خۆی ئه‌خاته مه‌ترسی‌یه‌وه.

**۲۴ـ زۆر بوێ قه‌واڵه به‌تاڵه!**

○ زور باشد قباله باطل است!

● **واته:** زوان و ده‌سی زۆر پێویستی به قسه‌و بورهان نی‌یه!

**۲۵ـ زۆر بێرا بۆ سه‌گ به ئه‌نازه‌ی تانجی‌یه‌ک رائه‌کا.**

○ سگ را به زور وادار کن به اندازهٔ یک تازی می‌دود.

● **واته:** له ته‌نگانه‌ی ژیاندا زۆر چتی دوور له باوه‌ڕ روو ئه‌دا.

**۲۶ـ زۆره ملێ، مل‌شکیان ها به شوێنیه‌و.**

○ گردن کلفتی کردن، گردن شکستن به دنبال دارد.

● **واتە:** ئاکامی مل‌ملەکانێ و زۆر پێشان‌دان، مەرگە.

**۲۷ـ زەبوون گیری شێوەی نامەردی‌یە.**

○ زبون گیری شیوهٔ نامردی است.

● **واتە:** مرۆڤی جوامێر زەبوون کوژ نی‌یە و ئەوە کاری نامەردانە.

**۲۸ـ زەخم ئەوەشنێ و تیماریچی ئەکا!**

○ زخم می‌زند و آن را نیز مداوا می‌کند.

● **واتە:** هەم نێشی هەیە و هەم نۆش.

**۲۹ـ زەخم شمشێر سارێژ ئەوێ، زەخم زوان هەر ئەمێنێ.**

○ زخم شمشیر بهبود می‌یابد، زخم زبان همچنان باقی می‌ماند.

● **واتە:** قسەی تاڵ هەر لە بیر ناچێتۆ.

**۳۰ـ زەرمان داگە و بەڵامان سەندگە!**

○ پول داده‌ایم و بلا خریده‌ایم.

● بە بووکێکی بەدخۆ و بێ‌حەیا ئەوترێ.

**۳۱ـ زەر، وەبان خەزانە ئەچێ.**

○ زر روی خزانه میرود.

● **واتە:** هەر دەوڵەمەنە و شانس و ئیقباڵ رووی تێ ئە کا.

**۳۲ـ زەرەر تێت و مایە ئەوا!**

○ ضرر می‌آید و سرمایه را می‌برد.

● **واتە:** ئەم موعامەلە هیچ خێری تێدا نابێ و دەس‌مایەکەیش لە بەین ئەچێ.

**۳۳ـ زەرەر لە نیمەیش بگەرێتۆ،هەر خێرە.**

○ ضرر از نیمه هم برگردد، سود است.

● **واتە:** ئەگەر تووشی زەرەر بووی، زووتر بەری بگرە با درێژە نەسێنێ.

**۳۴- زەریف یا لە حمام یا لە خەو.**

○ زیبارو یا در حمّام یا در خواب معلوم می‌شود.

● **واتە:** مرۆڤی جوان و ڕێکە و پێک لە حەمام و لە خەودا دەرلەکەوێ.

**۳۵- زەماوەن دێزەس و گۆزە هەڵلەپەرێ.**

○ عروسی خُمچه است و گوزه می‌رقصد.

● **واتە:** ئیش هی کەسێکی ترە و یەکێ تر سەر خۆی پێوە قاڵ کردووە.

**۳۶- زەماوەن سەگ و گورگ، شیوەن شوالە.**

○ جفتگیری سگ و گرگ، عزای چوپان است.

● **واتە:** دۆستایەتی نهێنی ئەندامی ماڵ لەگەڵ دوژمنی ئەو ماڵەدا، ئەبێ بە هۆی کۆسپێکی گەورە بۆ ئەو بنەماڵە. بینراوە سەگی لای‌ران، لەگەڵ گورگەدا جووت بووگن و هەر بەو بۆنەوە، گورگەکە فێری رانەکە بووە و لێی خواردووە بێ ئەوەی سەگەکە لێی وەڕی بێ و لە ئاکامدا شوان ماڵ وێران بووە.

**۳۷- زەلگ ئێژێ بشکم وەلێ نەزرم!**

○ زلگ می‌گوید بشکنم ولی بد نام نشوم.

● **واتە:** مردن لە رسوایی و بەد ناوی باشترە.

**۳۸- زەنگۆڵەی پای تاوت.**

○ زنگولهٔ پای تابوت.

● بە منالی وردی ژن یا پیاوێکی پیر و پڕ تەمەن ئەوترێ.

**۳۹- زەوی ئەزێنە!**

○ زمین بی‌حس شدن است.

● بە هەوای ساردی زمسان ئەوترێ.

**۴۰- زەوی سفتە و ئەم گا لە چاو ئەو گایەو ئەزانێ.**

○ زمین سخت است و این گاو تقصیر را به عهدهٔ آن گاو می‌اندازد.

● **واتە:** نەفسی ئیشەکە سەختە و خەڵکی یەکتری بە خەتابار ئەزانن.

**۴۱- زەوی سەختە، کار وەگا ئەگرن.**

○ زمین سفت است، گاو را به کار می‌گیرند.

● **واته:** بۆ کاری سەخت و دژوار ئەو کەسەیان گەرە کە.

**۴۲- زەوی سەختە وگا لە گا تاوان ئەگرێت.**

◙ وەکوو پەندی ژمارە (۴۰)

**۴۳- زەوین فرەس، قەور بە ئەنازە.**

○ زمین زیاد است، گور به اندازه.

● **واته:** هەموو چتێ ئەندازەی خۆی هەیە، ئەگەرچی ئەو چتە زۆریش بێ.

**۴۴- زەوی نەیرەنجنی، ئەترەنجنێ.**

○ زمین را نرنجانی، تو را می‌رنجاند.

● **واته:** کاری فەلایی پێویستی بە شیف بڕین و ژێر و روو کردنی زەوینە، تا بەهرەی لێ وەربگرێ، ئەگینا سووک تێوە چوون لە کاری فەلایی دا، ماڵ وێرانی ها بە دوایۆ.

**۴۵- زێراوی کێشیاگەسەو.**

○ زیرآبش کشیده شده است.

● **واته:** مەترسی لێناکرێ.

**۴۶- زینگ کوژ و مردگ پەرس.**

○ زنده کش و مرده پرست.

● **واته:** بۆ زیندووەکانمان هیچ بایەخێ دانانێین و لێیان ناپرسین تا ئەمرن دوای ئەوەی کە مردن شین و شەپۆڕ و بانگ و رۆیان بۆ ئەکەین و بە شاخ و باڵیاندا دێین.

**۱- ژژک ئیژێ لە بەچکەی من نەرم و شل‌تر نی‌یە.**

○ جوجه تیغی می‌گوید از بچهٔ من نرم و شُل‌تر وجود ندارد.

همه کس را عقل خود بکمال نماید و فرزند خود بجمال. (گلستان سعدی)

● **واتە:** هیچ کەس و هیچ گیان لەبەرێ، بێچووی خۆی بە هیچ چتێ ناگۆڕێتۆ.

**۲- ژژگ بە بەچکەی خوەی ئیژێ چەنێ نەرم و شلی!**

○ جوجه تیغی به بچّهٔ خود می‌گوید چقدر نرم و شُل هستی.

▣ بڕوانە بۆ پەندی ژمارە (۱)

**۳- ژن بریکی ژانە، مێمڵ دۆڵە نانە!**

○ بعضی از زنها دردآفرین‌اند، و بلای آذوقهٔ خانه.

● **واتە:** ژنی خراپ باری گیانی شوو قورس‌تر ئەکا.

**۴- ژن بەد خۆ لە ماڵتا، ئاگر بەتین لە پاڵتا.**

○ زن بد اخلاق در خانه‌ات، مانند آتش پر حرارتی است که در کنارت باشد.

● **واتە:** ژنی شەڕاشۆ و سەڵیتە لە ماڵا وەکوو ئاگری تیژە و ئەت سوتێنێ.

**۵- ژن بەرە ژن مردگ، گا بەرە گا مردگ.**

○ زن بده به زن مرده، گاو بده به گاو مرده.

● **واتە:** قەدری چت، کەسێ ئەیزانێ کە ئەو چتەی بووبێ و لە دەسی دابێ.

**۶- ژنت بزایەت و بانت تکە بکات و قەرزاریچ بەر درگات پیْبگریْت!**

○ زنت وضع حمله کند و بام خانه‌ات نیز چکّه بکند و طلبکار نیز دم دَرِ خانه‌ات را بگیرد.

● ئەمە سێ کۆسپی گرانە و یا خوا پێکەوە روو نە کاتە کەس.

**۷- ژن بێ شوو هار ئەوێت، پیاگ بێ ژن هەژار ئەوێت.**

○ زن شوهر مرده هار می‌شود، مرد زن مرده نزار.

● **واتە:** ژنی شوو مردوو بە سەربەستی هەرچی مەیلیەتی ئەیکا، بەڵام پیاوی ژن مردوو دەسە پاچە و هەناسە سارد دائە کەوێ و کەس لای لێ ناکاتۆ.

**۸- ژن بێ شوو هار ئەوێت، کور بێ باوک هەژار ئەوێت.**

○ زن شوهر مرده هار می‌شود، پسر پدر مرده نزار.

● **واتە:** ژنی شوو مردوو رێگەی بۆ باز ئەبێ هەرچی بکات و کەس نی‌یە بەرێ بگرێ؛ بەڵام منالّی بێ باوك هەژار و هەتیو ئە کەوێ.

**۹- ژن تا نەزایە، بیگانەس.**

○ زن تا بچّه نزاید، بیگانه است.

● **واتە:** وەختێ منالّ کەوتە بەین باوك‌و دایک، ئەوسا ئەوان لە پەیوەندی خۆیان دڵنیا ئەبن.

**۱۰- ژن شەریکی بوێ، بەڵام مالّ شەریکی نەوێ.**

○ زن مشترک داشتن بهتر از خانه و ثروت اشتراکی است.

● **واتە:** مالّ شەریکی عاقیبەتی شەڕ و نە گبەتە.

**۱۱- ژن نان وشک بخوا، بەڵام هەوەی نەوێ!**

○ زن نان خالی بخورد امّا هوو نداشته باشد.

● **واتە:** ژن حازرە هەموو رەنجێ بکێشێ بەڵام ژن نەیەتە سەری.

**۱۲- ژن نی‌یە ژانە! مێمڵ دۆڵەی نانە.**

○ زن نیست، درد و بلا است، قاتل خوراک خانه است.

● بە ژنێکی وەرهەم و بەد زات ئەوترێ.

**١٣ـ ژن و تفەنگ و ئەسپ وەفایان نی‌یە.**

○ زن و تفنگ و اسب وفا ندارند.

● **واتە:** ئەو سێ چتە دوای مردنی خاوەنەکەیان ئەبن بە موڵکی کەسێکی تر.

**١٤ـ ژن و ماڵیان وتگە، نەک پیاگ و ماڵ.**

○ زن و خانە گفته‌اند، نه مرد و خانه.

● **واتە:** ژن ماڵ ئەکا بە ماڵ نەك پیاو.

**١٥ـ ژن وەسە هەنگ، یا هەنگوێنت پێ ئەدا یا پێتەو ئەدا.**

○ زن مثل زنبور عسل است، یا به تو عسل می‌دهد یا تو را نیش می‌زند.

● **واتە:** ژن هەم نێشی هەیە بۆ شوو هەم نۆش.

**١٦ـ ژن و هەنی ناتوانی بناسی.**

○ زن و هندوانه را نمی‌توانی بشناسی.

● **واتە:** خۆی ژن لەکاتی ژیاندا بۆ پیاو دەرئەکەوێ و شووتیش کاتێ‌کە قاشی ئەکەی ئەزانی چۆنە.

**١٧ـ ژنیان وتگە بە زوڵفەو، گۆزەیان وتگە بە قوڵفەو.**

○ زن و زلف گفته‌اند و کوزه و دسته.

● **واتە:** ژن بە قژەوە جوانە و گۆزەیش بە دەستەوە.

**١٨ـ ژێر بەنە زوان و ژێر دێزە ئاگر.**

○ زبان، آدمی را می‌شناساند و آتش، دیگ را.

● **واتە:** زوان ئەبێ بە سەبەبی ناساندنی مرۆڤ و ئاگریش ئەبێ بە سەبەبی ناساندنی دێزەو ئەوەی وا ها لە ناو دێزەدا.

**عەرەب ئەڵێ:** (اَلْمرءُ مَخْبوءٌ تحتَ لِسانِهِ).

مرۆڤ لە ژێر زمانی خۆیدا شاراوەتەوە.

# ■ س

١- **ساقمان بەکۆڵ کەر ئەگەرێ!**

○ سالم جمع ما، سوار بر الاغ می‌تواند راه می‌رود.

● **واتە:** هەموومان نەخۆشین و ساقمان تێدا نی‌یە.

٢- **ساڵانت خایان مانگانیش بخایەنە.**

○ سالها صبر کردی، چند ماه دیگر نیز صبر کن.

● **واتە:** تا ئێستا سەبرت کردووە، چەندێ‌تریش سەبر بکە، بە ئاکام ئەگەی.

٣- **ساڵ بە ساڵ خوەزگە بە پار.**

○ سال بە سال خوشا بە پارسال.

● **واتە:** رۆژگار هەرچی پێش ئەچێ ناخۆشتر ئەبێ.

٤- **ساڵ لە ئەوەڵ بەهارەو دیارە.**

○ سال از اوّل بهار پیداست.

● **واتە:** چۆنیەتی هەر چتێ لە ئەوەڵەوە خۆی پیشان ئەدا.

٥- **ساڵێ دۆمیان کرد بە قێخا ئەچوو دایک خوەی ...**

○ سالی گیوە دوز را کدخدا کردە بودند، می‌رفت مادر خودش را ....

● **واتە:** مرۆڤی بێ نرخ و پووچ ئەگەر هەلێکی بۆ بڕەخسێ، لە هیچ کارێکی خراپ و بێ شەرمانە لانادا.

**٦ـ ساو سووره، دڵبەره، کاسە نەشۆره، ماڵ وێران کەره!**

○ سیب سرخ است، دلربا است، ولی کاسه منزل را نمی‌شوید و خانه خراب کن است.

● به ئافرەتێکی جوان و دڵڕفێن ئەوترێ کە سەری لە ماڵداری دەرنەچێ.

**٧ـ ساون ئەدەن لە ژێر پای.**

○ صابون به زیر پایش می‌زنند.

● **واته:** فریوی ئەدەن؛ ئەی خەڵەتێنن.

**٨ـ ساون بە لە زکت!**

○ صابون به شکمت بزن!

● بە تەوس ئەوترێ بە کەسێ واته: دڵ خۆت خۆش کە بەشت ئەدەن! ئەی نایدەن؟

**٩ـ سایلەش دەم ئەسوتنێ!**

○ کاچی هم دهان را می‌سوزاند.

● بە تەوس ئەوترێ بە کەسێکی بێ حاڵ وهیچ نەتوان واته بێژی تۆیش کارێکت لە دەس بێ؟

**١٠ـ سپێ لە گیرفانیا، تاق و جفت ئەکا.**

○ شپش در جیبش بازی می‌کند.

● **واته:** زۆر هەژار و دەس تەنگە.

**یا ئەڵێن:** سپێ (ئەسپێ) لە گیرفانیا موناجات ئە کا،

سپێ لە ماڵیا موناجات ئە کا.

**١١ـ سر خوەم و تر خوەم.**

○ راز خودم و باد شکم خودم.

● **واته:** با هیچ کەس لە کار و باری من تێ نە گا.

**١٢ـ سرکە لە ناو چاوی ئەوارێ!**

○ سرکه از چهره‌اش می‌بارد!

● **واته:** زۆر توورەیە.

**۱۳ـ سرکه هەرچی تورش بێت بۆ دەبەی خوەی زەرەری هەس.**

○ سرکه هر قدر ترش باشد برای ظرف خودش ضرر دارد.

● **واته:** مرۆڤی بەدزات بەر لە هەموو کەس زەرەر لە خۆی ئەدا.

**۱۴ـ سزای گرانجان، لێ نەسەندنە.**

○ سزای گران فروش، ترک معامله با اوست.

● **واته:** لە گرانفرۆش چت مەسێنە تا بە جەزای کردەوەی گرانفرۆشی خۆی بگا.

**۱۵ـ سفرەی پر، ئاشتی ماڵە.**

○ سفرهٔ پر آشتی خانه است.

● **واته:** لە ماڵێکداکە ئەهلەکەی تێروتەسەل بن، شەڕ وئاژاوە نی‌یە.

**۱۶ـ سفرەی خاڵی فاتحەی نی‌یە.**

○ سفره خالی فاتحه ندارد.

● **واته:** هیچ کەس بۆ مەرگی هەژار فاتیحە ناخوێنێ چونکە نان و گۆشتێ نی‌یە لە ماڵیا بیدەن بە فاتیحە خوێن!

**۱۷ـ سک برسی، ئیمانی نی‌یە.**

○ شکم گرسنه، ایمان ندارد.

▣ **وەکوو:** پیتی «ز»زک برسی ئیمانی نی‌یە. ژمارەی (۸)**یا ئێژن:** سك برسی، خواناناسێ.

**۱۸ـ سکێکم کرد کور بوو، ئەویش لە بار چووا!**

○ وضع حملی کردم پسر بود ؛ آن هم سقط شد.

● **واته:** کارێکم کرد و چاوەڕوان بووم کەڵکم لێ وەر بگرتبایە، بەڵام بە هیچ دەرچوو.

**۱۹ـ سڵام کوردە بێ تەماع نی‌یە!**

○ سلام کُرده بی طمع نیست!
● به یه‌کێک ئه‌وترێ که به چاوی ته‌ماعه‌وه رێز و ئیحتیرام له‌که‌سێ بگرێ.

**۲۰ـ سم سم که‌ره و چنگ چنگ یاسێ، من له‌م کاره سه‌رم ئه‌ماسێ!**
○ سُم سُم خر است و اثر دست از یاسمن است، من از این کار سرسام گرفته‌ام.
● **واته:** رواڵه‌تی کاره که له‌گه‌ڵ نه‌فسی عه‌مه‌له‌که‌دا، یه‌ک ناگرن و جێی سه‌ر سوورِمانه!
**ئه‌گێرنه‌وه:** کچێ بووه به ناوی یاسه‌مه‌ن و «یاسێ» بانگیان لێ کردووه، دایکی خۆی نه‌بووه و به لای باوه‌ژنه‌وه بووه؛ باوه‌ژنه زۆر سه‌رچه‌نگی داوه و له خواردن درێغی لێ کردووه؛ یاسێ له هه‌ر هه‌لێکدا که بۆی ده‌سی داوێ، دوورله چاوی باوه‌ژنیه‌وه چتێکی خواردووه. رۆژێ باوه‌ژنی ئه‌چێ بۆ ده‌رۆ و به‌ر له رۆیشتن به «یاسێ» ئێژێ: ده‌س له‌و که‌ره له ناو ئه‌و دێزه‌دا نه‌ده‌یت وا له‌و ژووره‌وه دام ناوه. باوه‌ژنه، ناوی ژووره‌که‌یشی نه‌رمه سواخێ کێشاوه تا یاسێ نه‌توانێ به سه‌ریا بڕوا و له‌و که‌ره بخوا! ئینجا که باوه‌ژن ئه‌ڕوا بۆ ده‌رۆ، یاسێ دڵی که‌ڵکه‌ڵه‌ی که‌ره ئه‌کا و چی بکه‌م چی نه‌که‌م، ئه‌چێ که‌رێکیان له‌گه‌وڕا ئه‌بێ ئه‌ی هێنێ و سواری ئه‌بێ و به سواری وڵاخه‌که ئه‌چێ بۆ سه‌ر دێزه‌ی که‌ره و ده‌س ئه‌با و چنگێ که‌ره ده‌ردێنێ و هه‌ر به سواری ئه‌گه‌ڕێته‌وه. دوای ماوه‌یه‌ک باوه‌ژن دێته‌وه و ئه‌ڕوا بۆ لای دێزه‌ی که‌ره، ئه‌بینێ سمی وڵاخه‌که له ناو دیوه‌که‌دا شوێنی خستووه و بۆ لای دێزه‌که چووه، وه‌ختێ بۆ که‌ره ئه‌ڕوانێ ئه‌بینێ شوێنی چنگی یاسێ له سه‌ر تۆپه‌ڵه‌که‌ره‌که جێ‌ماوه! زۆر سه‌ری سوورِ ئه‌مێنێ و نازانێ ئه‌مه چ کاره‌ساتێکه رووی داوه! جا ئێژێ: سم سم که‌ره و چنگ چنگ یاسێ، من له‌م کاره سه‌رم ئه‌ماسێ!

**۲۱ـ سوار، ئه‌سپ خوه‌ی ئه‌ناسێ.**
○ سوار کار، اسب خودش را می‌شناسد.
● **واته:** ئه‌و که‌سه‌ی وا له‌کارێکدا شاره‌زایه، ئامرازی کاری خۆی باش ئه‌ناسێ.

**۲۲ـ سوار بوون عه‌یبێک و داوه‌زین دوو عه‌یب!**
○ سوار شدن یک عیب و پیاده شدن دو عیب!
● به یه‌کێک ئه‌وترێ که کارێکی خراپی کردبێ و په‌شیمان بێته‌وه و په‌شیمانیه‌که‌یشی

هەر عەیب بێ.

۲۳- **سوار تا لە سواری نەکەوێتە خوارۆ، ناوێ بە سوار.**

○ سوار کار تا از اسب بر زمین نیفتد، سوار کار ماهر نخواهد شد.

● **واتە:** بۆ پوختە بوون لە هەموو کارێکدا عەزیەت کێشان پێویستە.

**یا وتوویانە:** سوار تا نەگلێت، ناوێ بە سوار.

۲۴- **سوار لە پیادە خەوەری نی‌یە.**

○ سوارە از پیادە خبر ندارد.

● **واتە:** ئەوەی هەیەتی، بێ خەبەرە لەوەی وا نی‌یەتی.

۲۵- **سوار لە سەر زین تێرێتە خوارۆ!**

○ سوار را از روی زین پایین می‌کشد!

● **واتە:** زۆر بێ‌حەیا و دڕندەیە.

۲۶- **سوار و پیادە مەیلیان بێ دەس و مشتاق ئەکەن.**

○ سوار و پیادە اگر تمایل داشتە باشند، بە هم دست می‌دهند.

● **واتە:** دۆستی، پێویستی بە رەزامەندی دوو تەرف هەیە.

۲۷- **سوار هەر سوارە و پیادەیش هەر پیادە.**

○ سوار سوار است و پیادە نیز پیادە است.

● **واتە:** ئەوەی وا هەیەتی هەر ئەیبێ و ئەوەی وا نەی‌بووە هەر نایبێ.

۲۸- **سواڵ‌کەریش لەتەوچنی هەس.**

○ گدائی نیز ریزە جمع کردن دارد.

● **واتە:** لە هەموو کارێکدا خراپتر لە خراپیش هەیە.

۲۹- **سورنا بەرە دەس ناشیۆ، پف ئەکابە سەرە گەورەکەیا!**

○ سرنا بە دست ناشی بدە، در دهانۀ بزرگ آن می‌دمد.

● **واتە:** مرۆڤی ناشارەزا لە ئیشێکدا، بەپێچەوانە بۆی ئەچێ.

**یا ئەڵێن:** سورِنایان دا بە دەس ناشیەو، فووی کردە سەرە گەورە کەیا.

**٣٠- سۆ، لە سۆ ئەچێ و گلۆڵە، لە پۆ.**

○ سوراخ سوزن شبیه سوراخ سوزن است و گلوله شبیه پود است.

● **واتە:** ئەم چتە، لەو چتە ئەچێ.

سۆ: کونی دەرزی.

**٣١- سۆنە، لە ئاو ئەترسنێ!**

○ مرغابی را از آب می‌ترساند.

● **واتە:** مرۆڤی بە تەجروبە و زیرەك لەو کارە ناترسێ.

**٣٢- سووری دی سەمای لە بیرۆ چووا!**

○ سرخ را دید و رقص را فراموش کرد.

● بە یەکێك ئەوترێ کە کەسێکی جوان ببینێ و دڵ خوازی پێشوی لەبیر بچێتۆ.

**٣٣- سووک برۆ و سڵامەت بێرِۆ.**

○ آرام برو و سالم برگرد.

● **واتە:** لە ئیشدا پەلە مە کە با تووشی بەڵا نەبی.

**٣٤- سەد چەقۆ دروس ئەکا دەسەی لێ نانێ!**

○ صد چاقوی بی دسته درست می‌کند!

● بە یەکێکی ساختەچی و زۆر درۆزن ئەوترێ.

**٣٥- سەد حەکیم ئەونەی دەردەدارێ نازانێ.**

○ صد پزشک به اندازهٔ یک مریض نمی‌داند.

● **واتە:** دەردەدار چاکتر ئەزانێ کوێنەی ئێشێ.

**٣٦- سەد ساڵ بە پەسەنی، هەر ئەچێتە و سەر نانۆچنی.**

○ اگر صد سال نیزمورد پسند واقع شود، بالاخره برمی‌گردد به همان آداب چوپانی و نان جمع کردن.

● **واتە:** مرۆڤی ناوەجاخ و بێخانەدان، هەرچی بەختی بەرزیش پەیدا بکا و بە جێگەیەك بگا، ئەو رەگ و بنەڕەتەی وا لێی رواوە، لە دەس نادا و لە ئاکامدا هەر ئەچێتەوە سەر ئەو پیشەی پێشووە.
**حیکایەتی ئەوکچە شوانەیە** وا شووی کرد بەکوڕی پاشا و لە ماڵی پاشایشدا هەر بە شێوەی نانۆچنینی پێشین، نانی ئەنایە تاقەکانۆ و ئەچوو لە بەر تاقەکانا ئەوێسا و ئەیوت: «ماڵی ئاوا نانی شوان»!

**٣٧- سەد قەل و بەردێ!**

○ صد کلاغ و یک سنگ.

● **واتە:** سەد قسەی ناڕاست لە بەرابەری قسەیەکی راست دا، پووچەڵ ئەبێتۆ هەرواکە بەردێ بخەی سەد قەل لە ترسا هەڵ ئەفڕن.

**٣٨- سەدگوناح و یەک تۆبە.**

○ صد گناه و یک توبه.

● **واتە:** وابزانە سەدگوناح کرابێ، وەختێ گوناح کار دێت و تۆبە ئەکا، ئەبێ ببەخشرێ.

**٣٩- سەراوان و بناوان، خورجە سوور و دواوان.**

○ بالا برود یا پایین بیاید، همان خورجین سرخ است و به مصب رودخانه منتهی می‌شود!

● بە یەکێکی هەژار و دەس تەنگ ئەوترێ کە هەرچی خوار و ژوور بکا، هەر ئەوە بێ وا هەیە!
**یا ئەڵێن:** سەراوان و بناوان، کەرەکوڵ و دواوان.

**٤٠- سەر بە سەر بێ دەردیسەر.**

○ سر به سر بی درد سر.

● **واتە:** چتێ کە عەوەزی هەیە جێگەی گلە نی‌یە.

**٤١- سەر بێ دەلاک تاشین.**

○ سر بی دلاک تراشیدن.

● **واته:** کاری سەربەخۆ و بێ پرس کردن.

۴۲ـ **سەر بێ رۆزی ها لە ژێر خاکا.**

○ سر بی روزی در زیر خاک است.

● **واته:** کەسێ حەیاتی بێ، رزق و رۆزیش هەر ئەبێ.

۴۳ـ **سەر بێ گوناح پای‌دار ئەچێت وەلێ بان‌دار ناچێت.**

○ سر بی‌گناه پای دار می‌رود ولی بالای دار نمی‌رود.

● وایان وتووە بەڵام...؟!

۴۴ـ **سەرچۆپی بەرە دەس سەگەو، ئەی‌کێشێ بۆ لای دۆڵەی نانەکە!**

○ چوپی به سگ بده، جهت حرکت را به طرف ظرف نان می‌کشاند.

● بە یەکێکی تەماعکار ئەوترێ کە لە هەرچی کار و قسەدا هەر سودی خۆی لە بەرچاو بێ و بۆ لای خۆی بیکێشێ.

**یا ئەڵێن:** سەرچۆپی بەرە دەس گامێشۆ، ئەی وا بۆ لای کادانەکە.

۴۵ـ **سەر خوەش بێ، کڵاو فرەس.**

○ سر سالم بماند، کلاه فراوان است.

● **واته:** ساغ و سلامەتی مرۆڤ گرینگە، ماڵی دنیا هەر ئەبێ.

۴۶ـ **سەر خەیاتە و بێخ بەیاتە.**

○ سر نخ و بیخ بیاته!

● بە یەکێک ئەوترێ کە گەرەکی بێ لە هەر چتێ باشەکەی بۆ ئەو بێ.

**خەیاتە:** گشتەکی ئاورێشم.

**بەیاتە:** رۆنی هەڵکزراوی بەز و دووگ.

۴۷ـ **سەر دنیا بە پووش نەگیریاگە.**

○ سقف دنیا را با پوشال نگرفته‌اند.

● **واته:** بۆ هەمور چتێ حیساب و کتێبێک هەیە.

**٤٨ـ سەر دنیای لێ هاتگەسە یەک!**

○ سقف دنیا را بر سر خود فرود آمده می‌بیند!

● **واتە:** خۆی لە تەنگانەدا ئەبینێ و وا ئەزانێ کارێکی پێ ناکرێ!

**٤٩ـ سەر دێزە بازە پشیلە ئەشێ حەیای بوێ!**

○ در دیزی باز است گربه باید حیا داشته باشد.

● کاتێ ئەوترێ کە هەموو چتێ لە بەر دەستی مرۆڤدابێ و چاوەڕێ بکرێ لەو چتانە بە فێڵ و فەرەز و ناڕەوا بەهرە وەرنەگیردرێ.

**٥٠ـ سەر کڵافەکەی گوم کردگە.**

○ سر کلاف را گم کرده است.

● **واتە:** تووشی هەڵە بووە و سەر لە بەری کاری خۆی دەرناکا.

**یا ئەڵێن:** سەر گوڵۆڵەکەی لێ گوم بووە.

**٥١ـ سەر گوریس کۆتاس و بە تۆ ناگەیە!**

○ سر طناب کوتاه است و به تو نمی‌رسد.

● بە تەوس ئەوترێ، واتە: بە داخەوە بەشێکت پێ ناگەیە.

**یا ئێژن :** سەر تەنافەکە کۆتا بوو، بە تۆ نەگەیی.

**٥٢ـ سەرم بتاشن وەلێ لە بەر ماڵ خاڵۆمۆ مەمەوەن!**

○ سرم را بتراشید، ولی از جلو خانهٔ دائیم عبورم ندهید.

● **واتە:** هەر گیروگرفتێکم بۆ پێش دێ با قەوم و کەسی رەخنە گیرم نەزانن و بە رەخنەی تاڵی خۆیان زەجرم نەدەن.

**٥٣ـ سەرم لە ئاسیاوا چەرمگ نەکردگە.**

○ سرم را در آسیاب سفید نکرده‌ام.

● **واتە:** دنیام دیوە و تەجروبەم هەیە.

**٥٤ـ سەر و بن کڵاشێکن.**

○ سر و ته یک گیوه‌اند.

● بە دوو کەس ئەوترێ کە وەکوو یەک بن و چوون یەک عەمەل بکەن.
**یا ئەڵێن:** سەر و قنگ کڵاشێکن.

**٥٥ـ سەروکڵاویان ئاوێتە بووگە!**
○ سر و کلاهشان قاطی شده است.
● **واتە:** تێکەڵن ؛ بوونەتە یەکێ.

**٥٦ـ سەر و ماڵم لە تۆ درێغی نی‌یە، بزنم لە چوارده شایی کەمی نی‌یە.**
○ سر و مالم از تو دریغ نمی‌شود، اما نرخ بز من از چهارده شاهی کمتر نیست.
● **واتە:** دۆستیمان بە جێگەی خۆی، بەڵام نرخی ماڵەکەم مەشکێنە.

**٥٧ـ سەرەجای گا، هەر دۆڵە.**
○ محل برگشت گاو، درّه است.
هر کسی کو دور ماند از اصل خویش     باز جـویـد روزگـار وصـل خـویش
(مولوی)

● **واتە:** هەموو چتێ بۆ ئەسڵ و بنەڕەتی خۆی ئەگەڕێتۆ.
**عەرەب ئەڵێ:** کُلُّ شیءٍ یرجعُ الی أَصْلِهِ.

**٥٨ـ سەری ئەچەسپێ بە ئاسمانەوە، ئەم کورە ناچەسپێ بە ئینسانەوە.**
○ سرش به آسمان می‌رسد، ولی این پسر نزدیکی نشان نمی‌دهد.
● بە یەکێکی بێ‌مەیل و نەچەسپ و دوور لە دۆستی ئەوترێ.

**٥٩ـ سەری بگەیەتە پاوشایی، قنگی هەر مەفرەقە!**
○ سرش به پادشاهی نیز برسد، کونش همچنان مفرغ است.
● بە یەکێکی بێ نرخ و ناوەجاخ ئەوترێ کە لە هەر حاڵەتدا ناوەجاخی و پووچەڵی خۆی گوم نەکا، ئەگەرچی لە ژیاندا زۆریش سەرکەوێ.

**٦٠ـ سەری بووەسە ئاش و قنگی بووەسە ماش!**
○ سرش آش است و کونش ماش!
● **واتە:** زۆر سەر خۆی جەنجاڵ کردووە.

**٦١ـ سەری بێ کڵاوە.**

○ سرش بی کلاه است.

● بە یەکێکی بێبەش ئەوترێ.

**٦٢ـ سەرێکی هەس و هەزار سەوا!**

○ سری دارد و هزار سودا.

● **واتە:** سەری زۆر قاڵە و لە یەک کاتدا خەریکی چەن کارە.

**٦٣ـ سەری گرتگەسە خەنە، ئەچێ بۆ راوە گەنە!**

○ سرش را حنا بسته و دارد می‌رود برای شکار چشم چرانها.

● بە ئافرەتێکی هەڵە و هەرزە ئەوترێ.

**٦٤ـ سەرێ لە زک دایک دەرهات ناچێتۆ جێگەی خوەی.**

○ سری که از شکم مادر خارج شد، دیگر به شکم برنمی‌گردد.

● **واتە:** کەسێ هاتە ئەم دنیا، ئەبێ هەوڵی ژیان بدا و تازە ناگەڕێتۆ بۆ بەر لە پەیدا بوونی.

**٦٥ـ سەرێ ناو سەرانا نەوێ، بۆ برین خاسە.**

○ سری که میان سرها نباشد، به درد بریدن می‌خورد.

● **واتە:** مرۆڤ ئەبێ لە ناو جەماعەتدا بێت و بۆ گەلی خۆی خێریکی ببێ.

**٦٦ـ سەرێ نایەشێ، بە دەسماڵ مەی‌وەسە.**

○ سری که درد نمی‌کند، با دستمال مبند.

● **واتە:** تۆ کە دەردی سەرێکت نی‌یە، خۆت مەخەرە ناو دەردی سەرەوە.

**یا ئەڵێن:** سەرێ نەیەشێ، دەسماڵی پێوە مەوەسە.

**٦٧ـ سەری نیا بە دیانەوە.**

○ سر به دهانه گذاشت.

● **واتە:** وەکوو ئەسپی سەرکێش، سەری ناوە بە دیانە لەغاوەو هار و یاخی بووە.

**٦٨ـ سەرینی هەس و پەرینی نی‌یە.**

○ عرعر می‌کند ولی توان جفتگیری ندارد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەر قسەی جنسی و عەیش و نۆش بکا بەڵام عەمەلی نەبێ.

**٦٩ـ سەعاتێکە حەکایەت لەیلێ و مەجنوونی بۆ ئەخوێنم لە ئاخرا ئـەپرسێ: لەیلی ژن بو یا پیاگ؟**

○ یک ساعت است دارم داستان لیلی و مجنون بـرایش مـی‌خوانـم در آخـر می‌پرسد: لیلی زن بود یا مرد؟

● بە یەکێک ئەوترێ کە گوێ بە قسەی مەردم نەدا و پرسیاری بێ جێگە سەبارەت بەو باسە بکا.

**٧٠ـ سەفەرە و لە بەرە.**

○ سفر است و در پیش است.

● **واتە:** کارێکە و ئەبێ ئەنجام بدرێ کە وا بوو هەرچی زووتر، چاکتر.

**٧١ـ سەگ برسی، هەڵمەت بۆ دۆڵەی نان ئەوا.**

○ سگ گرسنە، بە ظرف نان حملە می‌کند.

● **واتە:** زکی برسی لە هیچ ناپرسێ.

**یا ئێژن :** سەگ برسی، هەڵمەت بۆ دۆڵەی خاوەن ماڵ ئەوا.

**٧٢ـ سەگ بە شۆردن گڵاوی دەرناچێ.**

○ سگ با شستن پاک نمی‌شود.

● **واتە:** چتێ کە زاتی ناپاک بێ، بە هیچ لەونێ پاک نابێتۆ.

**٧٣ـ سەگ بەکردەوەی ساحێو ماڵ پێشە ئەشکنێ.**

○ سگ بر اساس عملکرد صاحب خانە استخوان می‌شکند.

● **واتە:** کردەوەی خاوەن ماڵ هەر چۆن بێ، تەئسیر دائەنێ لە سەر ئەهلی ئەو ماڵە، تەنانەت سەگیشی.

**٧٤ـ سەگ بە مانگە شەو وەرینە!**

○ عوعو سگ است به ماه.    مه فشاند نور وسگ
مەفشاند نور وسگ عوعو کند        هرکسی برخلقت خود می‌تند

(مولوی)

● بە کەسێکی سووک و بێ وجوود ئەوترێ کە بە مرۆڤێکی زانا و بە ناو بانگ خراپ بێژێ.

عەرەب وتوویەتی: البدرُ یلوحُ والکلبُ ینوحُ واتە:مانگ نوورئەداوسەگ ئەوەڕێ.

٧٥- **سەگ پاسووتیاگ!**

○ سگ پا سوخته.

● بە یەکێکی بێ هەوسار ئەوترێ کە هەر تاوێ سەر بکا بە ماڵێکدا.

٧٦- **سەگ پای ئەشکێ و جووچکەی هەڵ ئەوەسن!**

○ سگ پایش می‌شکند و دمش را می‌بندند!

● وەختێ ئەوترێ کە ڕووداوێك قەومابێ و بە جێگەی ئەوە، عیلاجی ئەو ڕووداوە بکرێ، بە جۆرێکی تر عەمەل بکەن کە هیچ فڕێکی بە سەر ئەو ڕووداوە وە نەبێ.

٧٧- **سەگ تێر ڕاو ناکا.**

○ سگ سیر شکار نمی‌کند.

● **واتە:** هەر کەس بێ‌نیاز بێ، هەوڵ نادا.

٧٨- **سەگ چەرمگ بۆ بارەلۆکە زەرەری هەس.**

○ سگ سفید برای بار پنبه ضرر دارد.

● بە کەسێکی خراپ ئەوترێ کە زەرەری بۆ دەور و بەری ببێ.

٧٩- **سەگ خاوەن خوەی ناناسێ!**

○ سگ صاحب خود رانمی‌شناسد.

● بە جێگایەکی زۆر قەرەباڵغ ئەوترێ.

٨٠- **سەگ درگای خوەیشی لێ‌ئەوەڕێت!**

○ سگِ درِ خانۀ خودش نیز به او حمله می‌کند.

● **واته:** زۆر بەختی شەڕە و شانس لێی هەڵگەڕاوەتۆ.

**۸۱ـ سەگ زمهاریش ناکا و ئەکەوێتە بەهار.**

○ سگ آرد آذوقۀ زمستانی فراهم نمی‌کند و با این وصف به بهار نیز می‌رسد.

● **واته:** رزق و رۆزی کەم یا زۆر هەر ئەبێ و کەس لە برسیدا نامرێ.

**۸۲ـ سەگ زۆری بۆ بێری ئەونەی تانجی‌یەک رائەکا.**

○ سگ را تحت فشار قرار دهی به اندازۀ یک تازی می‌رود.

● **واته:** لە تەنگانەداکاری دوور لە هێز و توان ئەکرێ.

**۸۳ـ سەگ «قار»ە و پاس «قەرەیان» ئەکات!**

○ سگ روستای «قار» است و در روستای «قره‌یان» پارس می‌کند!

● بە یەکێك ئەوترێ کە لە سەر چتێ بڕوا و زکەدڕێی بۆ بکا، کە هیچ پێوەندیەکی بە ئەو نەبێ.

«قار» و «قەرەیان» دووگوندن لە نزیکی شاری سنەدا.

**یا ئەڵێن:** سەگ «قوروە»س و پاس «سرێشاوا» ئەکا.

سەگ «کونەماسی»یە و پاس «جرتاوا» ئەکا.

**۸۴ـ سەگ کوێر لە ماڵی نان نایەرێتە دەرۆ.**

○ سگ کور از خانۀ او نان بیرون نمی‌آورد.

● **واته:** زۆر رژدە و کەس نانی ناخوا.

**۸۵ـ سەگ، لە بەر ماڵ ساحێویا شێرە!**

○ سگ، دم در خانۀ صاحبش شیر است.

● بەکەسێ ئەوترێ کە هەر لە زێد و ماڵی خۆیا ئازا بێ.

**۸۶ـ سەگ لە پێشە ناتۆرێ.**

○ سگ از استخوان قهر نمی‌کند.

● **واته:** هیچ گیان لە بەرێ، لە خێر خۆی لانادا.

**یا ئەڵێن:** سەگ لە کولێرە چەورە ناتۆرێ. سەگ لە کولێرە راناکات.

**٨٧ـ سەگ لە مانگە شەو ئەترسێ!**

○ سگ از ماه می‌ترسد.

● بە یەکێکی بێ نرخ ئەوترێ کە تاقەتی دیتنی کەسێکی بەنرخ و پایەبەرزی نەبێ و رووی لێ وەرگێرێ.

**٨٨ـ سەگ لە هەرکوێنە بخوا، لێنا ئەوەرێ.**

○ سگ در هر جا طعمه بخورد، همان جا پارس می‌کند.

● ئاماژەیە بۆ وەفاداری و حەق ناسی.

**٨٩ـ سەگ نامەتی وێت، نان شوان ئەخوا.**

○ سگ که بد بیاورد، نان چوپان را می‌خورد.

● بە کەسێکی بێ سفەت و سپڵە ئەوترێ کە خەیانەت بکا بە نانە خوێی خۆی.

**٩٠ـ سەگ و مزگتیان نەوتگە.**

○ سگ و مسجد را نگفته‌اند.

● **واتە:** ناپاک و پاک یەک ناکەون.

**٩١ـ سەگ وەری و وەوی دەرپەری!**

○ سگ پارس کرد و عروس از خانه بیرون پرید.

● بە بووکێکی کەم عەقڵ و سووک ئەوترێ کە بە کرداری خۆی هەر لەو ئەوەڵەوە، نیشان بدا چەندە سووک و کەم عەقڵە.

**٩٢ـ سەگ هار چل شەو عومر ئەکا.**

○ سگ هار چهل شب زندگی می‌کند.

● **واتە:** زاڵم زوو زەواڵی بۆ ئەبێ.

**٩٣ـ سەگێ ئاسیاوی ئەلێستۆ، سەگێتر دوای ئەوی ئەلێستۆ!**

○ سگی آسیاب را می‌لیسید، سگی دیگر مقعد سگ اوّل را می‌لیسید.

● **واتە:** یەکێکی بێ نرخ و پووچەڵ خەریکی چڵکاو خواردنی ماڵی کەسان بوو، کەچی یەکێکی لەو بێ‌نرخ‌تر، خۆی بەودا هەڵواستبوو.

**٩٤ـ سەما بە دڵ شەخس ئەکرگێ.**

○ رقص بنا بە خواست قلبی افراد صورت می‌گیرد.

● **واتە:** هەر کەسێ خۆشی لە چتێ دێت و مەنعی ناکرێ.

**٩٥ـ سەنگینی خانم مایەی بێ چارشێوی‌یەا!**

○ سنگینی خانم مایە بی چادری است.

● بە تەوس ئەوترێ بە ئافرەتێکی بێ‌حیجاب کە خۆی قورس و بە حەیا بدا لە قەڵەم، بەڵام خەڵک وانایەژن!

**٩٦ـ سەور لە بەر بێ دەسەڵاتی‌یە.**

○ صبر بە علّت ناتوانی است.

● **واتە:** کەسێ سەبر ئەکا، کە نەتوانێ کارێ ئەنجام بدا.

**٩٧ـ سەوقات پەڵخە، تەماکۆی تەڵخە.**

○ سوغات پلخە، تنباکوی تلخ است.

● **واتە:** هەر کەس لە پای هێز و توانی خۆی پیاوەتی ئەکا.

پەڵخە: گوێرەکەی گامێش، بەچکە خوو / کینایە لەکەسێکی شل و لەشە.

**٩٨ـ سەوقات شوان، هەڵەکۆکە.**

○ سوغات چوپان، آلە کوک است.

▣ **وەکوو:** پەندی (٩٧)

**٩٩ـ سەهۆڵ بەنان و سایەقە، شێر عەنتەری لایەقە.**

○ یخ بندان و آسمان صاف، شیر عنتر را می‌طلبد.

● **واتە:** عەرز یەخی بەستووە (سەهۆڵ بەندانە) و ساردە و هەموو کەس ناتوانێ خۆی دەرخا.

**١٠٠ـ سیر ئەخوات و سورنا ئەژەنێ.**

○ سیر می‌خورد و سرنا می‌زند.

● **واتە:** قسەی بێ‌جێگە و بێ‌نرخ ئەکا.

**یا ئێژن :** سیر بخوات و سوڕنا بژەنێ. سیری خواردگە و سوڕنا لەژەنێ.

**١٠١ـ سیر بە پیاز ئێژێ: بۆت تێ!**

○ سیر بە پیاز می‌گوید: بو می‌دهی.

▣ **وەکوو:** قەل بە قەل ئێژێ: روو رەش.

**١٠٢ـ سیروان! لێشت نەدەم، هەر ئەم‌وەی؟**

○ سیروان! اگر از آب تو عبور نکنم باز هم مرا خواهی برد؟

● **واتە:** ئەگەر من کارم بە سەر تۆوە نەبێ،تۆ هەرلێم ناگەڕێی؟

**١٠٣ـ سێف سوور بۆ دەس کور خان!**

○ سیب سرخ برای دست پسر خان.

● **واتە:** چتی باش هەر لایەقی مرۆڤی باشە.

**یا ئەڵێن:** سێف سوور بۆ دەس خان خاسە.

**١٠٤ـ سینە شێر و ماکەر پشت!**

○ سینه چون سینهٔ شیر و پشت چون پشت مادّه الاغ!

● بە یەکێکی زل حۆل و بێ‌هونەر ئەوترێ.

# ش

**١- شابەخشی و شیروان نایوەخشیٚ!**

○ شاه بخشید و شیروان نمی‌بخشد.

● **واته:** خان بەخشیویەتی و دەست و پا، بەرگیری ئەکەن.

**یا ئێژن :** شا بەخشیگیه و شێخ عەلی نایوەخشیٚ.

عەرەب ئەڵێ: يُعطى الحرُّ والعبدُ يألم قلبه. واته: جوامێر ئەیبەخشێ و ژێردەسته دڵی ژان ئەکا.

**٢- شاعیر وەختیٚ قافیەی تەنگ بیٚ، جەفەنگ ئێژیٚ.**

○ شاعر وقتی قافیه‌اش تنگ باشد، جفنگ می‌گوید.

● **واته:** مرۆڤ لە تەنگانەدا، هەڵە بە دەمیا دێ.

**٣- شاڵ من و شاڵ خانە!**

○ شال من و شال خان است.

● **واته:** ئەم دوو چتە پێکەوە موقابەلە ناکرێن. ئەم لەکویٚ و ئەو لەکویٚ؟

**٤- شام و نەهار هیچ ؛ ئافتاوە و لەگان حەفت دەس!**

○ شام و نهار هیچ ؛ آفتابه و لگن هفت دست.

● بە ماڵ و جێگایەک ئەوترێ کە ئەهلەکەی خۆیان بۆ هاتنی میوان سەرقاڵ کردبێ و هەر بێن و بچن بەڵام لە سفره و خوان خەبەرێ نەبێ.

**٥ـ شانامە ئاخری خوەشە.**

○ شاهنامە آخرش خوش است.

● **واتە:** چۆنیەتی هەموو کارێ لە ئەنجامدامەعلووم ئەبێ.

عەرەب ئەڵێ: یاراقِدَ اللیّلِ مَسروراً بِاَوّلِهِ إنَّ الحوادثَ قَد یَطرُقنَ اسحارا.

واتە: ئەی ئەو کەسەی وا ئارامت گرتووە و بەوەی لە ئەووەڵی شەودا ڕووی داوە شادمانی ؛ پەلە مەکە چونکە پێش‌هاتە خراپەکان لە دەمەوبەیاندا درگا لێ ئەدەن.

**٦ـ شانس ئەگەر نەیەرێ، دەڵەمە دیان ئەشکێنێ (ئەشکنێ).**

○ شانس اگر موافق نباشد، پنیر نیم بند نیز دندان می‌شکند.

● قسەی نەهاتە.

**٧ـ شاواش خوەی کرد و قیت هەڵ ئەپەرێ!**

○ شاباشش راکردە است و قُد می‌رقصد.

● **واتە:** پیاوەتی خۆی پیشان داوە و سەر بەرز دانیشتووە!

**٨ـ شایی بێ شالیار و ترۆزی بێ کالیار ناوێ.**

○ شادی بدون شهریار و خیار چنبر بدون خیار چنبر پیر، نشدنی است.

● بە تەوس ئەوترێ کاتێ کە بیانەوێ لە کەسێکی بێ‌وجوود و سەرەخەر لە جێگایە کدا ڕەخنە بگرن.

◘ **وەکوو:** بێستان بێ سەرە خەرنابێ.

**٩ـ شایی تەک گورگ و شیوەنیش بۆ مەڕا!**

○ با گرگ شادی کردن و برای گوسفند نیز گریستن.

● بە یە کێکی دوو ڕوو، ساختەچی، نان بە نرخی ڕۆژ خۆر، ئەوترێ.

**١٠ـ شایی‌یکم نی‌یە بیەمە شێڵانە ، دایکم ئێژێ ژن بێرانە!**

○ یک شاهی ندارم کە با آن زردآلو بخرم، مادرم می‌گوید زن بگیر.

● **واتە:** ئەم کارە دەسمایەی گەرە کە؛ بێ دەسمایە فەتیرە!

**١١ـ شمشێر مسری لە کێلانا ناوێسێ.**

○ شمشیر مصری در غلاف نمی‌ماند.

● **واته:** مرۆڤی دلێر و ئازا هەر چۆن بێ خۆی نیشان ئەدا.

**۱۲ـ شواڵ (شەواڵ) ئاوێتەن.**

○ شلوارشان قاطی است.

● **واته:** یە کێکن.

**۱۳ـ شواڵ کەفتگەسە دەر قولی!**

○ شلوار به پاچه‌اش افتاده است.

● **واته:** رسوا بووه.

**یا ئەڵێن:** شواڵ کەفتگەسە دەر پای.

**۱۴ـ شوان تا دانیشێ،رانەکەی لێ دوور ئەکەوێتو.**

○ چوپان تا بنشیند، گله از او فاصله می‌گیرد.

● **واته:** مرۆڤ ئەگەر زوو، تێنەکۆشێ، جێئەمێنی و زیان ئەکا.

**۱۵ـ شوان لە شوانی عاری نی‌یە، لە نانۆ چنین عاریە.**

○ چوپان از چوپانی عار ندارد، از جمع کردن نان چوپانی عار دارد.

● بەکەسێ ئەوترێ کە ئیشێکی بە ئەستۆ گرتبێ و نانی پێ بخوا بەڵام حەز نەکـا، خەڵکی پێی بزانن.

**۱۶ـ شوان مەیلی بێت، لەگون بەران پەنێر ئەگرێت! (یا: فرۆ دروس ئەکا)**

○ چوپان اگر بخواهد، از بیضهٔ قوچ پنیرمی‌گیرد.

نظیر این مثل فارسی: شبان اگر خواهد، شیر از بُز نر دوشد.

● **واته:** کەسێکی ئازا و لێهاتوو، ئەتوانێ کارێکی گرینگ و سەر سووڕهێنەر بکا، کە جێگەی باوەڕ نەبێ.

**۱۷ـ شۆرەبی سەر لە خوارە.**

○ بید مجنون سر به زیر است.

● بەکەسێکی ماقووڵ و بەحەیا ئەوترێ.

**١٨- شوکر بە کەفەن دز بەرگ.**

○ شکر بە کفن دزد قبلی.

⊡ بڕوانە بۆ پیتی «ر» مەسیلەی: «رەحمەت لە کەفەن دز بەرگ»

**١٩- شۆلەکە لێیان نە ئەپرسی، ئەی وت: چل مەن ئەگرم!**

○ از جوال سؤال نمی‌کردند، می‌گفت: چهل من گنجایش دارم.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بێ ئەوی لێی بپرسن، خۆی بخاتە ناو قسەو باسی خەڵکەوە.

**٢٠- شۆن شێرە و ڕێوی گێرەی تیا ئەکا!**

○ محلّ سکونت شیر است و روباه در آن جا خرمن کوبی می‌کند!

⊡ **وەکوو ئەڵێن:** جێگەی شاوازان کۆر کۆرە وازان. پیاوە گەورەکان ڕۆیشتن و ناوەجاخەکان جێگایانیان گرتووە.

**٢١- شووتی (یا: هەنی) ئاتە ژێر باڵی!**

○ هندوانە زیر بغلش می‌گذارد.

● **واتە:** بە درۆ بە شان و باڵیا دێت بۆ ئەوەی فریوی بدا.

**٢٢- شوووە کۆنەکەم کەفتگەسە بیرم، دەسم ناگەیّ‌تاوێ بگیرم.**

○ بە یاد شوهر قبلی افتادەام، فرصت نمی‌کنم کمی گریە کنم.

● قسەی بیرەوەری ئافرەتێکی ساختە چی‌یە.

**یا ئەلین:** شوووە کۆنە کەم کفتگەسە بیرم، هێلمێ داکوتم و تاوێ بگیرم.

هێلم داکوتان: دەستێ تەون کردن.

**٢٣- شەراو مفتە قازیش ئەیخوا!**

○ شراب مفت را قاضی هم می‌خورد.

● **واتە:** کەس لە چتی موفت و خۆڕایی خۆی لانادا، تەنانەت قازیش.

**٢٤- شەر بە شمشێر، مامەڵە بە پووڵ.**

○ جنگ با شمشیر، معاملە با پول.

● **واتە:** هەر کارێ ئامرازی تایبەتی خۆی هەیە.

**٢٥ـ شەر بەکۆنە قینۆ ئەکا.**

○ بر اساس کینۀ قدیمی نزاع می‌کند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە سەر تۆڵەگرتنی زووتر بێت و بۆ بیانوو بگەڕێ.

**٢٦ـ شەر خوەش نی‌یە، شەرنامەی خوەشە!**

○ جنگ خوب نیست، جنگنامۀ آن خوش است.

● **واتە:** هەر ڕووداوێ، حیکایەتەکەی خۆش‌ترە لە نەفسی ڕووداوەکە.

**٢٧ـ شەر بوو، شەرکوژیاوە ؛ کەچەڵ بۆ دار ئەخولیاوە!**

○ جنگ بود، جنگ خاتمه یافت ؛ کچل دنبال چوب می‌گشت.

● بە یەکێکی گێج ئەوترێ کە دوای هەموو کەس لە کارەساتێک تێ بگا.

**٢٨ـ شەر، شەرە خۆ نان و گۆشت خواردن نی‌یە!**

○ جنگ، جنگ است نان و گوشت خوردن کە نیست.

● **واتە:** لە شەڕدا سەر و دەس ئەشکێ و مرۆڤ ئەکوژرێ، خواردەمەنی تێدا بەش ناکەن.

**٢٩ـ شەر، شەرە و نیمە شەریش هەر شەرە.**

○ جنگ، جنگ است و نیمە جنگ نیز جنگ است.

● **واتە:** شەڕ ونیوەشەڕ،ناویان هەر «شەڕە»

**٣٠ـ شەرع مار بە دار.**

○ شرع مار با چوب.

● **واتە:** زاڵم ئەبێ سەرکوتی کەی.

**٣١ـ شەرکردن مەردی و دەرچوون مەردی!**

○ جنگیدن مردی و گریختن مردی.

● **واتە:** پیاوانە شەڕ بکەو ئەگەر دەسەڵاتی شەریشت نەما،کوڕانە دەرچۆ ؛ با بە فیڕۆ نەکوژرێی.

**۳۲- شەرکەر ئەشێ ئاشتی لە بیربێ.**

○ آنکه نزاع می‌کند باید فکر آشتی را هم داشته باشد.

● **واتە:** لە شەڕدا ئەوەندەی تێدا بێلاوە کە رووی ئاشتیت ببێ.

**۳۳- شەرکەر واز تێرێ، ناوجێ‌کەر واز نایەرێ!**

○ آن که دعوا می‌کند دست برمی‌دارد، ولی میانجی‌گر وِل کن نیست.

● **واتە:** ئەگەر کوڵە فتوور بێڵێ، شەڕ زوو تەواو ئەبێ.

**۳۴- شەر، لە بەتاڵی خاسترە.**

○ نزاع کردن از بیکاری بهتر است.

● **واتە:** دەس بە کار بوون، هەرچی بێ، لە بێکاری باشترە.

**۳۵- شەر لە سەر ناتەواوی سفرەس!**

○ دعوا بر سر کم و کسری آذوقه است.

● **واتە:** شەڕ و ئاژاوەی ماڵ لە سەر کەم و کورتی رزق و رۆزی‌یە.

**۳۶- شەر لە شێف و ئاشتی لە خەرمان.**

○ نزاع در زمین شخم زده و آشتی در خرمن.

**معادل:** دعوای اول و صلح آخر.

● **واتە:** شەڕی هەوەڵ و ئاشتی ئاخر باشترە لە ئاشتی هەوەڵ و شەڕی ئاخر.

**۳۷- شەر و نیمە شەر بران.**

○ جنگ و نیمە جنگ برادرند.

● **واتە:** وەختێ وتیان «شەڕ» کەم یا زۆر، هەر ناوی شەڕە.

**۳۸- شەرێ بوێ خێر منی تیاوێ!**

○ نزاعی در گیرد و سود من در آن باشد.

● **واتە:** قسەی کەسێکی بێ‌نرخ و ناجوامێرە، وا سوودی خۆی لە دەرد و رەنج و ماڵ وێرانی کەسانا ئەبینێ.

**۳۹- شەریک خاس بووایە، خوا بۆ خوەی دای ئەنیا!**

○ شریک اگر خوب بود، خدا برای خودش قرار می‌داد.

● **واتە:** شەریکی چتێکی خراپە و ئاخری، دڵ ئێشانە.

**۴۰- شەریک دز و رەفێق قافڵە!**

○ شریک دزد و رفیق قافله.

● بە یەکێکی فێڵەباز و ساختەچی ئەوترێ کە لە هەر دوولا بخوا.

**۴۱- شەق ئەزانێ قۆناخ ها لەکوێ!**

○ اردنگی می‌داند که راه کجاست!

● بە یەکێک ئەوترێ کە کارێ بە رەزامەندی نەکا بەڵام بەکوتەک بیکا.

**۴۲- شەلم، کوێرم، ناپارێزم!**

○ شل هستم، کورم، احتیاط نمی‌کنم.

● **واتە:** خۆتان لە من دوور بگرن، هەرکەس وە بەر پەلم کەوێ، دای ئەماڵم.

**۴۳- شەل نی‌یە و ئەلەنگێ!**

○ شل نیست و می‌لنگد!

● **واتە:** عەیب هەر ئەو عەیبەیە بەڵام وشەکە گۆڕاوە.

**۴۴- شەلە باوان وکوێرە باوان!**

○ اگر شل است خانۀ پدری، اگر کور است خانۀ پدری.

● **واتە:** ئافرەت ئەگەر دووچاری کۆسپێ ببێ و نەتوانێ لە ماڵی مێردەکەیا دانیشێ، ئەبێ بگەڕێتۆ بۆ ماڵی باوکی.

**۴۵- شەلەم، لەنج لە برنج ئەکا!**

○ شلغم با برنج لج می‌کند.

● بە یەکێکی بێ‌نرخ و ناشیرین ئەوترێ کە لە کەسێکی بەنرخ و جوان بکەوێ بە قینا.

**۴۶- شەمە، بە کەس کەس!**

○ شنبه برای بعضی شانس می‌آورد.

● **واته:** بۆ هەمووکەس ئەو شانسە روو ناوا.

**۴۷ـ شەمە کار و شەمە بار، شەمە وەوی مەکە سوار.**

○ شنبه کار و شنبه بار ولی شنبه عروس را روانهٔ خانهٔ داماد مکن.

● شەمە بۆ دەست پێ کردنی هەموو کارێ خەیری ژن گوێستنەوە، ئەتکیە کراوە.

**۴۸ـ شەمەی لێ ناکات.**

○ بدون توجه به شنبه و غیر آن مشغول کار است.

● **واته:** بێ حەسانەوە، کار ئەکا.

**۴۹ـ شەن خوەت بەرە من، بای خوەت چەپە.**

○ شانه خودت را به من بده، باد طرف تو از چپ می‌وزد.

● **واته:** تۆ لاچۆ من باشتر ئەتوانم ئەوکارە ئەنجام بدەم.

**۵۰ـ شەنە لە مەنە کەمتر نی‌یە.**

○ شنده از منده کمتر نیست.

● وەختێ ئەوترێ کە بیانەوێ دوکەس پێکەوە هەڵسەنگێنن و بێژن ئەم هیچی لەو کەمتر نی‌یە.

**۵۱ـ شەو تاریک، رۆژ رۆشن ها بە شۆنیۆ.**

○ شب تاریک، روز روشن به دنبال دارد.

● **واته:** مرۆڤ نابێ نائومید بێ.

**۵۲ـ شەو قەڵای مێردانە.**

○ شب قلعهٔ مردان است.

● **واته:** شەو، کاتی نیشان‌دانی ئازایەتی‌یە.

**۵۳ـ شەوقی لە تەپاڵە بریگە (سەندگە، بریوە)!**

○ نور از تپاله ربوده است!

● بە تەوس بە یەکێکی ناشیرین ئەوترێ.

## ٥٤ـ شەوکاری شەق کرد

○ دِراز نایِ شبِ را شکافت.

● **واتە:** شەوی گەیاندە رۆژ (نەخەوت).

## ٥٥ـ شەیتان پەلەی کرد، چاو خوەی کوێر کردا

○ شیطانِ عجلە کرد، چشم خود را کور کرد.

● **واتە:** پەلەکار شەیتانە.

## ٥٦ـ شەیتان چووەسە گەوڵی (پێسی)

○ شیطانِ دِر جِلدش فرو رفتە است.

● **واتە:** لە سەرِ ئەو کارە زۆر ئەڕوا و پای داگرتووە.

## ٥٧ـ شەیتان ناوچێ کەریان بێت.

○ شیطانِ میانجیِ گرشانِ باشد.

● **واتە:** ئەو شەرە لە بەینی ئەو دووکەسەدا هەر نەکوژێتۆ.

## ٥٨ـ شێت بگەیەتە شێت قنگی ئەخورێا

○ دیوانە بِرسد بە دیوانە، کونش می‌خارد.

● بەکەساتێکی بێ‌عەقڵ ئەوترێ ئەوکاتەی وا ئەگەنە یەک و لە خۆشیداگەشە ئەکەن.

## ٥٩ـ شێت بوەلە لای شێخ، شێخ بوەنە لای گێ؟

○ اگر دیوانە را نزد شیخ ببرند، شیخ را باید نزد چە کسی برد؟

● بە شێخێکی فێڵەباز و ساختەچی ئەوترێ.

## ٦٠ـ شێت عاقڵ گێا

○ دِیوانۀ عاقل فریب.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە رواڵەت دا وەکوو شێت بێ بەڵام کڵاو بنێتە سەرِ مرۆڤی ژیر.

**٦١ـ شێت گەیی‌یە شێت تەمەرێز هەی تەمەرێزا!**

○ دیوانه رسید به دیوانه کولاک هی کولاک.

● وەختێ ئەوترێ کە دوو نەفەری گەوج و کەم عەقڵ بگەیەنە یەک و دەس بکەن بە قسەوگاڵتەی دوور لە ئەدەب.

**٦٢ـ شێت و مزگت؟ (مزگەوت)**

○ دیوانه و مسجد؟

● **واتە:** ئەم دوو چتە یەک ناگرن.

**٦٣ـ شێخ، شێخ ئەناسێ.**

○ شیخ، شیخ را می‌شناسد.

● **واتە:** هەر مرۆڤێ هاوئیش و هاو رەوشتی خۆی باش ئەناسێ.

**٦٤ـ شێخە دێیە کێ بە کێیە؟**

○ ده شیخ نشین است و کی به کی.

بە جێگەیەکی بێ رەوشت و بێ قانون ئەوترێ کە کەس بە کەس نەبێ.

**٦٥ـ شێر بمشکێنێ، نەک رێوی بمخوا!**

○ شیر مرا بشکند، ولی روباه مرا نخورد.

● **واتـە:** مرۆڤ بە دەستی ئینسانی گەورە و لێهاتوو لە بەین بچێ چاکـترە لە وەی گیرۆدەی دەستی نامەرد ببێ.

**یا ئەڵێن:** شێر بتخوا، بەڵام پەنا بۆ رێوی مەبە.

**٦٦ـ شیر بەرە بەرە ئەوێتە کەرە.**

○ شیر به تدریج تبدیل به کره می‌شود.

● **واتە:** هەموو کارێ بە سەبر و حەوسەلە پێش ئەچێ.

**٦٧ـ شێر بیشمرێ، جێگە دەم رێوی ناخوا.**

○ شیر اگر هم بمیرد، جای دهان روباه را نمی‌خورد.

● **واتە:** مرۆڤی هێژا و جوامێر مەرگی بە لاوە پەسەندترە لەوەی دەستی نیاز بۆ لای

ناکەس راکێشێ.

**۶۸ـ شێر پیر بوێ، رێوی لاسایی ئەکاتەو.**

○ شیر اگر پیر شود، روباه ادای او را درمی‌آورد.

● **واتە:** مرۆڤ کە پیر و لێ کەوتە بوو، ئەبێ بە گاڵتەجاڕی هەرزە کارانی کەم عەقڵ و خاو.

**۶۹ـ شیردا بۆ پیردا. (یا، شیردا بۆ داپیردا)**

○ شیر برای دایۀ پیر؟

● لە جوابی وەعدەیە کی دوور و درێژ ئەوترێ. واتە: ئەو وەعدەیە فریای من ناکەوێ.

**۷۰ـ شێر، شێرە چ ژنە و چ مێرە.**

○ شیر، شیر است چه مادّه باشد و چه نر.

● بە پیاو و ژنی بنەماڵەیە کی دلێر و ئازا ئەوترێ. واتە: هەموویان ئازا و نەبەزن.

**۷۱ـ شێر لە بێشە دەربێت خوای نێر، خوای مێ.**

○ شیر که از جنگل خارج شود چه نر باشد چه ماده.

▣ وەکوو مەسیلەی ژمارە (۷۰)

**۷۲ـ شیر لە تەک دۆشیا ناچێتۆ گوان.**

○ شیر که دوشیده شد، دیگر به پستان برنمی‌گردد.

● **واتە:** کارێ کە تێپەڕ بوو، ئیتر ناگەڕێتۆ.

**۷۳ـ شێر لە دەنگ کەڵەشێر ئەترسێ!**

○ شیر از صدای خروس می‌ترسد.

● **واتە:** مرۆڤی دلێر لە جاڕ و جەنجاڵ و قیڕەو فەن و فێڵی کەسێکی جەبوون دووربینی ئەکا.

**۷۴ـ شێر ماڵە و رێوی دەشت!**

○ شیر خانه است و روباه صحرا.

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەر بە سەر ماڵ ومناڵی خۆیا زاڵ بێ.

**٧٥ـ شیر و شتر و دیار عەرەب!**

○ شیر شتر و دیار عرب.

● کاتێ ئەوترێ کە بیانەوێ پووشی دیتنی کەسێ بۆ هەمیشە فڕەدەن و بێزاری خۆ سەبارەت بەو کەسە نیشان بدەن.

**٧٦ـ شیرین شاتەرە بنی قەوی‌یە، خەسوو ئەترێ خەتای وەوی‌یە!**

○ شیرین شاتره ریشه‌ای محکم دارد، مادر شوهر می‌گوزد و عروس مقصّر است!

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەر نەوعەکەم وکۆڕی‌یەکی خۆی بخاتە ئەستۆی یەکێکی تر.

**٧٧ـ شیشەیەک شکیا، ساقۆ ناوێ.**

○ شیشه‌ای که شکست، سالم نمی‌شود.

نظیر: شیشهٔ بشکسته را پیوند کردن مشکل است

خاقانی می‌گوید:

بلورین جام را ماند دل من　　　　که چون شد رخنه نپذیرد مداوا

● **واتە:** دڵێ کە ڕەنجا، نایەتۆ جێگە.

**٧٨ـ شێف و وەردی کە، لە بان بەردی کە.**

○ شخم بزن، اگرچه روی سنگ باشد.

● **واتە:** کاری کشت و کاڵ لە هەر جێگایەک دا بکرێ هەر خێر و بەرە کەتە.

# ع

۱ـ **عاسمان دوور و زەوی سەخت!**

○ آسمان دور و زمین سخت!

● **واتە:** دەستم لە هەموو لایەکەوە بڕاوە و هیچم پێ ناکرێ.

۲ـ **عاشق کاشی کەوگ بووگە.**

○ عاشق کاشی کبود رنگ شده است.

● **واتە:** عاشقی زرق و برق و رواڵەتە.

۳ـ **عاقڵ بە ئیشارە و نادان بە کوتەک!**

○ عاقل به اشاره و نادان به کتک!

● **واتە:** عاقڵ زۆر زوو تێ ئەگا و بێ عەقڵ مەگەر تێی سرەوێنی.

۴ـ **عاقڵ دوو جار ناخەڵەتێ.**

○ عاقل دو بار فریب نمی‌خورد.

● **واتە:** مرۆڤی ژیر ئەگەر جارێ خەڵەتا، بۆ جاری دووهەم وریا ئەبێتۆ و ئیتر ناخەڵەتێ.

**حەدیسی نەبەویە:** لا یُلدغ المؤمن من جُحْرٍ واحدٍ مَرّتین. واتە: مؤمن لە کونایەکەوە دووجار ناگەزرێ.

**٥- عاقڵ کەر ئەوێ، کەر عاقڵ ناوێ!**

○ عاقل خر می‌شود، خر عاقل نمی‌شود.

● **واتە:** مرۆڤی ژیر شایەد بە هەڵەدا بچێ، بەڵام مرۆڤی نەفام هەر ژیر نابێ.

**٦- عوزر لە قەباحەت خراوترا**

○ عذر از گناه بدتر!

● **واتە:** عوزرمایی کردن لە ئەو خەتایە کە کراوە، زۆر خراپترە.

**ئەگێرنەوە** کە «ناصرالدّین شای قاجار» لە ئەهلی مەجلیس ئەپرسێ: «عذر ازگناه بدتر یعنی چە؟» واتە عوزری لەگوناح خراپتر یانێ چی؟ هەر کەس چتێ ئێژێ ؛ بەڵام بە دڵی شاوە نالکێ. تاکوو رۆژێ «شا» لە ناو داڵانی تاریکی قەسرەوە تێپەڕ ئـەبێ لە ناکاو، چتێکی رەش ئەکەوێ بە سەریا و «شا» هاوار ئەکا و زۆر ئەترسێ! نۆکەرو قەرەوڵەکان دێن و وەختێ چتی رەش بەرزۆ ئەکەن، ئەبینن ئەمە «کەریم شیرەیی» دەڵقەکی دەربارە! «شا» ئەگەرچی کەریمی زۆر خۆش ئەویست و ئیزنی پێ دابور هەرچی ئەکا بۆ شادبوونی شا، ئازاد بێ ؛ بەڵام ئەم جارە بە تووڕەیی‌یەکی زۆرەوە تێر جنێوی ئەداتێ و دەستوور ئەدا بیکوژن!

وە لەوکاتەدا لێی ئەپرسێ: ئەوە بۆ پەڕیت بە سەرما سەگ باب؟

کەریم ئێژێ: قوربان خەجاڵەت خۆم نەم‌زانی تۆ بووی ئەگەینە نەئەپەڕیم بە سەرتا، وام زانی خانمی شایە! ناصرالدّین شاکە ئەمە ئەبیستێ زۆرێکی زۆرتر رقی هەڵئەسێ و ئێژێ : سەگ باب ئەزانی چی ئێژی؟ کەریم ئێژێ : بەڵێ قوربان ئەمە جوابی لـەو پرسیارە بووکە شا فەرمووی: «عذر از گناه بدتر یعنی چە؟» ئەمە عوزری خراپتر لە گوناهە. شا ئەیبەخشێ و خەڵاتێکی باشیشی ئەداتێ.

**٧- عومر سەگ هار چل شەوە.**

○ طول عمر سگ هار چهل شب است.

● **واتە:** زاڵم زوو زەواڵی بۆ ئەبێ.

**٨- عەرش تا قورش کەس بە دۆی خوەی نایەژێ تورش.**

○ از عرش تا کرسی هیچ کسی به دوغ خود نمی‌گوید ترش است.

● **واته:** هیچ کەس ماڵی خۆی قەڵب نادا لە قەڵەم.

**٩- عەشرەت گلێرە، وەختی کولێرە!**

○ اقوام و خویشاوندان جمع شوید، هنگام خوردن گرده فرا رسیده است.

● **واته:** قەوم و کەسی خراپ، هەر لە کاتی خۆشیدا پەیدا ئەبن.

**١٠- عەقڵی ها لە ئەژنۆیا.**

○ عقلش در زانویش است.

● **واته:** بێ عەقڵە.

**١١- عەقڵی ها لە چاویا.**

○ عقلش در چشمش است.

● **واته:** بۆ ناسینی خاس و خراپ، رواڵەتی چت لە بەر چاو ئەگرێ و تێنافکرێ.

**١٢- عەمەڵ سس و قسە دروس!**

○ در عمل سست و در گفتار درست.

● بە کەسێک ئەوترێ کە کرداری نەبێ بەڵام هەر قسەی بێ.

**١٣- عیسا بە دین خوەی، موسا بە دین خوەی!**

○ عیسی بر دین خودش، موسی بر دین خودش.

● **واته:** هەر کەس لە سەر باوەڕی خۆی.

**١٤- عیساگرتگیە و مووسا خنیگیە!**

○ عیسی او راگرفته و موسی در( دهان )او( لقمه) چپانده است.

● بە یەکێکی قەڵەو ئەوترێ.

**١٥- عێل باوان عێل.**

○ ایل پشتیبان افراد ایل است.

● **واته:** قەوم و کەس لە تەنگانە دا هۆشیان بەیەکۆیە و پشت یەک نادەن لە زەوی.

# ف

۱- **فرمانکەر بمرێ، تەدەبیرکەر نەمرێ!**

○ خدمتگزار بمیرد ولی چارەاندیش نمیرد.

● **واتە:** دەس و پا ئەگەر بمرن قەیدی نییە، بەڵام گەورەی ماڵ نەمرێ کە ڕێنموونی و سەرپەرستی هەموو ئەکا.

۲- **فرە ئێژێ وکەم ئەژنەوێ!**

○ زیاد می گوید و کم می‌شنود.

● بە یەکێکی قسە زۆرکەر ئەوترێ کە مەجالی بیستنی قسەی مەردومی نەبێ.

۳- **فرە خوەر وکەم‌دەسەڵات.**

○ پر خور و بی عرضه.

● بە یەکێکی زۆر خۆر و نەتوان کار ئەوترێ.

۴- **فرەوێژ، خاس ئێژێ و خراویش ئێژێ.**

○ پرگو، هم خوب می‌گوید و هم بد.

● **واتە:** زۆر وێژ، هەموو قسەیەکی خاس و خراپ بە دەمیا دێ.

**عەرەب ئەڵێ:** المکثارُ مهذارُ. واتە: زۆر وێژ، موفت وێژە.

۵- **فری سوارە.**

○ معادل: بال درآوردە است.

● به یه کێک ئەوترێ کە هەلێکی بۆ رەخسابێ و خۆ بینی گرتبێتی و گوێ بە کەس نەدا.

٦ـ **فوو لە ئاگر بکەیت، سمێڵت ئەسووتێ!**

○ آتش را فوت کنی، سبیلت می‌سوزد.

● **واتە:** ئەگەر لەبەین دوو یا چەن کەسدا دوژمنی و شەڕ دروس بکەی خۆیشت تووشی زەرەر ئەبی.

٧ـ **فەرز بێ، سونەت بەتاڵە.**

○ فرض باشد، سنّت باطل است.

● **واتە:** کەسێ خۆی نیازی بە چتێک بێ، بەخشینی ئەو چتە بە یەکێکی‌تر دروس نی‌یە.

٨ـ **فەقیانە چەرمگ کەرێ نایکێشێ، لەماڵیا نی‌یە دەنکە برویشێ!**

○ آن که آستینی بلند و سفید دارد، یک خر نمی‌تواند حملش کند؛ ولی درخانه‌اش یک دانه بلغور یافته نمی‌شود. معادل: پُز عالی جیب خالی.

● بە یەکێکی فیزقۆز و دەماراوی ئەوترێ کە تەک و پۆزێکی زۆری ببێ بەڵام لە ماڵیا هیچ دەس نەکەوێ.

٩ـ **فەقیر ئەوەسە ئەیوەن بۆ قەساوخانە.**

○ فقیر آن است که می‌برندش به قصّابخانه.

● **واتە:** مرۆڤ نابێ کەرامەتی خۆی لە دەس بدا و لە هەوڵدان و جم و جووڵی ژیان بکەوێ و خۆی بباتە رێزی ماڵاتی نەتوانکارەوە.

١٠ـ **فەقیر گوو ئەکا، چیلکە ئەچێ بە قنگیا!**

○ فقیر در حالت ریدن، چوب به مقعدش فرو می‌رود.

● **واتە:** هەژار لە هەموو کارێکدا، تەنانەت لە ئیشە ئاسایی‌یەکانیشدا، تووشی نەهات و کۆسپ ئەبێ.

١١ـ **فەقیر لای باوە ئەتسێ!**

○ فقر در جهت وزش باد می‌چُسد.

● **واتـە:** فەقیر لە هەموو کاتدا بەد شانسە، تەنانەت ئەوەکاتەیش کە ئەتسێ! با، بـۆی تسەکەی دێنێ بە لووت مەردوما و پێی ئەزانن و لەوێیشا ئابڕوی ئەچێ!

**۱۲- فەقیری خاسە، قۆرتەکانی خراوە!**

○ فقیری خوب است، بدبیاریهای آن بد است.

● قورتەکانی هەژاری، ئەوکۆسپانەیە واسەرچاوەیان دەس تەنگییە و یەکێ دوای یەکێ روو ئەکەنە مرۆڤی هەژار و ژیانی زۆرتر لێ تاڵ ئەکەن.

**۱۳- فێرم مەکە، فێرم ئەکەی تێرم کە.**

○ عادتم مده، حالا که عادتم میدهی، سیرم کن.

● **واتە:** یا پیاوەتی مەکە، یا ئەگەر کردت، با تا سەر بێ.

**۱۴- فێری کەران فێریان مەکەن ؛ فێریان ئەکەن، تێریان کەن.**

○ عادت یافتگان را عادت ندهید ؛ اگر عادتشان میدهید، باید آنها را سیر کنید.

◘ وەکوو پەندی (۱۳)

**۱۵- فیسقەیش لە پای سەنگ و مەن خوەی!**

○ دم جنبانک نیز به حساب وزن و اندازۀ خودش.

● **واتە:** هەرکەس لە ئەندازەی خۆی حیساب و کتێبی لەگەڵ ئەکرێ.

فیسقە: کلکێ هەڵتەکێنە. (مەلێکە بچووکێ لە قەراخی رۆبارانا.)

**۱۶- فیکە بە برای بێ لێو ئەکا!**

○ سوت کشیدن را به برادر بدونلب واگذار میکند!

● **واتە:** ئەوکارە ئەدا بەکەسێ کە ناتوانێ ئەنجامی بدا.

**۱۷- فیکەی خوەی ئەناسێ.**

○ سوت کشیدن خطاب به خودش راتشخیص میدهد.

● بە یەکێکی تێ گەیشتوو ئەوترێ کە ئەگەر قسەیەکیان بە ئاماژە سەبارەت بە ئەوکرد، زوو تێبگا.

# ■ ق

١- **قاتیٚ و قوتیٚ و کیٚخا سلیٚمان!**

○ قاتی و قوتی و کدخدا سلیمان.

● **واته:** کەسێکی ناودار و گەورە لێرەدا نەماوە.

٢- **قاچی شکیاگه وکلکی ئەوەسیٚ!**

○ پایش شکسته‌است و دمش را می‌بندد.

● **واته:** عەیب هالە جێگایەکی ترا و شوێنێکی تر تیمار ئەکەن!

٣- **قاحبه پیر بویٚ، تۆبه ئەکا!**

○ قحبه پیر شود، توبه می‌کند!

● **واته:** خراپ کار وەختێ دەس لە خراپ کاری هەڵئەگرێ کە ئیتر توانی نەمێنێ.

٤- **قازانج هات، سەر مایەی خوارد.**

○ امید سودیابی، سرمایه را از بین برد.

● **واته:** بە هیوای سوود، دەسمایەش لە بەین چوو.

٥- **قازان میٚردان، به چل ساڵ تیٚته کوڵ و به یه‌کجار سەرکوڵ ئەکا.**

○ دیگ مردان با چهل سال به جوش می‌آید و یک مرتبه سرریز می‌کند.

● **واته:** مرۆڤی جوامێر، دەرونی گەورەیە و زوو لە کوورە دەر ناچێ و لە عاستی کۆسپ دا سەبری هەیە و کاتێکیش کە تووڕە ببێ، بێ ماتڵی تۆڵە ئەستێنێ.

**یا ئەڵێن:** قازان مێردان بە چل ساڵ دێتە کوڵ.

۶- **قاز هات لاسایی باز بکاتەو، رێگەروین خوەیشی لە بیرەو چووا**

○ غاز آمد تقلید باز را در بیاورد، راه رفتن خود را نیز فراموش کرد.

کلاغی تک کبک در گوش کرد     تک خویشتن را فراموش کرد     (نظامی)

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەوڵ بدات رێگە و رەوشتی کەسێکی تر فێر ببێ، بەڵام نە تەنیا ئەوە فێر نەبێ، بەڵکوو رەوشتی خۆیشی لە بیرەوە بچێتۆ.

**یا ئەڵێن:** قالاو هات رێگەڕوین کەو فێر بێ، رێگەڕوین خوەیشی لە بیرەو چوو.

۷- **قالاو بەخێو کەی، چاوت دەرتێرێا**

○ کلاغ را خدمت کنی، چشمت را در می‌آورد.

● **واتە:** خزمەت بە یەکێکی بێ نرخ و پێنەزان، ئاکامی شەڕە.

۸- **قالاو بە قالاو ئێژێ روو رەشا**

○ کلاغ بە کلاغ می‌گوید روسیاه!

● بە یەکێک ئەوترێ کە بۆ عەیبێ وا خۆیشی هەیەتی، لە کەسێکی تر رەخنە بگرێ!

**یا وتوویانە:** قەل بە قەل تێژێ روو رەش!

۹- **قاویان خستگەسە شارێ، لە بی، خورما ئەوارێا**

○ در شهر شایع کرده‌اند که از درخت بید، خرما می‌بارد!

● بە تەوس بە یەکێکی رژد و پیسکە ئەوترێ کە بە درۆ ناوبانگی بەخشندە بـوونی دەرکردبێ، بەڵام هیچ وانەبێ و چاوەڕێی پیاوەتی لێ نەکرێ.

۱۰- **قرژانگ دوو سەر، کەس نەگەزێا**

○ خرچنگ دو سر، کسی را نگزد.

● **واتە:** هوشیار بە، گیری کەسانی دوو ڕەنگ و ساختەچی نەکەوی، چـونکە هـەر ئەوەندە گیریان کەوی، دەس لە یەخەت ناکەنەوە.

۱۱- **قژم لە ئاسیاوا چەرمگ نەکردگە.**

● موهایم را در آسیاب سفید نکرده‌ام.

● **واتە:** دنیایە کم دیوە و تەجروبەم هەیە.

۱۲ـ **قسە کەفتە سی و دوو دیانە، ئەکەفێتە سی و دوو زوانە.**

○ حرفی کە بە یک دهن افتاد، بە دهانها نیز خواهد افتاد.

● **واتە:** ئەگەر رازێکت بە لای کەسێکەوە وت ئەبێ خۆت داتیی بۆ ئەوەی کە شارێ پێی بزانێ.

۱۳ـ **قسە، کەم و دڵگر.**

○ سخن، کم و دلنشین.

● **واتە:** کەم قسە بکە، با قسەت گوێگری بێ.

۱۴ـ **قسە لە شێت ناگیرگێ.**

○ سخن دیوانە جای انتقاد نیست.

● ئەم پەندە، تەوسە بە یەکێکی نەزان و دەم شڕ کە قسە فرە ئەدا و وەکوو شێت هەرچی بە دەمیا بێت، تێژێ.

۱۵ـ **قسە لە قافا ئەکرگێت.**

○ حرف را باید بە موقع گفت.

● **واتە:** قسە ئەبێ لە جێگە و وەختی خۆیا بکرێت.

۱۶ـ **قسە هەزارە، دوانی بە کارە.**

○ از هزار کلمە سخن گفتن، دو کلمۀ آن ارزش دارد.

● **واتە:** هەموو قسەیەک سوودی لێ وەرنا گیرێ.

۱۷ـ **قسەی پێشینانە: ماچ سەرەتای گانە!**

○ سخن پیشینیان است: بوسە مقدّمۀ هم آغوش شدن است.

● **واتە:** کرداری دوور لە ئەدەب، لە سەرەتاوە بە وردە گاڵتە دەس پێ ئەکا.

۱۸ـ **قسەی حەق رەقە.**

○ حرف حق سخت است.

● **واتە:** قسەی حەق بۆ ئەو کەسەی واگوێی بیستنی نی‌یە، ناخۆش و تاڵە.

**١٩ـ قسەی خولە، باس بلەی گوم کرد.**

○ حرف راجع به محمود، موضوع ابراهیم را از یاد برد.

● **واتە:** قسەیەکی تازە هاتە ئاراوە و باسی پێشووی لە بیر بردۆ.

**٢٠ـ قسەی خوەت لەکوێ شنەفت؟ لەو جێگا قسەی مەردمیان ئەکرد.**

○ بدگویی از خودت را کجا شنیدی؟ آنجا که از دیگران بدگویی می‌کردند.

● **واتە:** ئەو کەسە وابە لای تۆوە پشتەسەری مەردوم‌بە خراپی قسە ئەکا، بێ گومان قسەی تۆش‌بە خراپی بە لای مەردومی‌ترەوە ئەکا.

**٢١ـ قسەی خوەش، بارۆشەی دڵە. (باوەشێن دڵە)**

سخن دلنشین، باد بزن دل است.

● **واتە:** بە قسەی خۆش دڵ فێنك ئەبێتۆ.

**٢٢ـ قسەی راس، یا لە شێت بژنەوە یا لە منداڵ.**

○ حرف راست را یا از دیوانه بشنو یا از کودک.

● **واتە:** ئەو دوو کەسە درۆ نازانن.

**٢٣ـ قسەی شەو، وەک خەوا!**

○ سخن شب، مثل خواب است.

● **واتە:** قسەو راوێژێ کە لە شەوا بکرێ، کەمتر دێتە ئاراوە و عەمەلی پێ ئەکرێ.

**٢٤ـ قسەی لای کوانگە.**

○ سخن کنار اجاق است.

● بە قسەی بێ نرخ ئەوترێ.

**٢٥ـ قسەیەک بکە بۆ سواو، نەسێخ بسوزێ نەکواو (کەواو).**

○ حرفی بزن برای ثواب، نه سیخ بسوزد نه کباب.

● **واتە:** لە قسە و قەزاوەت دا هەر دوو لایەنی مەسەلە کە وەکوو یەك لە بەر چاو بگرە.

**۲۶ـ قسه‌یه‌ک بکه و دوان بژنه‌وه.**

○ یکی بگو و دو تا بشنو.

● به یه‌کێک ئه‌وترێ که زۆروێژ بێ و گوێ به قسه‌ی مه‌ردوم نه‌دا.

**۲۷ـ قسه‌یه‌ک بکه‌ین بۆ ساحێۆ ماڵ و قسه‌یه‌کیش بۆ دز.**

○ سخنی برای رعایت حق صاحب خانه گفته‌شود و سخنی نیز به جانبداری‌از دزد.

● **واته:** مرۆڤ له کێشه‌ی نێوان دوو که‌سی حه‌ق دار و بێ حه‌قدا ئه‌بێ له رووی مرۆڤایه‌تی‌یه‌وه لایه‌نی بێ حه‌قه که‌یش له به‌ر چاو بگرێ.

**۲۸ـ قسه‌یه‌ک که‌وته زارێک، ئه‌که‌وێته شارێک.**

○ سخنی‌که به دهان یک نفر بیفتد، در یک شهر پخش خواهد شد.

تو پیدا مکن راز دل بر کسی  که او خود بگوید بر هر کسی  (سعدی)

● **واته:** رازی خۆت به هیچ که‌س مه‌یه‌ژه با ده‌ماوده‌م نه‌که‌وێ.

**۲۹ـ قسه‌یه‌کیش بکه‌ن بۆ دز.**

○ به جانبداری از دزد هم حرفی بزنید.

● **واته:** ئه‌وه‌یش وا خه‌تاکار دراوه له قه‌ڵه‌م هه‌ر حه‌قێکی مرۆڤایه‌تی هه‌یه و ئه‌بێ ئه‌و حه‌قه‌ی له به‌ر چاو بگیردرێ.

**۳۰ـ قشقه‌ره به خۆرایی پشت گامێش ناخورنێ.**

○ زاغچه رایگان پشت گاومیش را نمی‌خاراند.

● **واته:** ئه‌وکه‌سه‌ی وا خزمه‌تت پێ ئه‌کا، مومکینه هیوایه‌کی پێت بێ و چتێکی لێت گه‌ره‌ک بێ.

**۳۱ـ قشقه‌ره‌ی دایکه به قه‌رانێ ؛ به‌چکه به په‌نج قه‌ران.**

○ زاغچهٔ مادر یک قران ؛ بچّهٔ زاغچه پنج قران.

● **واته:** له روانگه‌ی ئیستعماری‌یه‌وه، مرۆڤی ته‌مه‌ن درێژ دوو عه‌یبی هه‌یه:۱ـ زوو هه‌ڵناخه‌ڵه‌تێ. ۲ـ ته‌مه‌نێکی لێ تێپه‌ڕ بووه و بۆ ئیستعمار خێرناداتۆ.

کە وا بوو هەرزانە! بەڵام کەم تەمەن ئەو دوو عەیبەی بۆ ئیستعمار نی‌یە و لە ئاکام دا گرانترە! جا بۆ حەیوانی پیرو جوانیش هەر ئەو باوەڕە هەیە. پیر دەسەڵێن نابێ و هەرزانە و جوان زوو دەسەڵێن ئەبێ و گرانە.

**٣٢ـ قنگ حیز بە، دەم حیز مەوە!**

○ بد فعل باش ولی دهن هیز مباش.

● **واتە:** بەدفعلی لە دەم حیزی باشترە.

**٣٣ـ قنگ رەش و چەرمگ، لە بگارا دەر ئەکەفێ.**

○ کون سیاه و سفید، در پایاب معلوم می‌شود.

● **واتە:** خاس و خراپ لە تەنگانەدا دەر ئەکەوێ.

**یا ئەڵێن:** قول رەش و چەرمگ لە بگارا دەر ئەکەوێ.

**٣٤ـ قنگ کەر لەکوێنە قشڵاخ ئەگرێ؟**

○ کون خر در کجا قشلاق می‌گیرد؟

● بە یەکێکی بێ‌تەجروبە ئەوترێ بۆ ئەوەی سووکی بکەن.

**٣٥ـ قنگەر و ماس بۆ وەخت خوەی خوەشە.**

○ کنگر و ماست در فصل خودش مزّه می‌دهد.

● **واتە:** هەرچی چتە لە وەختی خۆیا خۆشە.

**٣٦ـ قنگ هەڵە وە، دەم هەڵە مەوە.**

○ کون به جوش باش، دهن خروش مباش.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا دەمی خۆی بۆ راگیر ناکرێ، لە حیز خراپترە.

**٣٧ـ قور بە سەر ئەوە فیرعەون پێ ئێژێ کافر!**

○ گِل بر سر آن که فرعون او را کافر می‌نامد!

● بە یەکێک ئەوترێ کە کەسێکی بەد ناو رەخنەی لێ بگرێ.

**٣٨ـ قوڕ خەسەو هەتکوو دەسە!**

○ گل غلیظ آماده است و با هر دو دست باید برسر مالید.

● **واتـه:** نەهات و بەدبەختی رووی تێ کردوین و ئەبێ خۆمان بە دوو دەس لە قوڕ بگرین.

**۳۹- قورعان بفرۆشم بیەمە تەموورە؟**

○ قرآن بفروشم و با پول آن طنبور بخرم؟

● **واته:** چتێکی بە نرخ و گرینگ لە دەس بدەم بۆ چتێکی سووک؟

**۴۰- قورواق بە واقە زل ناوێ.**

○ قورباغه با واق واق کردن، بزرگ نشان نمی‌دهد.

● **واته:** کەسێکی قەرەچناخ بە جاڕو جەنجاڵ و هەراگەورە نابێ.

**۴۱- قۆلانچە لە بۆی گوڵ سەری ئێشێ!**

○ سوسک از بوی گُل سرش درد می‌گیرد.

● **واته:** بە کەسێکی کەمبایەخ ئەوترێ کە بە فیزێکی پێنەکەوتوو لە چتێکی بە نرخ یانبۆنیکی خۆش، روو هەڵچەرخێنێ.

**۴۲- قۆلانچەیچ لە چاو دایکیەو شیرینە.**

○ سوسک نیز از دیدگاه مادرش زیبا است.

● **واته:** هەموو گیانلەبەرێ منالی خۆی خۆش گەرەکە و زۆر بە جوانی ئەزانێ.

**۴۳- قوڵف بۆ حەڵاڵزادەس.**

○ قفل برای حلال زاده است.

● **واته:** قانوون و ئاداب بۆ مرۆڤی زانا و پاکە، ئەینە نەزان و ناپاک، دیواری ئاسنیش بەری ناگرێ و هەموو سنوورێ ئەشکێنێ.

**۴۴- قومارکەر نەیەژێ بە گونمەو، بۆی ناگوزەرێ!**

○ قمارباز اگر نگوید به تخمم، برایش نمی‌گذرد.

● **واته:** مرۆڤی بێعار ئەگەر خۆی نەدا لە دەرتانی بێعاری، نایکرێ.

**۴۵ـ قۆناخ ناخوەشی ماڵ خوەیانە.**

○ جایگاه نامطلوب او خانۀ خودش است.

● بە ئافرەت یا پیاوێکی هەڵە و هەرزە و پاسووتاو ئەوترێ کە کاتێ لە ماڵی خـۆیا ئۆقرە نەگرێ و هەر بەم لاو بەو لادا بڕوا.

**۴۶ـ قووتە پاڵەوان خواس.**

○ گدای لخت و عور پهلوان خداست.

● **واتە:** مرۆڤی هەژار و دەس‌تەنگ لەوەی کە چتێ لە دەس بدا، خەیاڵی رەحەتە و سەربەستە.

**۴۷ـ قەدر مانگ نی‌یە، تا نەگەیەتە شەو.**

○ ارزش ماه پیدا نیست،تا شب فرانرسد.

● **واتە:** قەدری هەرکەس لە وەختی نیاز بەوکەسەدا، دەرئەکەوێ.

**۴۸ـ قەرانێکم نی‌یە بیەمە شێڵانە، دایکم ئێژێ ژن بێرانە!**

○ یک ریال ندارم زردآلو بخرم، مادرم می‌گوید ازدواج کن.

● **واتە:** بە پێچەوانەی بۆچوونی مەردم، من زۆر دەس تەنگم و لەعاستی ئەنجامی ئەم کارە بەر نایەم.

**۴۹ـ قەرزار نەمرێت، قەرز بار ئەکات.**

○ بدهکار نمیرد، بدهی را می‌پردازد.

● **واتە:** مرۆڤی دروسکار ماڵی مەردوم ناخوا مەگەر بە مردنی.

**۵۰ـ قەرز دوو ماڵ ئاوان ئەکاتەو.**

○ قرض دو خانه را آباد می‌کند.

● ئەو دوو ماڵە بریتین لە : ماڵی قیامەتی ئەوکەسەی وا قەرز ئەدا بە یەکێکی موحتاج و دەس‌تەنگ ؛ ماڵی دنیای ئەوکەسە موحتاجە کە قەرزی کردووە.

**۵۱ـ قەرزکردن خوەشە، دانەوەی ناخوەشە.**

○ قرض کردن لذّت بخش است، پس دادن آن ناگوار.

● به ئەو کەسانە ئەوترێ کە لە دانەوەی قەرز عاجزن.

**۵۲ـ قەرز کۆنە ئەوێ، وەلێ نافەوتێ.**

● قرض کهنه می‌شود، ولی از بین نمی‌رود.

● بەو قەرزە ئەوترێ نافەوتێ، وا ها بە لای مرۆڤی دروسکار بەڵام دەس تەنگەوە.

**۵۳ـ قەرزکوێر، تاکەوشت تێبگرێ، هەڵیگرە و برۆ!**

○ بدهکار بد حساب، اگر لنگه کفش نیز به سوی تو پرت کرد، آن را بردار و برو.

● **واتە:** لە دەستی قەرزاری ناڕاست، هەرچیت دەس‌کەوت لێی لامەدە و وەری‌گرە.

**۵۴ـ قەرزە کۆنە و قەوم دوور وڵات کەفتکەسەو بیری!**

○ قرض کهنه و قوم و خویش دور از وطن را به یاد می‌آورد.

● بە یەکێکی لێ‌قەوماو ئەوترێ کە دەستی لە هەموو لایەکەوە بڕابێ و بیری قەرزە کۆنەو قەوم و کەسی دوورکەوتوو، بکاتۆ بۆ ئەوەی فریای کەون.

**۵۵ـ قەزای دێزە کەفت لە گۆزە.**

○ کوزه بلاگردان دیزی شد.

● **واتە:** یەکێکی بێ وجوود مرد و قەزا و بەڵای بێ وجوودێکی تری برد.

**۵۶ـ قەساسە قەڵ‌مەساسە.**

○ قصاص را باید پس داد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە کارێکی خراپی کردبێ ؛ واتە ئەبێ تۆڵەی ئەو کارە خراپەت لێ بکەنەوە و ئەو کوتە کە لە کەمەرت دەن.

قەساس: تۆڵە، کەیفەر / قەڵ: کەمەر/ مەساس: کوتەک، داردەس.

**۵۷ـ قەساو هەڵسا، سەگ نیشتە جێگەی.***

○ قصّاب بلند شد، سگ جای او را گرفت.

● **واتە:** هەر کەس موڵۆزمێکی خۆی هەیە.

**۵۸ـ قەساو هەوڵ پی (یا: پێسە) و بزن هەوڵ گیان!**

○ قصّاب دلهرۀ پیه (یا: پوست) را دارد و بز دلهرۀ جان خود را.

● **واتە:** هەرکەس ها لە بیری خێری خۆیا.

**۵۹ـ قەل هەڵفری و قشقەرە نیشتە جێگەی.**

○ کلاغ پرواز کرد و زاغچە بە جای او نشست.

● **واتە:** کەسێکی بێ‌حەیا رۆیشت و یەکێکی بێ حەیاتر لەو هاتە جێگەی.

**۶۰ـ قەنی! تۆچە و سەگە شەر چە؟**

○ «تولە»! تو را بە نزاع‌باسگها چە کار؟

● بە یەکێکی بێ‌وجوود و بێ‌هێز ئەوترێ کە خۆی ئاوێتەی سەرقاڵی و ئاژاوەیەك کردبێ و لێی دەرنەچێ.

**۶۱ـ قەورکەن بیزانیایە کەی ئەمرێ، قەورێکی بۆ خوەی ئەکەند.**

○ گورکن اگر می‌دانست کی می‌میرد، گوری برای خود می‌کند.

● **واتە:** هیچ کەس غەیب نازانێ تا خێری خۆی ببینێ.

**۶۲ـ قەوم ژنان پالەبەرە، قەوم مێردان دەر بە دەرە.**

○ خویشاوند زن مقبول است و خویشاوند شوهر مردود.

● ژن لە هاتنی قەوم وکەسی خۆی بۆ ماڵیان هیچ لێڵ نابێ، بەڵام بە هاتنی قەوم وکەسی مێردەکەی تێك ئەچێ.

**۶۳ـ قەوم و خوێش گۆشت یەک بخوەن، پێشەی یەک ناشکنن.**

○ قوم و خویش گوشت هم دیگر را بخورند، استخوان همدیگررانمی‌شکنند.

● **واتە:** قەوم و خوێش ئەگەرلەگەڵ‌یەکیشدا شەڕبکەن، هەرچتێکی تێدا تێڵنەوە.

**۶۴ـ قەیسەری لێ بووە بە کونا مشک!**

○ قیصری بە نظر او چون سوراخ موش شدە است.

● بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر ترسابێ و بە شوێنی جێگایەکی نهێنی‌دا بگەڕێ کە خۆی بشارێتۆ.

**۶۵ـ قیاس کەشک بە مەشک ئەکا!**

○ قیاس کشک به مشک می‌کند.

● **واتە:** ئەو دوو چتە یا ئەو دوو کەسە پێکەوە قیاس ناکرێن چون زۆر لە یەک دوورن.

**۶۶ـ قیچ بەلای کوێرەو، پیاڵە چاوە!**

○ شخص دوبین نزد کور، کاسه چشم جلوه می‌کند.

● **واتە:** نیوە عەیبدار بەلای تەواو عەیبدارەوە بێ عەیب ئەنوێنێ.

**۶۷ـ قێخای پیر، میر دەرەبەگە.**

○ کدخدای پیر، امیر خان بزرگ است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە جێگایەکدا زۆر مابێتۆ و ئێستا بووبێ بەگەورە و خاوەن ئیختیاری ئەو جێگە.

**۶۸ـ قین ماڵ ئاواکەر، قین ماڵ وێران کەر!**

○ قهرِ خانه آباد کن، قهرِ خانه ویران کن.

● **واتە:** بەعزە وەختێ قین‌کردن ئەبێ بە خێر و ئەرژێ بە سەر قین‌کەرا، بەڵام بەعەزە جارێکیش قین‌کردن ئەبێ بە نگبەت و خاوەن قین لە بەش بێوەری ئەکا.

# ◼ ک

۱- **کا بۆ خوەم و جۆ بۆ کەرەکەم!**

○ کاه برای خودم و جو برای خرم.

● بە کەسێکی تەماعکار ئەوترێ کە زیادتر لە ئەندازەی خۆی پا دابکێشێ.

۲- **کار بە وەختی، پاشای سەر تەختی.**

○ کار به موقع، پادشاه سرتخت هستی.

● **واتە:** سەرکەوتن لەوە دایە کە هەرکارێ بە وەختی خۆی بکرێ.

۳- **کار خواس و مەکر بەنە، قلێنچکە لە بان جووچکە بەنە.**

○ کار خدا است و مکر بنده، دنبالچه به دُم بند است.

● **واتە:** ئەگەرچی هەموو کارێ ها لە دەستی قودرەتی خودا دا، بەڵام هەموو مەکر و فێڵێ کیش هالەژێر سەری عەبدی فێڵبازی خودا دا.

۴- **کار سازم نارد، کار بسازنێ، نەمزانی کارساز، کار ئەترازنێ!**

○ کار ساز را فرستادم، کار را انجام بدهد، نفهمیدم که او کار را خراب می‌کند.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا باوەڕم پێ بوو ناردم کارە کەم بۆ جێ بە جێ بکا، بەڵام ئەو، لەو دەرفەتە بە سوودی خۆی کەڵکی وەرگرت و کارە کەی منی خراپ کرد. بۆ نموونە ناردم ژنم بۆ خوازبێنی بکا، کە چی هەر ئەو ئافرەتەی بۆ خۆی خوازبێنی کرد و لە دەستی منی دەرکردا!

٥- **کار، کار کارەکەرە و ناو، ناو خانم!**

○ کار راکلفت انجام می‌دهد و به نام خانم تمام می‌شود.

● **واتە:** کار کەسێکی تر ئەیکا و بارەقەڵاییەکەی بۆ کەسێکی ترە!

٦- **کار گەورە بە ئینسان بووچک مەسپێرە!**

○ کار بزرگ رابە آدم کوچک واگذار مکن.

● **واتە:** کاری گەورە ئەبێ بە مرۆڤی دڵدار و زانا و رەسەن بسپێردرێ.

٧- **کارەکان ئەوجلێ لە بانی، کارەکان ئەمیش عاڵەم پێ زانی.**

○ کارهای او روپوشی بر روی آن، کارهای این یکی افشای عالم شد.

● **واتە:** یەکێ هەیە هەرچی هەڵە بکاکەس پێی نازانێ، بەڵام یەکێکی تر هەرکارێ بکا، هەموو کەس تێ ئەگا!

٨- **کارێ بکە بۆ سواو، نە سیخ بسووزێ، نە کەواو.**

○ کاری بکن برای ثواب، نه سیخ بسوزد نه کباب.

● **واتە:** دوو لایەنی کارە کە لە بەر چاو بگرە.

٩- **کاسە پر بوێ، قڵم ئەوێتەو.**

○ کاسە پر شود، سرریز می‌کند.

● **واتە:** هەر چتێک لە ئەندازەی خۆی دەرچێ، سەر رێژ ئەکا.

١٠- **کاسە لە ئاش گەرمترا**

○ کاسە از آش داغ‌تر.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆرتر لە خاوەن ئیشەکە زکەدرِێ بکا.

١١- **کاسە هاوسای ماڵ گەل، زک تێر ناکا، مەیل گەرم ئەکا.**

○ کاسهٔ غذای همسایه شکم را سیر نمی‌کند، اشتهارا بیشتر می‌کند.

● **واتە:** ئەگەر چاوت بە دەستی خەڵکەوە بێت، دایمە موحتاج ئەبی و بە چاوەڕێیی خۆ ئەگری.

**١٢ـ کاسەی پر ئاشتی ماڵە.**

○ کاسهٔ پر آشتی خانه است.

◘ **وەکوو:** سفرەی پڕ ئاشتی ماڵە.

**١٣ـ کاسەی ماڵ هاوسا، یا بەر لە شێو یا دوای شێوا**

○ کاسهٔ غذای همسایه یا پیش از وعدهٔ شام می‌رسد یا پس از آن.

● **واتە:** مرۆڤی بە غیرەت نابێ بۆ گوزەرانی ژیانی خۆی چاوەڕێی یارمەتی مەردوم بێ.

**یا ئەڵێن:** کاسە هاوسای ماڵان یا بەر لە شێو یا دوای شێو.

**١۴ـ کاسەیەک ها لە ژێر ئەم نیم کاسەدا.**

○ کاسه‌ای زیر این نیم کاسه است.

● **واتە:** فێڵ و فەرەزێ هالە ئەم کارەدا.

**١۵ـ کاڵەک ئەخوەی، لە پای لەرزیشیا دانیشە.**

○ خربزه می‌خوری، پای لرزش هم بنشین.

● **واتە:** کاتێ کە خۆت دەس ئەدەی بە کارێکی ناشیرینەوە، ئەبێ بۆ ئاکامی نالەباریشی خۆت ئامادە کەی.

**١۶ـ کاڵەک خوەری یا بێسان رن؟**

○ خربزه می‌خوری یا بوته‌های جالیز را از ریشه می‌کنی؟

● **واتە:** تۆ هاتوی خێرێکت دەسگیر بێ یا خراپ کاری بکەی؟

**١٧ـ کاڵەک شیرین ئەوێتە قسمەت رێویا**

○ خربزهٔ شیرین قسمت روباه می‌شود.

● **واتە:** چتی چاک ئەبێ بە نەسیبی کەسێکی گەن و بێ‌نرخ.

**١٨ـ کانی‌یەک وا ئاوی لێ ئەخوەیتەوکوچکی (بەردی) تێ مەخە.**

○ درچشمه‌ای که از آن آب می‌نوشی، سنگ میناداز.

● **واتە:** بەو کەسە یا بەو جێگایە وا خاسی‌یەکیان لەگەڵ تۆ کردووە، خەیانەت مەکە.

**۱۹ـ کاورا نەیزانی لە ماڵ خوەیا بروێشین دروس بکات، ئەچوو بۆ ماڵ هاوسا، رشتە پڵاوی دروس ئەکردا**

○ یارو بلد نبود در خانۀ خودش آش بلغور درست کند، می‌رفت خانۀ همسایە، رشتە پلو درست می‌کرد.

● بە یەکێك ئەوترێ کە کارێ نەزانێ و بە ماڵی مەردم خۆی فێری ئەوکارە بکا.

**۲۰ـ کاوریان بۆ سەر برینە!**

○ برۀ نر را برای ذبح کردن می‌خواهند.

● **واتە:** ئەرکی سەرشانی کوڕی بەغیرەت، پارێزداری لە ماڵ و ناموس و شەرەف وکەرامەتی بنەماڵەو میللەتەکەیەتی و ئەگونجێ لەم رێگایشدا خۆی بەکوشت دا.

**وتوویانە:** بەرخی نێر بۆ سەربڕینە.

**۲۱ـ کاورێ نەخواردم، بزنێ دۆراندم!**

○ برّەای نخوردم، بزی هم از دست دادم!

● **واتە:** بۆ چتێ چووم، ئەوم بە دەس نەهاورد و چتێکیشم لە دەس دا.

**۲۲ـ کاوە بۆ فەرەیدون شۆرشی کرد.**

○ کاوە برای فریدون قیام کرد.

● **واتە:** یەکێ هەوڵ ئەدا و یەکێکی تر لەو هەوڵە، بەهرە ئەگرێ.

**۲۳ـ کا، هین خوەت نی‌یە، کایەن هین خوەتە!**

○ کاە از خودت نیست، کاهدان از خودت است!

● **واتە:** ئەگەرچی ئەو خواردەمەنیە کە کەوتوی بە سەریا مفتەیە، بەڵام زك هی خۆتە، کەم بخۆ با زکت تەقە نەکا!

**۲۴ـ کای کۆنە ئەداتە با.**

○ کاە کهنە را باد می‌دهد.

● **واتە:** وردە گلەیی ئەکا / قسەی کۆن و بێ کەڵک ئەکا.

**٢٥- کتکان نین لە ماڵا، مشکان تری لی لانیانە!**

○ گربەها در خانە نیستند، موشها بە جست و خیز پرداختەاند.

● بە کوڕان یا کچانێ ئەوترێ کە باوك و دایکیان لە ماڵەوە نەبن و ئەوان بە ئارەزووی خۆیان چی ئەبێ بیکەن، ئەیکەن!

**٢٦- کتک بۆ رەزای خوا مشک ناگرێت.**

○ گربە برای رضای خدا موش نمی‌گیرد.

● **واتە:** مرۆڤی نادروست، لە بەر پیاوەتی کاری بە رواڵەت دروست ناکا، بەڵکو سوودی خۆی تێدا ئەبینێ.

**٢٧- کتک دەمی بە دووگ نەئەگەیی، ئەیوت سۆڵە!**

○ گربە دهانش بە دنبە نمی‌رسید، می‌گفت شور است!

● بە یەکێك ئەوترێ کە رەخنە لە چتێکی دڵخوازی خۆی بگرێ، کاتێ کەلەو چتەبێوەری کرابێ.

**٢٨- کتک کەفتگەسە شواڵی!**

○ گربە در شلوارش افتادە است!

● **واتە:** رسوا بووە ؛ ترساوە.

**٢٩- کتک گووی بۆ خوەی ئەکرد و چاوی لە مەردم دائەچەقان!**

○ گربە برای خودش می‌رید و بە مردم سیخ نگاە می‌کرد!

● **واتە:** ئەو کابرایە بۆ خۆی کار ئە کا و بە سەر مەردومدا منەت ئە کا.

**یا ئەڵێن:** کتك بۆ خوەی گوو ئە کا و چاو لە مەردم زاق ئە کاتەو.

**٣٠- کتک وتی بە مشک: لەم کونا تا ئەوکونا برۆ، هەزار لیرە بسێنە. مشک وتی: رێگە بەم نزیکی‌یەو پووڵ بەم فرەیی‌یە، باعیس سەرمە!**

○ گربە بە موش گفت: از این سوراخ تا آن سوراخ برو، هزار لیرە بستان.
موش گفت: راە بە این نزدیکی و پول بە این زیادی، سرم را از دست خواهم داد.

● **واتە:** ئەو دانە وا دوژمن ئەیرێژێ و ئەو بەڵێنە خێرە وا ئەو ئەیدا، فێڵ و فەرەزێکی

تێدایە. کەوا بوو فریو مەخۆ.

**۳۱ـ کتک و مشک بە یەکەو ئاو ئەخوەنەوا!**

○ گربە و موش با هم آب می‌خورند.

● **واتە:** دەورەی عەدڵ و ئەمنە و کەس لە کەس زوڵم ناکا.

**۳۲ـ کراس قورعان بکەیتە بەرت، باوەرت پێ ناکەن!**

○ پیراهنی از قرآن هم بپوشی، به تو باور ندارند.

● **واتە:** کەسێ کە ناو بانگی بە درۆزنی دەرچوو، ئیتر ئەستەمە باوەڕی پێ بکرێ.

**۳۳ـ کراس کەتان شۆرەی تێ، زک لە برسیا قۆرەی تێ!**

○ پیراهن کتانش بلند است، درحالی که شکمش از گرسنگی قار و قور می‌کند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە فیز و دەمارێکی بەرزی ببێ، بەڵام بۆ نانی شێو موحتاج بێ!

**۳۴ـ کراسێ بە چەپەڵی، هەزار بە پاکی!**

○ پیراهنی به کثیفی، هزار به پاکی!

● **واتە:** یەک جار بەدناوی، هەزارجار پاکی وخۆشناوی بە ئاوا ئەدا.

**۳۵ـ کردن، هەتا مردن.**

○ کار کردن تا مردن.

● **واتە:** مرۆڤ تا زیندووە ئەبێ بۆ بەڕێوە بردنی ژیان تێبکۆشێ.

**۳۶ـ کردەوەی بووچک لە قسەی زل خاسترە.**

○ کردار کوچک از ادّعای بزرگ بهتر است.

● **واتە:** کردەوەت ببێ و دەعیەت نەبێ.

**۳۷ـ کردەی پەشیمان بە، نەک نەکردەی پەشیمان.**

○ عمل کردهٔ پشیمان باش، نه عمل نکردهٔ پشیمان.

● **واتە:** کارێک بکەیت و پەشیمان ببیتۆ، باشترە لەوەی ئەو کارەت نەکردبێت و پەشیمان ببیتۆ کە بۆچی نەت کردووە.

**٣٨- کردەی کەر و خوردەی یابوو.**

○ کارکرد خر و خورده یابو.

● **واتە:** یەکێ زەحمەت بکێشێ و یەکێکی تر لە بەرهەمەکەی کەڵك وەرگرێ.

**یا ئەڵێن:** کردەی گا و خوردەی کەر.

**٣٩- کردەی من و بردەی تۆ.**

○ کردۀ من و بردۀ تو.

● **واتە:** من کارم کرد و تۆ بەهرەکەت برد.

**٤٠- کشەکشە پۆپەرەشە، مێوان شەوێ دوو شەو خوەشە!**

○ کیش کیش مرغ کاکل سیاه، مهمان یکی دو شب عزیز است.

● **واتە:** لە ماڵاندا بەمیوانی ئەونە دانیشە، لێت وەڕس نەبن و دەرت نەکەن. ئەم مەسیلە بە میوانێکی بێشەرم وتراوە کە لە ماڵێکدا دایکوتاوە و دانیشتووە و بە هیچ کولۆجێ ناڕوا؛ جاکەیوانووی ماڵ بە تەوس ئەداله مریشکەکەی خۆیان و بە دەنگی بەرز ئێژێ: کشە، کشە... بەڵکوو میوانی ناحاڵی تێبگا و بڕوا(جا، بڕوا بۆ مەسیلەی دوایی).

**٤١- کشەکشە پۆپە لارێ، مێوان پایز تا بەهارێ! (یا: من مێوانم تا بەهارێ)**

○ کیش کیش مرغ کاکل کج، مهمان پاییز تا بهار می‌ماند.

● ئەمە جوابی ئەو میوانە بێشەرم و بێعارەیە بە کەیوانووی ئەوماڵە (کە لە مەسیلەی پێش‌دا دیمان) وە نیشان ئەداکە میوانەکە مەیلی ڕۆیشتنی لەو ماڵە نی‌یەو تابەهار ئەمێنێتو. جا ئیتر مەگەر بەکوتەك دەری کەن. چوون وتوویانە: زانا بە ئیشارە و نەزان بە کوتەك!

**٤٢- کفن‌دز ئێژێ: کفن بە من ببرگێ، مردگ هەر گۆر بە گۆربێ.**

○ کفن دزد می‌گوید: کفن نصیب من بشود، مرده گور به گورا!

● **واتە:** هەر کەس ها لە بیری خێری خۆیا.

**٤٣- کفن مفتە، مەلا خوەی بۆ پاڵ ئەخا!**

○ کفن مفت، مُلاّ خودش را برای به دست آوردن آن، به مردگی می‌زندا!

● **واته:** چتی مفته، هەموو کەس ئەخەڵەتێنێ.

**۴۴- کفنی لەکوێ بوو تا قەوری لەکوێ بێ!**

○ کفنش کجا بود تا گورش کجا باشد.

● بە یەکێکی دەس‌تەنگ و هەژار ئەوترێ.

**۴۵- کڵاش بۆ دۆمەژن باشە.**

○ گیوه برای زن گیوه‌کش خوب است.

● **واته:** هەرکارێ بە دەستی ئوساکاری خۆی جێ‌بەجێ ئەبێ.

**۴۶- کڵاش خوەت بکەرە سەرین.**

○ از گیوهٔ خودت به عنوان متّکا استفاده کن.

● **واته:** پشت بە خۆت ببەستەو روو لەکەس مەخە.

**۴۷- کڵاو خوەت بکە بە قازی.**

○ کلاه خودت را قاضی کن.

● **واته:** خۆت وەکیل بە.

**۴۸- کڵاوەکەیشم بکەفێتە ئێنە، ناچم بۆی!**

○ کلاهم نیز آنجا بیفتد، دنبالش نمی‌روم!

● **واته:** ئەونە لەو جێگە و ئەو کەسە یا ئەو کەسانە بێزارم کە حازر نیم بیان بینم.

**۴۹- کڵاوی لە راسی دریاگە.**

○ کلاهش از راستی پاره شده است.

● **واته:** راستگۆیە.

**۵۰- کلکە سووتێ ئەکات.**

○ دم می‌جنباند.

● **واته:** خوڵتە ئەکا.

**۵۱ـ کوتەک ئەزانێ، قۆناغ هالەکوێ!**

○ کُتک می‌داند، مسیر و مقصد کجاست!

● **واتە:** مەگەر بە لێدان ئەو موشکیلە حەل ببێ.

**۵۲ـ کوتەک لە بەهەشتەو هاتگە!**

○ کتک از بهشت آمده است.

● بە ئەوس ئەوترێ لەکاتێکداکە نەسیحەت کارساز نەبێ. واتە: تاکوتەک لە بەینا نەبێ ئەو کارە سەر ناگرێ.

**۵۳ـ کوتەکی ئاسیاو ئەگەڕنێ!**

○ کتک او آسیاب را می‌گرداند.

● بە یەکێکی زاڵم ئەوترێ.

**یا ئەڵێن:** کوتەکی ئاسیاو دێم ئەگەڕنێ.

**۵۴ـ کوچک ئەونە سەنگینە، تا لە جێگەی خوەی نەجوێ!**

○ سنگ تا وقتی سنگین است که از جای خود تکان نخورده باشد.

● **واتە:** مرۆڤ ئەگەر زۆر ئەم لاوئەولا بکا،واتە زۆربگەڕێ، سووک ئەبێ.

**۵۵ـ کوچکێ ئەخەین بە دارا، یا ئەیگرێ یا نایگرێ!**

○ سنگی بە سوی درخت پرتاب می‌کنیم، یا می‌گیرد یا نمی‌گیرد.

● **واتە:** دەستێ بۆ ئەو کارە ئەبەین، خۆ زەرەر ناکەین یا ئەیگرێ یا نایگرێ.

**۵۶ـ کوچکێک بێ‌عەقڵ بیخاتە چا، هەزار عاقڵ دەری نایەرێت!**

○ سنگی راکە یک شخص نادان در چاه بیندازد، هزار دانا نمی‌تواند آن را بیرون بیاورد.

● **واتە:** کارێکی خراپ کە کەسێکی نەزان بیکا، بە هەزار زانا دروست نابێتو.

**۵۷ـ کوڵک ئەرزێنێت!**

○ کرک می‌ریزاند.

● بە یەکێکی سەقیل و ماڵ خۆنەخۆر ئەوترێ. بە کەسێکی دەس تەنگیش وتراوە.

**۵۸ـ کور ئازا ماڵی بۆ چەس؟ کور گەنیش ماڵی بۆ چەس؟**

○ پسر زیرک ارث می‌خواهد چه‌کار؟ پسر بی عرضه هم ارث می‌خواهد چه کار؟

● **واتە:** کوڕی زیرەک بێ ئەوەی چاوەڕوانی میراتی باوکی بێ، بە لێ هاتویی، نانی خۆی دەردێنێ. کوڕی خوێڕیش میراتی باوکی لە کەمترین کاتدا لەبەین ئەبا و ئەو میراتەی نەبێ چاکترە.

**۵۹ـ کور ژن بێرێ تونە مەجازە، کەنیشک شوو بکا، دەماخی سازە.**

● پسر زن بگیرد مزاجی عصبی پیدا می‌کند؛ دختر، شوهر کند، سرحال و شادمان می‌شود.

○ چونکە کوڕ ئەکەوێتە ژێر باری بەرپرسی و بەڕێوەبردنی ماڵ‌ومنداڵ، بەڵام کچ ئازاد ئەبێ و لە ژێر پرس و جۆی باوک و دایک دەرئەچێ.

**۶۰ـ کورد بدوێنە، شەرع خوەی ئەکا!**

○ کُرد را وادار به سخن گفتن بکن، حقیقت رامی‌گوید.

● **واتە:** کورد دڵپاکە و ئەگەر خەتایە کیشی کردبێ راستی ئێژێ.

**۶۱ـ کورد فیشەکدان با لە خوەی، شا بەسەپان ناگرێ!**

○ کُرد قطار فشنگ به خود ببندد، شاه را به کارگری نمی‌گیرد.

● **واتە:** کورد عاشقی تفەنگ و ئازایەتی وتێکۆشانەو هەرئەوەندە دەستی بە چەک بگا، کەم‌کەس پێی ئەوێرێ.

**۶۲ـ کورد نەچێتە بازار، بازار ئەگەنێ!**

○ کُرد به بازار نرود، بازار می‌گندد.

● بەتەوس ئەوترێ بەوکەسەی والە خاس و خراپی جنس لە بازاڕدا ناپرسێ و هەرچی بێ هەر ئەیسێنێ.

**۶۳ـ کور سەگ بە گورگ بخنکنە!**

○ توله سگ را به وسیله گرگ خفه کن.

● **واتە:** کەسێکی دڕندە و بێ‌حەیا، بە دەستی بێ‌حەیاتر لە خۆی لە بەین بەرە.

**۶۴ـ کور مەردم ئەکاتە قوربان کەنیشک خوەی!**

○ پسر مردم را قربانی دختر خودش می‌کند.

● **واتە:** کچی خۆی بۆ گرینگترە لە کوڕی خەڵکی، کچەکەی خۆی رەحەت بێ، زاوا بۆی گرینگ نی‌یە.

**۶۵ـ کور و کاور نێر، وە شەوێ هەڵ ئەکەون.**

○ پسر زیرک و برّهٔ نر در یک شب گل می‌کنند.

● **واتـە:** هەڵێ ئەرەخسێ و کوڕی ئازا خۆی نیشان ئەدا. هەروا کە کاوڕی نێریش بە سەروەشاندنێ ئەبێ بە بەران.

**۶۶ـ ... بێ مووی گەرەکە!**

○ ... بی‌مو می‌خواهد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە پەڵپ و بەهانەی بێ جێگە بگرێ.

**۶۷ـ ... بەر کوانگ قەدری نی‌یە.**

○ ... جلواجاق بی‌ارزش جلوه می‌کند.

● **واتە:** چتی خۆماڵی بێ نرخ ئەداتە چاو.

**۶۸ـ کۆز کار بوینە و کەوچکی لێ داگرە!**

○ آغل بزغاله را ببین و قاشق بزن.

● **واتە:** بۆ چۆنیەتی ماڵی خاوەن ماڵ بڕوا و دوای ئەوە تەماعی تێ کە.

کۆز: جێگەی کارژەلەو بەرخی تازە پەیدا بووە. / کار: کارژەلە.

**۶۹ـ کۆسە چوو بۆ ریش، سمێڵیشی نیا بانی.**

○ کوسه رفت برای ریش، سبیلش را نیز از دست داد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بچێ بۆ بە دەس هێنانی چتێ، بەڵام نە تەنیا ئەو چتەی دەس نەکەوێ، بەڵکوو چتێکیش لە دەس‌بدا.

**۷۰ـ کۆڵەی خوەی بخوات و ماڵان نەگەرێ.**

○ نان سوختۀ خود را بخورد و به خانۀ مردم نرود.

● **واتە:** بە کەم و کورتي خۆیەوە بسازێ و دەستي نیاز بۆ خەڵکی درێژ نەکاتۆ.

**۷۱ـ کونا مشکی لێ بووگەسە قەپسەری!**

○ سوراخ موش در نظر او چون کاخ می‌نماید.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر تـرسابێ و لە بـیری خـۆشاردنەوەدابـێ و کـون بـە گون دەرچێ.

**۷۲ـ کۆڵەی پەلیچ چت بەنرخە، دۆس، دۆ، شەراو، تۆتن، ژن.**

○ کهنۀ پنج چیز با ارزش است: دوست، دوغ، شراب، توتون، زن.

● قسەی تێدا نی‌یە.

**۷۳ـ کۆڵەی خوەت پینە و پەرۆکەو تازەی مەردم لەبەر مەکە.**

○ کهنۀ خودت را پینه بزن و تازۀ مردم را به تن مکن.

● **واتە:** بە کەم‌وکەسری خۆتەوە بسازە و روو لە خەڵکي مەخە.

**۷۴ـ کوولەکە رەنگ ئەکات و بەنرخ هیلکەی نەورۆزی لەی‌فرۆشێ!**

○ کدو رنگ می‌کند و به بهای تخم مرغ نوروزی می‌فروشد.

● بە یەکێکی ساختەچي و فێڵەباز ئەوترێ کە خەڵک فریو بدات.

**۷۵ـ کوێر چەی گەرەکە؟ دوو چاو ساق.**

○ کور چه می‌خواهد؟ دو چشم سالم.

● بە یەکێک ئەوترێ کە دوور لە باوەڕ بە دڵخوازی خۆی بگا

**۷۶ـ کوێر لیت چوماقی بوینە!**

○ کور لیستي چماقي را ببین.

● **واتە:** چاوت بکەرەوە و لێ قەوماو ببینە و دەرس بگرە.

**۷۷ـ کوێر هەتا ماگە بە تەمای چاوە.**

○ کور تا زنده است به انتظار چشم است.

● **واتە:** مرۆڤ تا ماوە بە هیوا زیندووە.

**٧٨ـ کەچەڵ! بە چ حاڵێ، تۆ بە فاڵی، قنگ هەڵ ئەماڵی ؟**

○ کچل! باچه‌حالی، هرزه‌گردی می‌کنی و خودت را نشان می‌دهی ؟

● بە کەسێکی فەقیر و دەست تەنگ ئەوترێ کە چۆنیەتی هەژاری خۆی لە بیر بباتەوەو جحێڵی بکا.

**٧٩ـ کەچەڵ تیمار کەر بوایە تیمار سەر خوەی ئەکرد.**

○ کچل اگر می‌توانست تیمار بکند، سر خود را تیمار می‌کرد.

نظیر: کَل اگر طبیب بودی سر خود دوا نمودی.

● بەتەوس ئەوترێ‌بەیەکێک کە خۆی دەردێکی ببێ و کەسانێکی ناشارەزا چاوەڕێ بن ئەو هەمان دەرد لە کەسێکی تر دەوا بکا. جا مەعلومە ئەگەر ئەو بتوانێ، هەوەڵ دەردەکەی خۆی دەوا ئەکا.

**٨٠ـ کەچەڵ سەری بە تۆپەڵە ماس ئەشکێ!**

○ کچل سرش با گلولهٔ ماست می‌شکند.

● بە یەکێکی هەژار و کەم دەسەڵات ئەوترێ کە بەرگەی شەڕ و شۆڕ نەگرێ.

**٨١ـ کەچەڵ لە سەری ئەترسێ وکوێر لە چاوی!**

○ کچل ترس سرش را دارد و کور ترس چشمش را.

● **واتە:** هەر کەس لەو چتە ئەترسێ وا نی‌یەتی.

**٨٢ـ کەچەڵ هەر ئەونەیە ستەمە، کڵاوەکەی داکەفێ، لە تەک داکەفت، ئیتر پەکی ناکەفێ.**

○ کچل تا زمانی مشکل دارد که کلاه از سرش بیفتد، وقتی چنین شد، دیگر مشکلی ندارد.

● **واتە:** بەعزە کەسێ هەر ئەونە عیبیان ئاشکرا بوو، ئیتر زاتیان ئەشکێ و هەرچی مەیلیان بێ ئەیکەن.

**۸۳ـ کە خوا بیدا، پیغەمبەریش دەستێکی تێ ئەخا.**

○ خدا بدهد، پیغمبر نیز دستی به کمک دراز می‌کند.

● **واتە:** ئەگەر بەخت یاری بکا، لە هەموو لایەکەوە دەرگای رەحمەت ئەکرێتەوە.

**۸۴ـ کەر ئەگەر بە پەیژەدا سەرکەوت، خەسوویش خۆشی لە ووی ئێت!**

○ خر اگر از نردبان بالا رفت، مادر شوهر نیز از عروس خوشش خواهد آمد.

● **واتە:** کارێکی موحاڵە کە خەسوو، خۆشی لە بووک بێ.

**۸۵ـ کەر بارەکەی نە ئەبرد، ناوبارێشیان ئەخست!**

○ خر نمی توانست بار را ببرد، سربارش هم اضافه می‌کردند.

● **واتە:** بە کێ کارێکی نەئەتوانی، چتێ زیاتریشیان لێ داوا ئەکرد.

**۸۶ـ کەر باریشی تفەنگ بێ، گورگ هەر ئەیخوا!**

○ خر بارش هم تفنگ باشد، گرگ او را می‌خورد.

● **واتە:** ئازایەتی ئەگەر بێ، ها لە زاتی مرۆڤ دا؛ ئامرازی شەڕ ئازایەتی نادا بە کەس،
**یا ئەڵێن:** کەر بارەکەی تفەنگیش بێ، گورگ هەر ئەیخوا.

**۸۷ـ کەر بتۆپێ، زەماوەنی سەگە!**

○ خر سقط شود، جشن و پایکوبی سگ است.

● **واتە:** ئەگەر کەسێکی دەوڵەمەندی نان نەخۆر بمرێ و ماڵێکی زۆری لێ جێ‌بمێنێ،
خزم و کەسی لاشخۆر کە بە میراتەکەی ئەو ئەگەن، لە خۆشی‌دا پلەزیقانێ ئەکەن.

**۸۸ـ کەر بتۆپێ، قەل بەلاوە چاوی دەرتێرێ.**

○ خر سقط شود، کلاغ ابتدا چشمهایش را درمی‌آورد.

● **واتە:** چاوی کراوە، نیشانەی ژیانە و قەل لێی ئەترسێ و ئەوەڵ چاوی کەرە تۆپیو
دەردێنێ، دوای ئەوە ئەیخوا.

**۸۹ـ کەر بچێتە بەغا، ناوێ بە هێسرا**

○ خر به بغداد هم برود، استر نمی‌شود.

● **واتە:** بە کێکی هیچ و پووچ ئەگەر هەلێکی بۆ برەخسێ و بە پایەومەقامێکی بەرزیش

بگا، زاتی ناگۆڕێ و هەروا هیچ و پووچە.
**یا ئەڵێن:** کەر بچێتە بەغا، ناوێتە قاتر!

**۹۰- کەر، بە جۆ بمرێ، شەهیدە!**

○ خر با خوردن جو بمیرد، شهید است.

● بە تەوس بە کەسێکی زۆر خۆر ئەوترێ، کە زۆری خواردبێ و نەخۆش کەوتبێ.

**۹۱- کەر بەستە و خاوەن رەستە.**

○ خر بسته و صاحبش رسته.

● **واتە:** بیر و هۆشت بە لای ماڵی خۆتەوە بێت و خەیاڵت رەحەت‌بێ.

**۹۲- کەر بە کاروانی چاخەو ناوێ.**

○ خر با یک دفعه به کاروان رفتن چاق نمی‌شود.

● **واتە:** بە یە ک کەڕەت نانی میوانی خواردن، مرۆڤی زک برسی و بێ نرخ قەڵەو نابێتۆ.

**۹۳- کەر بە کۆپانەو ماقووڵ ناوێت.**

○ الاغ با پالان نجیب نمی‌شود.

| | |
|---|---|
| هیچ صیقل نکو نـدانـد کـرد | آهنی را کـه بـد گـهر بـاشد |
| خر عیسی گرش به مکّه برند | چون بیاید هنوز خـر بـاشد. |

(سعدی)

● **واتە:** جل و بەرگی تازە و پوختە یان مەقام و پلەی دنیایی، مرۆڤی بێ‌نرخ و نەفام، ماقووڵ ناکا.

**۹۴- کەر بەلایەو، وەسە سەعات سازا!**

○ خر در مقایسه با او، مثل ساعت ساز است.

● بە کەسێکی گەوج و تێ‌نەگەیشتوو، ئەوترێ.

**۹۵- کەر بێرن و ترۆتی بار کەن!**

○ خر بیاورید و رسوایی بار کنید.

● وەختێ ئەوترێ کە قەباحەتێکی زۆر بارهاتبێ.

**۹۶ـ کەر پیر و هەوسارنۆ، لووشکە لووشکیە لە دەور جۆ!**

○ خر پیر و افسار تازه، در اطراف جو بو می‌کشد.

● بە پیاوێکی پڕ تەمەن و بێ‌شەرم ئەوترێ کە خۆی دابێ لە دەق و چاوی بڕیبێ لە ماڵ و ناموسی مەردم!

**۹۷ـ کەر تۆپی، کەمای بۆ چەس ؟**

○ خر سقط شد، دیگر کما برای چه ؟

● **واتە:** چت بۆ وەختی خۆی بە کەڵک دێ، لە وەختی تێپەڕ بوو سوودی نی‌یە.

**۹۸ـ کەر تێر جۆی خوارد، سەرەی تێ!**

○ خر اگر جو زیاد بخورد، عرعر می‌کند.

● **واتە:** یە کێکی بێ نرخ و پووچ ئەگەر بە پلە و مەقامێ بگا، هار ئەبێ.

**۹۹ـ کەر چاوی کەفتە وێنجە، کەفتە سەرە سەرا!**

○ خر یونجه را دید و شروع به عرعر کرد.

● بە پیاوێکی سووک و بێ شەرم ئەوترێ کە بە دیتنی کچان و ژنان دەست و پای خۆی گوم بکا و حەرەکەت هایەکی ناشیرینی لێ سەربدا.

**۱۰۰ـ کەر چەرمگ بۆ بارەلۆکە زەرەری هەس.**

○ خر سفید برای بار پنبه ضرر دارد.

● **واتە:** هاوڕێی خراپ زەرەری لە سوودی زۆرترە.

**۱۰۱ـ کەر خوەمە وگوێی ناڵ ئەکەم!**

○ خر خودم است و گوشش را نعل می‌کنم.

● **واتە:** ماڵی خۆمە و هەر چۆن گەرەکم بێ لە سەری موعامەلە ئەکەم.

**۱۰۲ـ کەر دوو دەفعە ئەکەنێ: جارێ تەک مەردما و جارێکیش وا خوەی قسەکەی حاڵی ئەوێ!**

○ آدم کر دوبار می‌خندد: یک دفعه با مردم و دفعهٔ دیگر وقتی که خودش آن حرف خنده‌دار را حالی می‌شود.

● **واتە:** مرۆڤی ناحاڵی هەمیشە لە تێ گەیشتندا، هالە دوای خەڵکەوە.

**۱۰۳ـ کەر دێزگ بە تۆپین خوەی رازی‌یە،بەو شەرتە زەرەر لە ساحێوی بکەفێ!**

○ خر دیز به مردن خود راضی است، به شرطی که صاحبش دچار ضرر شود.

● بە یەکێکی قۆشمە و بێ‌فەڕ ئەوترێ کە بە مەرگی خۆی رازی بێ بەو شەرتەی زەرەری خەڵکی تێدا بێ.

**۱۰۴ـ کەر شەریکی، گورگ ئەیخوات.**

○ الاغ اشتراکی را گرگ می‌خورد.

● **واتە:** بۆ ماڵی شەریکی دڵسۆزی ناکرێ.

**۱۰۵ـ کەر شەکەت و ساحێو ماڵ نارازی!**

○ خر خسته و صاحب خانه ناراضی.

● بە کەسانێکی سپڵەو ناشوکور ئەوترێ کەعەزیەتی کەسیان لەبەرچاو نەبێ‌و هەر بۆ سوودی خۆیان بڕوانن.

**۱۰۶ـ کەر کوڵ و بار سۆک.**

○ خر دم بریده و بار سبک.

● **واتە:** هەرچتێ لە پای سەنگ و مەن خۆی.

**۱۰۷ـ کەر کەفت و کونە دریا.**

○ خر افتاد و مشک پاره شد.

● **واتە:** ئەو کارە ناتەواو ما.

**۱۰۸ـ کەر لە کۆپان خوەی راناکا.**

○ خر از پالان خود فرار نمی‌کند.

● **واتە:** کەریش بە ئەرکی سەرشانی خۆی شارەزایە و شان ئەداتە ژێری.

**۱۰۹ـ کەر لە کەر جێ‌بمێنێ، لووت و گوێچکەی ئەکەن!**

○ خر از خر عقب بماند، بینی و گوشش را می‌بُرند.

● **واته:** تۆ کەری بێگانە، ئەگەر لە خۆفرۆشیدا لە هاوماڵی خۆی دوا بکەوێ، لووت و گوێی ئەبڕن.

**۱۱۰ـ کەر لە هەرگا، ئەگێ!**

○ خر را در گِل مورد تجاوز قرار می‌دهد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە تەگانەدا زۆر بۆ کەسێك بێنی و تەنگی پێ هەڵچنێ. واتە: بۆ هەل ئەگەڕێ.

**۱۱۱ـ کەر لە هەرگاگیر بکا، ساحێو ماڵ لەگشت کەس بە قوەت ترە.**

○ خر در گل گیر کند، صاحب خانه از همه کس زورمندتر است.

● **واته:** خاوەن ماڵ لە هەموو کەس بۆ ماڵی خۆی دڵسۆزترە.

**یا ئەڵێن:** کەر لە قوڕاگیر کات، خاوەنی لەگشت کەس زیاتر لی ئەنەوێ.

**۱۱۲ـ کەرم پێ ئەگێن و شایەتیمانیشم پێ تێرن!**

○ وادارم می‌کنند هم با الاغ جفتگیری کنم و هم لفظ شهادتین جاری کنم.

● **واته:** بە زۆر دوو کاری دژی یەکم پێ ئەکەن.

**۱۱۳ـ کەر مەردم وگای مەردم، ئەگەر نەیرانم، نامەردم.**

○ خر مردم و گاو مردم، اگراستفاده نکنم، نامرد هستم.

مشابه: سنگ مفت و گنجشک مفت.

● **واته:** ئەبێ لەم هەلە کە بۆم رەخساوە بەباشی کەڵك وەرگرم، ئەینە پیاو نیم.

**۱۱۴ـ کەر ناو جۆگەلەس، لەهەرتک لا، ئەخوا!**

○ خر وسط جوی است، از هر دو طرف می‌چرد.

● بە یەکێکی ساختەچی و ریاکار و دوو روو ئەوترێ کە لە دوو لای جیاوازەوە کەڵك وەرگرێ.

**۱۱۵ـ کەری بە پەیغام ئاو ئەخوا!**

○ خرش با پیغام آب می‌خورد.

● بە یەکێکی بە دەمار و خۆبین ئەوترێ کە گەرەکی بێ هەموو کارەکانی بە راسپاردن

ئەنجام بدرێ.

**۱۱۶ـ کەر وەختێ ئەسەرنێ، گورگ بۆ خاوەنەکەی تێرێ!**

○ خر وقتی عرعر کند، گرگ را برای صاحبش فرا می‌خواند.

● **واتە:** کەسێکی نەفام، بە قسەی بێ حیساب و بێ جێگەی خۆی دوژمن ئاڵۆز ئەکا و بۆ شەڕ هەڵی ئەخڕێنێ.

**یا ئەڵێن:** کەر ئەسەڕنێ، گورگ بۆ خوەی تێرێ.

**۱۱۷ـ کەرە رەش نۆی برد، دەیش ئەوا!**

○ خر سیاه، نُه من حمل کرد ده من نیز حمل می‌کند.

● **واتە:** جیاوازی‌یەکی زۆر لە بەین قورسی ئەو دووبارەدا نی‌یە.

**یا ئەڵێن:** کەر هەشتی برد، نۆیش ئەوا.

**۱۱۸ـ کەرە کوڵ تری، نان خوەی بری!**

○ خر دم بریده گوزید، خوراک خود را قطع کرد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەڵەیەکی کردبێ و بەشی خۆی بڕیبێ.

**۱۱۹ـ کەرەکە مەمرە بەهارە، چووزەی کەما دیارە!**

○ خره ممیر بهار آمده و گیاه کما جوانه زده است.

● کاتێ ئەوترێ کە بیانەوێ رەخنە بگرن لە بەڵێنی دوور و درێژی کەسێک.

**۱۲۰ـ کەرە کەوگ چووە بۆ بەغا و هاتۆ، بووە قاترا!**

○ الاغ دیز رفت بغداد و برگشت، قاطر شد.

● بە کابرایەکی بێ‌نرخ ئەوترێ کە وابزانێ بەو سەفەرە کە کردویەتی، ئاڵ و گۆڕێ بە سەریا هاتووە! بەڵام هەر ئەوە بێ وا لە پێشدا بووە و هیچ نە گۆڕابێ.

**۱۲۱ـ کەرە کەوگ لە دەس من دەرچوو، خوای ئەکرد سەری بە هەزارەو ئەنیا!**

○ خر کبود از دست من در رفت، خدا کند سر به پرتگاه بگذارد.

● **واتە:** ئەوەی وا لە دەس من دەرچوو، چی بە سەردا دێت، با بێت.

**۱۲۲ـ کەرە لەکوێ کەفتی وکونە لەکوێ دریای!**

○ خره، کجا افتادی و مشک آب کجا سوراخ شدی!

● **واتە:** ئەو دوو قسە یا ئەو دووکارە زۆر لە یەک دوورن.

**۱۲۳ـ کەر هەر ئەوکەرەسە، کۆپانەکەی گۆریاگە!**

○ خر همان خر است، پالانش عوض شده است.

● بە یەکێکی بێ وجوود و بێ‌نرخ ئەوترێ کە بە پلە و مەقامێکی مەدەنی گەیشتبێ، بەڵام هیچ فەرقێکی زاتی نەکردبێ.

**۱۲۴ـ کەرێ بە چەپکێ پیاز بی‌سێنی، لە قورا وا جێ‌ئەمێنێ!**

○ خری راکه در ازای یک دسته پیاز خریداری کنی، این گونه در گل می‌ماند.

● **واتە:** هیچ هەرزانێ بێ‌دەلیل نی‌یە.

**۱۲۵ـ کەرێ بەرە کەرێ، سنان لە بنچکی دەرێ.**

○ خری بده و خری بگیر، به درد بی درمان دچار شود.

● **واتە:** چتێکت داوەو چتێکی هەر وەکوو ئەوەت بە دەس هێناوە و لە نەتیجەدا موعاملەیەکی هیچت کردووە.

**۱۲۶ـ کەری نەو، کۆپانی ئەسەند!**

○ خر نداشت، پالان می‌خرید.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بە خەیاڵ بژی.

**۱۲۷ـ کەس بوو بە ناکەس، ناکەس بوو بەکەس!**

○ کس، ناکس شد و ناکس، کس.

● **واتە:** مرۆڤی نەجیب و خانەدان، بێ‌قەدر بوون وکەسانێکی ناوەجاخ و بێ‌ناو و نیشان دەوریان بە دەستەوەیە و خۆیان حیسابن.

**۱۲۸ـ کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ.**

○ کس با خیال صاحب مال نشده است.

● **واته:** به تەنیا خەیاڵ کردنەوە، کەس سەر ناکەوێ.

**۱۲۹ـ کەس بە دۆی خوەی نایەژێ تورش.**

○ هیچکس به دوغ خود نمی‌گوید ترش است.

● **واته:** کەس ماڵی خۆی خراپ نادا لە قەڵەم.

**۱۳۰ـ کەس گوو بە کڵاوی ناپێوێ!**

○ هیچکس گُه به کلاهش پیمانه نمی‌کند.

● **واته:** هیچ کەس، بە هیچ، حیسابی ناکا.

**۱۳۱ـ کەس نەتسێ و کەس نەترێ، میرەلی خەوی ئەزرێ!**

○ کسی نچسد و کسی نگوزد، میرعلی خوابش می‌پرد.

● بە یەکێکی فیز قۆز و لە خۆڕازی ئەوترێ کە تەمای بێ هەموو دەور و بەری تەسلیمی ئەو بن.

**۱۳۲ـ کەس نەکێڵ و بەردە رەق!**

○ محل غیر قابل شخم و سنگلاخ.

● بە جێگایەکی خراپ و وێران ئەوترێ.

**۱۳۳ـ کەسێ بە بەخت خوەی رازی نەوێ، گیرۆدەی بەختەرەشی ئەوێ.**

○ کسی به بخت خود راضی نباشد، گرفتار سیاه بختی می‌شود.

● **واته:** بەوەی وا هەتە رازی بە.

**۱۳۴ـ کەسێ بە زۆر بیگێن، لەشی چەپەڵ ناوێ.**

○ کسی را با زور مورد تجاوز قرار دهند، جُنُب نمی‌شود.

● **واته:** کاری زۆر حوکمی لە سەر نی‌یە.

**۱۳۵ـ کەسێ بە مەویژێ نەزانێ، بە کەویژێ نازانێ!**

○ کسی که قدرشناس دانه‌ای مویز(خدمتی مختصر) نباشد، قدرشناس کاسه‌ای پُر نیز نخواهد بود.

● **واته:** کەسێ بە پیاوەتی‌یەکی کەم نەزانێ، بە زۆریشی هەرنازانێ.

مەویژ: مێوژ / کەویژ: کەویج، قەفیز.

**١٣٦ـ کەسێ تا پیاز نەخوا، بۆی پیازی لێ نایە.**

○ کسی تا پیاز نخورد، بوی پیاز نمی‌دهد.

● **واته:** تاکەسێ کارێکی خراپی نەکردبێ، سەبارەت بەو قسە ناکەن.

**١٣٧ـ کەسێ چووە شارکوێران، ئەشێ دەس بگرێ بە چاویەو.**

○ کسی به شهر کوران برود، باید جلو چشم خود را بگیرد.

● **واته:** هاوڕەنگی جەماعەت بە، با رسوا نەبی.

**١٣٨ـ کەسێ دایک خوەی باتەگان، بە دایک مەردم رەحم ناکا!**

○ کسی برای مادر خود دیّوثی کند، به مادر مردم رحم نمی‌کند.

● **واته:** ئەو کەسەی رەحم بەکەس و کاری خۆی نەکا، رەحم بە بێگانە هەر ناکا.

**١٣٩ـ کەسێ سیر نەخوات، بۆی سیر لە دەمی نایەت.**

○ کسی سیر نخورد، بوی سیر از دهانش نمی‌آید.

● **واته:** تاکەسێ کارێکی خراپی نەکردبێ، لە بارەیەوە قسە ناکەن و بەدناو نابێ.

**١٤٠ـ کەسێ شۆخی ئەکا بە نان جۆ، کە خوەی نان بەهارەی بوێ.**

○ کسی نان جوین را مسخره می‌کند که خودش نان گندم بهاره داشته باشد.

● **واته:** بە چتێ کە خۆت باشتر لەوەت نی‌یە، گاڵتە مەکە.

**١٤١ـ کەسێ کەسە، قسەیەکی بەسە.**

○ کس را یک حرف بس.

● **واته:** مرۆڤی زانا بە ئیشارەیەکی بچووک تێ ئەگا.

**١٤٢ـ کەسێ گولۆڵەی بکەفێتە لێژی، کەس خاسی نایەژێ.**

○ کسی گلوله‌اش به سرازیری بیفتد، هیچ کسی از او به خوبی یاد نمی‌کند.

● **واته:** ئەوەی وا نەهاتیەتی، ناویشی بە خاسە نابەن.

**۱۴۳ـ کەسێ لە گورگ بترسێ، ئەشێ سەگ نگابێرێ.**

○ کسی از گرگ بترسد، باید سگ نگهداری کند.

● **واتە:** کەسێ دوژمنی ببێ یا مەترسی لە کەسێ بکا، ئەبێ ئامرازی پارێزداری لە خۆی فەراهەم بکا.

**۱۴۴ـ کەسێ ماسی بگرێ، قنگی تەر ئەوێ!**

○ کسی ماهی بگیرد، کونش خیس می‌شود.

● **واتە:** هەر کارێک زەحمەتی پێویستە.

**۱۴۵ـ کەشکیش هەر برای دۆس!**

○ کشک نیز برادر دوغ است.

● بە دوو کەسی هاو خۆ ئەوترێ، واتە: ئەمیش هەر وەکوو ئەوە.

**۱۴۶ـ کەفتە تەقەوە!**

○ دچار وهم و تردید شده است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە سەبارەت بە قسە یا ئیشێ لێی کەوتبێتنە شک و گومانەوە و ئەو کەسەیش تا رادەیەک بە مەی زانیبێ و وەهم گرتبێتی.

**۱۴۷ـ کەفتە سەر ساج عەلی.**

○ روی ساج علی افتاد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لێی قەومابێ و لە ماڵی دنیا هیچی بە دەستەوە نەمابێ.

**۱۴۸ـ کەل ئاریز بەم سەختی‌یە و قاتر بەم شیرەتی‌یە، خانم بەم نازاری‌یە و ئاغە بەم ئاڵۆزی‌یە، هەر ناوێت و ناکرگێ!**

○ گردنهٔ آریز به این سختی و قاطر به این چموشی، خانم بااین ظرافت و آقا با این عصبّانیت، اصلاً ممکن نیست راه طی شود.

● قسەی نۆکەرێکی هەژارە کە گیری کردووە لە تەنگ و چەڵەمەیەکداو نەجات بوونی سەختە.

**۱۴۹ـ کەڵ، بە وەتەن شەر ئەکات.**

○ قوچ کوهی به اُنس وطن می‌جنگد.

● **واته:** مرۆڤ بە عەشقی پارێزداری لە وەتەن لەگەڵ دوژمن شەڕ ئەکا.

**١٥٠ـ کەڵپۆس ئەگەر خاس بووایە، لەکۆڵ خاوەنیەو بوو.**

○ عبای پوستین اگر خوب بود، بر دوش صاحبش بود.

● **واته:** ئەو چتە ئەگەر باش بووایە، خاوەنەکەی کەڵکی لێ وەرئەگرت.

**١٥١ـ کەڵەشێر، بانگ ئەدات وگوویش ئەخوات!**

○ خروس اذان می‌گوید و گُه نیز می‌خورد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە هەم قسەی خاس بکات و هەم خراپ.

**١٥٢ـ کەڵەشێر برسی، خەو خەرمان ئاو بردگ ئەوینێ!**

○ خروس گرسنه خواب خرمن آب برده را می‌بیند.

● **واته:** هەر کە لە خەودا ئەو چتە ئەبینێ وا نیازی پێ‌یەتی.

**یا ئەڵێن:** کەڵەشێر برسی و خەرمان ئاو بردگ! / کەڵەشێر خەفتگ و خەرمان ئـاو بردگ!

**١٥٣ـ کەڵەشێر خوەی بە نوخەشەرەو لێ‌نیاگە!**

○ غذای گوشت خروس خودش را با لپّه بار کرده است.

● **واته:** کاروباری کۆکە و بۆی گرتووە.

**١٥٤ـ کەڵەشێر کەفتە سەرچۆپی، مامر لە داخا تۆپی!**

○ خروس شروع کرد به چوپی گرفتن، مرغ از حسادت ترکید.

● **واته:** پیاو کەوتە قیتە قیت و ژنە لە داخا شەقی برد.

**١٥٥ـ کەڵەشێر ناوەخەت بخوێنێ، سەری ئەبرن.**

○ خروس ناوقت بخواند، سرش را می‌بڕّند.

● **واته:** هەر کەس کارێکی بێ‌جێگە بکا، رسوا ئەبێ.

**١٥٦ـ کەڵەشێر نەخوێنێت رۆژ ناوێتوا!**

○ خروس نخواند، صبح نمی‌شود.

● بەتەوس ئەوترێ بەکەسێکی لەخۆرازی ؛ واتە: تۆ نەبی ئەم کارە سەرناگرێ!

**١٥٧ـ کەڵەشێریش نەوێ رۆژ هەر ئەوێتۆ.**

○ خروس نیز نباشد، باز هم صبح فرا خواهد رسید.

● **واتە:** لە هەر حاڵدابێ ئەو کەسەیش ئەو کارە ئەنجام ئەبێ.

**١٥٨ـ کەڵێکمان نەگرتکە، تا پاش کەڵێکیش بگرین!**

○ معادل :بهره‌ای نگرفته‌ایم تا بخواهیم دوباره آن راه را دنبال کنیم.

● **واتە:** لەو رێگاوە خێرێکمان دەسگیر نەبووە تا دوبارە بە شوێنیابڕۆین.

**١٥٩ـ کەم بخۆ و کز دانیشە.**

○ کم بخور و کز کرده بنشین.

● **واتە:** بە کەمی خۆت قەناعەت بکە و باری منەتی مەردم مەکێشە.

**١٦٠ـ کەم بژی و کەڵ بژی.**

○ کم زندگی کن و چون کل (قوچ کوهی) زندگی کن.

● **واتە:** ژینی کورت بەڵام بە سەربەرزی، جێگەی شانازی‌یە.

**١٦١ـ کەم بۆچە هاتی؟ بۆ فرە!**

○ کم برای چه آمدی؟ برای زیاد.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا دیاری یەکت بۆ دێنێ، چاوەڕوانی یارمەتی‌یە.

**١٦٢ـ کەم بێ و کەم برۆ با قەدرت نەچۆ.**

○ کم بیا و برو تا ارزش تو کاسته نشود.

● **واتە:** کەسێ وا لە پەسا سەر ئەکا بە ماڵان دا، زوو سووک ئەبێ.

**١٦٣ـ کەم روو، کەم رزق.**

○ کم رو، کم روزی.

● **واتە:** کەسێ کەم رووبێ، بەشی ئەخورێ.

**۱۶۴ـ کەم مسە مس بکە، بێژە مسەفای پاک!**

○ کم مسه‌مس بکن، بگو مصطفای پاک.

● **واتە:** ئەو قسەوا ها لە نەزەرتا بێژی، پاک و خاوێن بێژە و منجەمنج مەکە.

**۱۶۵ـ کەم من وکەرەم تۆ.**

○ کم من و کَرَمِ تو.

● **واتە:**چاوەڕوانی پیاوەتی وکەرەمی تۆم.

**۱۶۶ـ کەمەرە و لوولە هارەی تێ، زک لە برسیا قۆرەی تێ!**

○ صدای زیور آلاتش بلند است، در حالی که شکمش از گرسنگی قار و قور می‌کند.

● بە کەسێکی تەڕپۆش بەڵام زک برسی و عەقڵ سووک ئەوترێ.

**۱۶۷ـ کەنگەر و قوماش ناون بە وێڵداش!**

○ کنگر و قماش دوست نمی‌شوند.

● **واتە:** ئەو دوو کەسە نابن بە دۆست.

وێڵداش: وشەیەکی تورکی‌یە. واتە: دۆست.

**۱۶۸ـ کەنیشک خوەت مەکەرە قوربان کور مەردم.**

○ دختر خودت رافدای پسر مردم مکن.

● **واتە:** کچە کەت کە جگەر گۆشەتە، مەیدە بە کوڕێکی خوێڕی و هیچ و پووچ، لە بەر ئەوەی دڵی ئەو کوڕە خۆش کەی، کەچی کچە کەت ئەخەیتە ناو ئاگرەوە!

**۱۶۹ـ کەنیشک دڵی چوو لە شوو، ناپرسێ هەنگوێنە یا گوو!**

○ دختر اگر عاشق کسی شد، دیگر نمی‌پرسد که عسل است یا گُه.

● **واتە:** کچی عەنتەر دڵ هەر ئەوەندە عاشقی پیاوێ بوو لە چۆنیەتی خولق وخۆی ئەو ناپرسێ وشووی پێ ئەکاو لە ئاکامدا پەشیمان ئەبێتۆ.

**۱۷۰ـ کەنیشکێ دایک تاریفی بکا مەگەر خاڵۆ بیخوازێ!**

○ دختری که مادر او را بستاید، مگر به عقد دائی خود دربیاید.

● **واتە:** بێ گومان منداڵ لە چاوی باوك و دایكەوە زۆر خۆشەویستە،بەڵام تاریفی ئەوان لە منداڵ،بەتایبەت تاریفی دایك لە كچ،نەتەنیانرخی پێ نادرێ، بەڵكوو ئەو منداڵەیش بەو تاریفە زۆرتر قەڵب ئەبێ.

**١٧١ـ كەنیلە لە تەک تۆمە وەویلەگوێت لێ وێت!**

○ دخترک روی سخنم با توست، عروس کوچولو تو گوش کن.

● لە كاتێكدا ئەوترێ كە بە شێوەی تەعریز لە یەكێ رەخنەیەك بگیردرێ بەڵام رووی رەخنەكە بۆ لای یەكێكی تر بێت.

◘ **وەكوو:** دار تەك تۆمە، دیوار بژنەوە!

**١٧٢ـ كەنین وگیریان، بە درۆ ناوێ.**

○ خنده و گریه، دروغکی نمی‌شود.

● **واتە:** پێ كەنین یاگریان، سەرچاوكەیەكی هەیە و بێ سەبەب نی‌یە.

**١٧٣ـ كەوا سوور بەرخێڵ!**

○ قبا سرخ جلو دار قبیله.

● بە یەكێكی هەڵ كراوی بێ‌حەیا لە ناو قەومێكدا ئەوترێ.

**١٧٤ـ كەوا نان بخوا!**

○ قبا غذا بخور.

● **واتە:** رۆژگارێكە، بە رواڵەت‌دا ئەڕوانن و لەو روانگەوە قەدر و حورمەت لە مرۆڤ ئەنێن!

◘ **بروانە** بۆ پیتی « د»: دەور كەوا نان بخۆس!

**١٧٥ـ كەو ئەوەسە برامبەر كەو بخوێنێ.**

○ کبک آن است برابر کبک بخواند.

● **واتە:** ئەو كەسەی وا دەعیەیەكی هەیە ئەبێ لە بەرامبەری حەریفی خۆیدا دەعیە بكا.

**١٧٦ـ كەورێشک بە گا ئەگرێت!**

○ خرگوش را با گاو صید می‌کند.

● به یه کێکی زیره‌ک ئه‌وترێ که بتوانێ کارێکی گرینگ به غه‌یری ئامرازی ئه‌وکاره ئه‌نجام بدات، له حاڵێکدا جێگه‌ی ناباوه‌ڕی بێ.

**۱۷۷ـ که‌وش پینه‌چی پاژنه‌ی نی‌یه!**

○ کفش پینه دوز پاشنه ندارد.

● **واته:** ئوسا کار،له‌و کاره‌دا وا بۆ خه‌ڵکی شاره‌زایه، بۆ خۆی ناشاره‌زایه.

**۱۷۸ـ که‌وشه‌کانی بنه لای که‌وشه‌کان خانه‌و.**

○ کفشهایش را بگذار کنار کفش‌های خان.

● به یه کێک ئه‌وترێ که زۆر پێی خۆش بێ خۆی به‌کسانێکی ناوداره‌وه نزیکه‌وه بکاو لافی پێوه لێ بدا.

**۱۷۹ـ که‌وشه کۆنه له بیاوانا نعمه‌ت خواس.**

○ کفش کهنه در بیابان نعمت خداست.

● **واته:** له ته‌نگ و چه‌ڵه‌مه‌ی ژیاندا، هه‌ر جۆره به‌رهه‌مێ که بۆ درێژه پێدانی ژیان ده‌س بدا، نیعمه‌ته.

**۱۸۰ـ که‌و له بگارا ئه‌گیرگێت.**

○ کبک در گُدار شکار می‌شود.

● **واته:** هه‌ر کارێ له جێگه‌و کاتی خۆیدا، ئه‌بێ ئه‌نجام بدرێ.

**۱۸۱ـ که‌و له ده‌ماخی ئه‌په‌رێ!**

○ کبک از دماغش می‌پرد.

● به یه کێکی زۆر خۆشحاڵ و به که‌یف ئه‌وترێ.

**۱۸۲ـ که‌وه ره‌شم فرۆشت دام به که‌واو،کردم به مه‌زه‌ی عاره‌ق و شه‌راو!**

○ کبک خال سیاه را فروختم دادم به کباب، کردمش مزّهٔ عرق و شراب.

● **واته:** چتێکی به نرخم دا له بێعی چتێکی بێ‌نرخ و خراپدا.

**۱۸۳ـ که‌یوانوو، ته‌قه‌ی ده‌سی نایه‌ت.**

○ کدبانو، صدای دستش نمی‌آید.

● **واتە:** بەرپرسی ماڵ هەر نەوعە خراپ کاری‌یەک بکا، کەس پێی نازانێ.

**یا ئەڵێن:** کەوچک کەیوانوو، تەقەی نایەت.

**۱۸۴ـ کێ بە رەنج جەمی کرد و کێ بێ رەنج خواردی!**

○ چە کسی با زحمت جمع کرد و چە کسی بدون زحمت از آن برخوردار شد.

● **واتە:** یەکێ لە تەواوی ژیانیدا هەوڵ و تەقالا ئەدا و ماڵ و دارایی جەم ئەکاتۆ و خۆی لە پەنایدا ناحەسێتۆ و ئەمرێ و میراتبەرەکانی دوای مەرگی ئەو، تەپ ئەدەنە سەر ماڵەکەی و بێ عەزیەت ئەیبەن و ئەیخۆن.

**۱۸۵ـ کێچ بە نرخ گا ئەفرۆشێ!**

○ کک بە نرخ گاو می‌فروشد.

● **واتە:** فێڵە بازە.

**۱۸۶ـ کێچ خوەی چەس تا گازی چەبێت ؟**

○ کک خودش چیست تا گازش چە باشد ؟

● **واتە:** ئەو کەسەبێ‌نرخە چیە تا بتوانێ دەستێ بوەشێنێ؟

**۱۸۷ـ کێچ ناڵ ئەکا!**

○ کک را نعل می‌کند.

● بە یەکێکی فێڵ باز و ساختەچی ئەوترێ.

**۱۸۸ـ کێر ئیمرۆ، بە قنگ سۆزی.**

○ کیر امروز بە کون فردا.

● **واتە:** ئەمڕۆ نەختە و کەڵکی لێ وەرگرە، سبەی نامەعلوومە.

**۱۸۹ـ کێر بە رووا ئەچێ!**

○ کیر بە چهرە فرو می‌رود.

● **واتە:** رووالەت ئافرەت ئەدا بە شوو.

**۱۹۰- گێر گەر و گوز تۆفانە!**

○ کیر خر و کس پشّه.

● بە درو چتی دوور لە یەك ئەوترێ کە هیچ پێوەندی‌یەکیان بە یەکۆ نەبێ.

**۱۹۱- گیسەڵیش کاوێژ ئەکات.**

○ لاکِ پشتِ هم نشخوار می‌کند.

● بە تەوسِ بە یەکێکی سەپۆل و تەمبەڵ ئەوترێ کە دوور لە بڕوا، بێتە قسەکردن.

**۱۹۲- گێف لەرمێت، تاوێ تۆز ئەکا.**

○ کوه فرو می‌ریزد، لحظه‌ای گرد و خاک برپا می‌کند.

● **واتە:** هەر ڕووداوێک ـ بچووك یا گەورە ـ بۆ ماوەیەك لە یاد ئەمێنێ و دوای ئەو ماوە لە بیر ئەچێتۆ.

**۱۹۳- گێف با ئەیوات و کورەکەکەما ئانە بەری!**

○ کوه را باد می‌برد و شاخهٔ کما در مقابل باد قرار می‌دهند.

● **واتە:** ئەو بەڵا وا رووی کردووە، بەم جۆرە ئامرازانە بەری ناگیردرێ.

**۱۹۴- کێف بە کێف ناگەیەت، بنیادەم بە بنیادەم ئەگەیەت.**

○ کوه بە کوه نمی‌رسد، آدم به آدم می‌رسد.

● **واتە:** مرۆڤ هەر کارێکی سەبارەت بە کەسێ کرد، ئەبێ بیربکاتەوە لە دوا ڕۆژی ئەوکارە.

**۱۹۵- گێفێ پرمێ و کەناوێ پرکات.**

○ کوهی فرو ریزد و کندالی را پر کند.

● **واتە:** کەسێکی ماڵدار بمرێ و چەند هەزاری دەور و بەری بە میراتی‌یەك بگەن.

**یا ئەڵێن:** کێفێ ئەڕوخێ و کەنەڵانێ پڕ ئەکاتەو.

# ■ گ

١- **گا، ئەشێ بەگوێرەکەیی، کلکی بشکنی.**

○ گاو باید در مرحلۀ گوسالگی، دمش را بشکنی.

● **واتە:** مرۆڤ لە تەمەنی منالّیدا ئەبێ تالیم بدرێ، کەگەورە بوو، تالیم وەر ناگرێ.

٢- **گا، بۆگا مردگ، ژن، بۆ ژن مردگ.**

○ گاو برای شخص گاو مردە، زن برای شخص زن مردە.

● **واتە:** کەسێ قەدری چتێک ئەزانێ، کە وەکوو ئەو چتەی لە پێشدا بووبێ و لە دەستی دابێ.

٣- **گا بە دەم جووتیارا ئەروانێ.**

○ گاو بە دهن شخم‌زن می‌نگرد.

● **واتە:** ماڵ و منالّ چاو بە دەستی خاوەن ماڵن. یا: ژێر دەستە بۆ بانتر لە خۆی ئەڕوانێ.

٤- **گا، بەگونا ئەناسێ!**

○ گاو نر را با بیضه‌هایش می‌شناسد.

● بە یەکێکی بێ‌عەقڵ و تێ‌نەگەیشتوو ئەوترێ.

٥- **گات لەگاگەلا نەوێ و پات سەرما بیوا!**

○ گاوت در گلّه نباشد و پایت دچار سرمازدگی شود.

● **واتە:** دەستت لە کارێکدا نەبێ و لەوبارەوە تووشی زەرەر بیی.

**۶ـ گا، رووی ڕەشە و توورەکەی پڕ!**

○ گاو، رویش سیاه است و تو بره‌اش پر.

● بە یەکێك ئەوترێ کە دەربەندی عەیب نەبێ، بەڵام هەر بەری پڕ بێ.

**۷ـ گا زەرد! تۆ بخەفە و منیش ئەخەفم، بزانین کاممان لە برسیا ئەمرین؟**

○ ای گاو زرد! تو بخواب و من نیز می‌خوابم، ببینیم کدامیک از گرسنگی خواهیم مرد؟

● شەریکێکی ئازا بە شەریکی تەمبەڵ ئێژێ کە دەستی لە کارکردن کێشابێ و پاڵی دابێتەوە و مەترسی بکرێ کە لە برسا لە بەین بچێ.

**۸ـ گا سوور مامۆ حاجی‌یە، گێرەی خوەیان ناکا، وەلێ لە گێرەی مەردما سەرپەڕە!**

○ گاو سرخ عمو حاجی است، محصول خرمن صاحبش را نمی‌کوبد، ولی در خرمن کوبی مردم، پیشگام است.

● بە یەکێك ئەوترێ کە پێی عەیب بێ کاری ماڵی خۆی بکا، بەڵام لە کارکردن دا بۆ بێگانە، چالاك بێ.

**۹ـ گا، کاوێژ بکا لە حیزی جوتیارە!**

○ گاو نشخوار بکند از بی عرضگی دهقان است.

● بە پیاوێك ئەوترێ کە دەسەڵاتی بە سەر ژێر دەستەکانی خۆیا نەبێ و ئەوان هەر چۆن مەیلیان بێ کار بکەن.

**۱۰ـ گا، کردی و کەر خواردی!**

○ گاو کار کرد و خر بهرهٔ آن را خورد.

● **واتە:** یەکێ زەحمەتێکی کێشاوە و کارێکی کرووە، کەچی یەکێکی تر دێت و بەرهەمی زەحمەتەکەی ئەو ئەخوا.

**۱۱ـ گا گێرە بکا، گمێزی تێ ئەکا.**

○ گاو خرمن بکوبد، در آن می‌شاشد.

● **واتە:** هەرکەسێ کارێبکا،چاوەڕێ ئەکرێ لەوکارەدا هەڵەیش بکا.

**١٢ـ گا، لە ترس گێرە بووە بە مانگا!**

○ گاو نر از ترس خرمن کوبی، ماده گاو شده است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بۆ دەرچوون لە ژێری باری ئەنجامی کارێ، حازر بێ خۆی لە پیاوەتی بخا.

**١٣ـ گا، لە کولانجەوە ئەواتە بان.**

○ گاو را از روزن خانه بالا می‌کشد.

● بە جەردەیەکی زۆر ئازا ئەوترێ.

**١۴ـ گام بە دارە، دوینەم بە بارە، مامۆسا زووکە کورەکەم دەرپارە!**

○ گاوم به شخم بسته است، دوغینه‌ام بار شده است، ماموستا زود پاش پسرم را آزاد کن.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زۆر پەلەی بێ و گەرەکی بێ کارێکی دوور و درێژیشی زوو بۆ ئەنجام بدەن.

**یا ئەڵێن:** گام بە بارە، دوینەم بە دارە، مامۆسا زووکە کوڕەکەم دەربارە.

**١۵ـ گان دەوڵەمەن، جلێ لە بانی،گان رەش و رووت، عالەم پێ زانی!**

○ خطای توانگران، پوشیده و پنهان می‌ماند؛ اما خطای بیچارگان پیدا است و همه از آن باخبر می‌شوند.

● **واتە:** دەوڵەمەن هەر کارێکی خەتا بکا، کەس رەخنەی لێ ناگرێ؛ بەلام هەڵەی هەژار هەموو کەس پێی ئەزانێ و ئەنگووسی بۆ راکێشن.

**١٦ـ گا و ران ئاوایی‌یان ئەبرد، لە مانگا قوڵەیان ئەپرسی!**

○ گله گاو و گوسفند روستا را می‌بردند، از مادّه گاو دم بریده سؤال می‌کردند.

● کاتێ ئەوترێ کە زەرەرێکی قورس رووی دابێ و لە چتێکی بێ نرخ بپرسن.

**١٧ـ گاور بە تەمای سەفەرالی وێ، کەر پشتە رێژ و جەواڵ خالی وێ.**

○ گبر به انتظار صفر علی باشد، باید پشت خرش زخمی شود و جوالش نیز

خالی بماند.

● **واته:** ئەگەر هیوامان بە ئەو کەسە بێ کارێکمان بۆ بکا، ئەبێ ئەوەیشمان وا هەیە لە دەستی بدەین.

**١٨ـ گاوە سنگ ئێژێ: خوەم خوڵ نەکەم بە سەر خوەما، کەس خوڵ ناکا بە سەرما.**

○ گاو آهن می‌گوید: اگر خودم روی سر خودم خاک نریزم، کسی روی سرم خاک نمی‌ریزد.

● **واته:** ئەگەر مرۆڤ خۆی بۆ خۆی نوکوولی و سووکی دروست نەکا، کەس ناتوانێ ئەو سووک و بێنرخ بکا.

**١٩ـ گاوە سنگ لە ناو چاو خوەتا ناوینی، وەلێ دەرزی لە ناو چاو منا ئەوینی!**

○ گاو آهن در چشم خودت نمی‌بینی، اما سوزن در چشم من می‌بینی.

● **واته:** عەیبی گەورەی خۆت نابینی، بەڵام عەیبی بچووکی خەڵك ئەبینی.

**٢٠ـ گا وێڵ ئەکا، گوێرەکە بەخێو ئەکا.**

○ گاو را ول می‌کند، گوساله را پرورش می‌کند.

● بە کەسێك ئەوترێ کە ئەسڵی وێڵ کردبێ و لە فەرع بپرسێ.

**٢١ـ گای بێ گاوانە.**

○ گاو بدون گاوبان است.

● بە یەکێکی بێسەرەوبەرە ئەوترێ.

**٢٢ـ گای خوەش‌دۆوە.**

○ گاو خوش دوغ است.

● بە یەکێکی خێر و بەرەکەت دار ئەوترێ.

**٢٣ـ گای خوەم دی بە دۆڵەو، نیم بە تەنگ هەوانەکۆڵەو.**

○ گاو خودم را در درّه دیده‌ام و به فکر انبان به دوش نیستم.

● بە کەسێ ئەوترێ کە هەرلەبیری خۆیا بێ و موشکیلەی کەس بەلایەوە گرینگ نەبێ.

هەوانە بە کۆڵ: ئەو کەسەیە کە گای گوم بووە و هەوانە نانی کردووە بە شانیا و دۆڵ بە دۆڵ بە شوێنیا ئەگەڕێ.

**٢٤- گای فەقیر، لە جفت خوەیا ناگەرێ!**

○ گاو فقیر در شخم زدن برای صاحبش حرکت نمی‌کند.

● **واتە:** مرۆڤی هەژار لەماڵی خۆیشیا بەختی نییە.

**٢٥- گای ها بە بارەو.**

○ گاوش بار شده است.

● **واتە:** ها لە سەر سەفەر و پەلەیەتی.

**٢٦- گرێیەک بە دەس بکرگێتەو، حەواڵەی دیانی مەکە.**

○ گرهی را که بشود با دست باز کرد، حواله دندان مکن.

● **واتە:** موشکیلەیەك کە ئەتوانی خۆت بە ئاسانی جێ بە جێی بکەی مەیخەرە دەستی کەس و تووشی هەڵەتی مەکە.

**یا ئەڵێن:** گرێی دەس، بە دیان مەکەرەو.

**٢٧- گرەو لە شەیتان ئەواتۆ.**

○ از شیطان گرو می‌برد.

● بە یەکێکی زۆر فێڵەباز و ساختەچی ئەوترێ.

**٢٨- گزگل بکەینە گوێزەوانە!**

○ میوۀ مازوج را به شکرانۀ تولّد آن بچّه بدهیم.

● بە خەبەرێکی هیچ و پووچ ئەوترێ کە مزگێنی هەڵنەگرێ.

**٢٩- گلۆڵەم کەفتە لێژی، هیچ کەس خاسم نایەژێ!**

○ گلوله‌ام به سرازیری افتاد، هیچکس از من به خوبی یاد نمی‌کند.

● **واتە:** بەختم لێ هەڵ گەڕاوەتۆ و کەس دیانی خێرم پێدا نانێ.

**٣٠- گشت ژنێ کەشک ئەکا، ئەوە حەساوە وشکی ئەکا.**

○ هر زنی کشک درست می‌کند، آن که خشکش می‌کند کاری نتیجه‌بخش انجام داده است.

● **واته:** کێ کاره کەی کرد؟ ئەو کەسەی تەواوی کرد.

**۳۱ـ گشت گیانم بکەن دەرزیاژن، هەر پێم بێژن قێخاژن!**

○ همهٔ بدنم را سوزن آجین کنید، به شرطی که مرا زن کدخدا صدا کنید.

● به یە کێک ئەوترێ کە ئەوپەڕی ئاواتی ئەوە بێ بە لەقەبێکی بەرچاو قاوی‌لێ‌بکەن.

**۳۲ـ گشتێ فەرزە، شایی و شیوەن قەرزە.**

○ همه چیز فرض است، شادی و شیون قرض است.

● **واته:** هەموو کارێ جێگای خۆی هەیە، بەڵام شایی و شیوەن دەستەوامە و ئەبێ بدرێتۆ.

**۳۳ـ گشتێ لە باریکییا ئەبرگێ و زوڵم لە کوڵوفتیا!**

○ همه چیز اگر باریک شود پاره می‌شود و ظلم اگر کلفت شود.

● **واته:** کاسەی زوڵمی زاڵم وەختێ پڕ بوو، ئەڕژێ.

**یا ئەڵێن:** گشت چتێك لە باریکییا ئەبچڕگێ، وەلێ زوڵم لە قەویەتییا.

**۳۴ـ گڵ مەیل برە.**

○ خاک قطع میل می‌کند.

● **واته:** کەسێ کە مرد و لەخاکدانێژرا، دوای چەنێ لە بیر ئەچێتۆ.

**۳۵ـ گورگ ئێژێ: ئیمشەو هەورە، دەمم چەورە!**

○ گرگ می‌گوید: امشب ابر است، دهانم چرب است.

● قسەی کەسێکە وا هەلێکی بۆ رەخسابێ و چاوەڕێ بێ بە فێڵەبازی بە تیکەیە کی چەور بگا.

لە شەوی هەور و باران دا، شوان بیری بە لای رانەوە نی‌یە و گورگ دەستی خۆی ئەوەشێنێ.

**۳۶ـ گورگ باران دییە.**

○ گرگ باران دیده.

● بە یەکێکی بە تەجروبە و دنیا دیدە ئەوترێ.

۳۷- **گورگ بتخوا، گورگ وەتەن بتخوا.**

○ گرگ تو را بخورد، ولی گرگ وطن باشد.

● **واتە:** ئەگەر تووشی کۆسپێک بوویت و لە لایەنی هاونیشتمانی خۆتەوە بوو قەیدی نی‌یە.

**یا ئەڵێن:** گورگ وڵات خوەت بتخوا، نەک شێر عەرز بێگانە.

۳۸- **گورگ بنێتە ران، لە پیر و جوان ناپرسێ.**

○ اگر گرگ به گلّه حمله کند، از پیر و جوان نمی‌پرسد.

● **واتە:** زاڵم ئەگەر زوڵمی کرد، لە چۆنیەتی مەزڵووم ناپرسێ.

۳۹- **گورگ بیری ها لە لای هەل و هەڵمەت خوەیەو.**

○ گرگ به فرصت و حملهٔ خود می‌اندیشد.

● **واتە:** زاڵم ها لە بیری ئەوەدا کەی دەرفەتێکی بۆ رێکەوێ و دەستێ بوەشێنێ.

۴۰- **گورگ پیر بوو، ئەوێ بە مەسخەرەی سەگ!**

○ گرگ پیر شود، مورد مسخرهٔ سگ قرار می‌گیرد.

● **واتە:** مرۆڤ کە پیر بوو، ئەبێ بە گاڵتەجاڕی لاوانی بێ‌عەقڵ.

۴۱- **گورگ و مەر بە یەکەو ئاو ئەخوەنەو.**

○ گرگ و گوسفند با هم آب می‌خورند.

● بە دەورەی دادگەری و عەدڵ ئەوترێ.

۴۲- **گورگ و مەر بە یەکەو ناژین.**

○ گرگ و گوسفند با هم نمی‌سازند.

● **واتە:** دوو کەسی زاڵم و مەزڵووم پێکەوە نایانکرێ.

۴۳- **گورگ هار چل رۆژ عومریە.**

○ عمر گرگ هار چهل روز است.

● **واته:** زاڵم زوو زەواڵی بۆ ئەبێ.

**۴۴- گورگە و ها لە پۆس مەرا.**

○ گرگ است و در پوست گوسفند.

● بە یەکێکی خوێنمژ ئەوترێ کە بە رواڵەت فەقیر بێ.

**۴۵- گورگیان کردە وەکێڵ مەرا!**

○ گرگ را وکیل گوسفند کردند.

● **واتە:** پارێزداری لە مافی مەزڵوومێکیان دا بە دەستی زاڵمێکەوە.

**۴۶- گۆڕم نی‌یە، کەفەنم بۆ چەس ؟**

○ گور ندارم، کفن می‌خواهم چه کار؟

● **واتە:** ئەسڵ نەبێ، فەرعم بۆ چییە ؟

**۴۷- گورێس بە یەک لا، نە ئەگەیی‌یەو ، نۆگەی دوولاس!**

○ طناب یک لایه نمی‌رسید، نوبت دو لایه است.

● **واتە:** ئەو کارە بە جۆری ئاسایی جێ بە جێ نەئەبوو، ئێستاش کە تەگەرەیەکی تێ کەوتووە، هەر ئەنجام نابێ.

**۴۸- گورێس مفتەی دەس کەفێ، خوەی پێ ئەخنکنێ!**

○ طناب مفت گیر بیاورد، خودش را با آن خفه می‌کند.

● بە کەسێ ئەوترێ کە لە چتی مفتە خۆی لانەدا ئەگەر بە تەواو بوونی گیانیشی بێ.

**۴۹- گۆزە گشت جارێ ساق نایەتەو لە کانی.**

○ کوزه همیشه سالم از چشمه بر نمی‌گردد.

● **واتە:** مرۆڤ لە کێشەی ژیانیدا بەردەوام سەرکەوتوو نابێ.

**۵۰- گۆزەی سوور تا چل شەو ئاوی خوەشە.**

○ کوزۀ گل سرخ تا چهل شب، آبش گوارا است.

● **واتە:** هەموو چتێ، تا ماوەیەک کەڵکی تایبەتی لێی ئەگیردرێ.

**۵۱گۆشت بگەنێ، خوای ئەکەن، خوا بگەنێ، چە ئەکەن؟**

○ گوشت بگندد نمکش می‌زنند وای به روزی که بگندد نمک.

● **واتە:** هەر موشکلەیەک پێش بێ بە تەدبیری مرۆڤی زانا حەل ئەبێ، جا ئەگەر مرۆڤی زانا خۆی تووشی هەڵە ببێ چارە چی‌یە؟

**۵۲- گۆشت خوەر هەزارە، هەر گورگ بە ناو و هارە.**

○ گوشت خور هزار است، و فقط گرگ بدنام و هار است.

● **واتە:** زاڵم و خوێنمژ زۆرە، بەڵام هەر یەکێ ناوی بە خراپە دەرچووە.

**۵۳- گۆشت سەر چەپەر.**

○ گوشت روی پرچین است.

● بە چتێکی بێ‌ئەرزش ئەوترێ.

**۵۴- گۆشت لاران خوەت بخوە و منەت قەساو مەکێشە.**

○ گوشت کنارهٔ ران خود را بخور و منّت قصّاب را مکش.

● **واتە:** بە کەم و کەسری خۆتەوە بسازە و منەتی کەسان مەکێشە.

**۵۵- گۆشت لایەق بازە.**

○ گوشت لایق باز است.

● **واتە:** چتی باش بۆ کەسێکی لایەق و باش. / بە کەسێک ئەوترێ کە شیاوی ئیشێک بێ.

**۵۶- گۆشتمان لە قازنێکا بە یەکەو ناکوڵێ.**

○ گوشتمان در یک دیگ با هم نمی‌جوشد.

● **واتە:** من و ئەو کەسە، هەر پێکەوە نامان کرێ.

**۵۷- گۆشتی ئەخورگێ.**

○ گوشتش خورده می‌شود.

● بە کەسێکی بێدەم و زوان و کەڕەواڵە ئەوترێ.

**۵۸ـ گۆش عەزیز، گۆشوارە عەزیز!**

○ گوش عزیز، گوشوارە عزیز.

● **واتە:** ئەگەر ئەو کەسە خۆی بۆ تۆ خۆشەویستە، ئەبێ خاتری ئەوانەیش وا ئازیزی ئەو کەسەن، بگری.

**یا ئەڵێن:** گوێ عەزیز، گوارە عەزیز.

**۵۹ـ گۆشت هەرچی لەرە، لە بان نانە.**

○ گوشت هر چند لاغر است، روی نان است.

● **واتە:** هەرکەس بە ئەندازەو شیاوی خۆی قەدر وحورمەتێکی هەیە.

**۶۰ـ گۆشت یەک بخوەن، پێشەی یەک ناشکنن.**

○ گوشت یکدیگر را بخورند، استخوان یکدیگر را نمی‌شکنند.

● **واتە:** ئەو کەسانەی وا باسیان لێی ئەکرێ شایەد زەرەری ماڵی لە یەك بدەن بەڵام زەرەری گیانی‌یان بۆ یەك نابێ.

**۶۱ـ گول، برای پیسە!**

○ جذامی، برادر کثیف است.

● **واتە:** ئەو کەسە لە پیسی‌دا وەکوو ئەوی‌تر وایە و جیاوازی‌یەك لە بەینیانا نی‌یە.

**۶۲ـ گوڵ بێ درک ناوێ.**

○ گل بدون خار ممکن نمی‌شود.

● **واتە:** هەرکەسێکی چاك یا بە دیمەن و جوان، یەکێکی سەرەخەر وا بە لایەوە.

**۶۳ـ گوڵ لە پەین هەڵئەکەوێ!**

○ گل از پهن می‌روید.

● **واتە:** چتی بە نرخ یا مرۆڤی گەورە لە جێگای بێ‌قابل یا لە بنەماڵەی بێ‌ناو و نیشان، هەڵئەکەوێ.

**۶۴ـ گول، نەسەقی زلە!**

○ جذامی، متکبّر است.

● **واتە:** کەسانی بێ نرخ و بێ نموود، دەعیەیان زۆرە.

**۶۵ـ گوڵ نیت، درک مەوە.**

○ گل نیستی، خار مباش.

● **واتە:** ئەگەر پیاوەتی‌یەکت لە دەس نایە، ناپیاویش مەکە.

**۶۶ـ گوڵە ژاڵە، رەنگی ئاڵە،بەڵام تاڵە.**

○ گل ژاله، رنگش قرمز است، ولی تلخ است.

● بە یەکێکی رواڵەت جوان، بەڵام بەدخۆ ئەوترێ.

**۶۷ـ گۆم هەرتا قووڵتر بێ، مەلەی خوەشترە!**

○ ژرفاب تا گودتر باشد، شنا کردن در آن لذّت بخش تر است.

● **واتە:** ئەم پێش هاتە، هەرچی بەربڵاوتر بێ چاکترە.

**۶۸ـ ... خوەی و گەزەر لە یەک جیا ناکاتەوە!**

○ ... خودش و هویج را از یکدیگر تشخیص نمی‌دهد.

● بە یەکێک گەوج و تێ نەگەیشتوو ئەوترێ.

**۶۹ـ گون گون دار دەر تێرێ!**

○ بیضۀ بیضه‌دار را در می‌آورد.

● بە یەکێکی زۆر ئازا و لێ‌هاتوو ئەوترێ.

**۷۰ـ گوو تا چیلکەی تێ‌خەی، بۆ ئەداتۆ.**

○ گُه تا آن را با چوب به هم بزنی بیشتر بو می‌دهد.

● **واتە:** کاری خراپ تا لە سەری بڕۆی زیاتر رسوایی بار تێرێ.

**۷۱ـ گووکردن سەر بەرزی، لە زەماوەن کوێرەدێ خوەشترە!**

○ گُه کردن برفراز جای بلند، از شرکت در عروسی ده کوره خوشتر است.

● **واته:** جێگەی بچووک تەنانەت خۆشیشی دڵ ناگرێ.

**۷۲- گوێرەکەی خۆماڵی بەگا، ناوێ!**

○ گوسالۀ شخصی گاو نمی‌شود.

● **واته:** چتی خۆماڵی قەدری نی‌یە. هەرواکە قەدری منالّی ماڵ،لەلایەنی ئەهلی ئەو ماڵەوەناگیردرێ و دیان بەوە دانانێن کە ئەو منالّە لەداهاتوودا گەورەئەبێ.

**۷۳- گوێرەکەی فەقیر،گوێرەکەی دەوڵەمەنی بەستۆ!**

○ گوسالۀ فقیر، گوسالۀ ثروتمند را مهار کرد.

● **واته:** هەژار، بەرپەڵی دەوڵەمەندە.

ئەم مەسیلە بە پێچەوانەیش وتوویانە: **گـوێرەکـەی دەوڵـەمەن، هـین فـەقیری بەستۆ.** واتە: دەوڵەمەن هەموو چتێکی تەنانەت گوێرەکەشی بەسەرچتی هەژارا زاڵە.

**۷۴- گوێرەکەی مەردم گوێرەوسار ئەورێت!**

○ گوسالۀ مردم طناب را پاره می‌کند.

● **واته:** منالّی مەردم هەر چەندیش خزمەتی بکەی و خۆشت گەرەک بێ، لە ئاکام دا ئەچێتۆ بۆ لای باوانی خۆی و تەرکت ئەکا.

**۷۵- گوێز لە بان گومەزا ناوێسێ.**

○ گردو بر بالای گنبد نمی‌ایستد.

● بە کارێکی نامومکین ئەوترێ.

**۷۶- گوێز لە هەوانەی خوەی ئەشمێرێت!**

○ گردو را از انبان خودش می‌شمارد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بۆ هەموو کەس لە چاوی خۆیەوە بڕوانێ.

**یا ئەڵێن:** گوێز لە گیرفان خوەی ئەژمێرێ.

**۷۷- گوێزی نەماگەوگفنی ئەکا!**

○ گردویش نمانده است و دبّه درمی‌آورد.

● بە کەسێک ئەوترێ کە لە دەست تەنگی‌یا، گز بکا.
**یا ئەڵێن:** گوێزی نەماوە و گزە ئەکا.

**٧٨ـ گەدایی بە چەت بێژم خاس؟ تاوسان پاپەتی و زمسان بێ کراس!**
○ گدائی از چە چیز تو تعریف کنم؟ تابستان پابرهنه و زمستان بدون پیراهن.
● **واتە:** هەژاری لە هەر وەرزێکدا، هەر کەم و کۆڕی هەیە.

**٧٩ـ گەدا بە گەدا، رەحمەت لە خوا.**
○ گدا بە گدا، رحمت از سوی خدا.
● بە دوو کەسی هەژار و دەس تەنگ ئەوترێ کە بە یەک بگەن و چاوەڕوانی یارمەتی‌یان لە یەک بێ.

**٨٠ـ گەدا لای باوە ئەتسێ!**
○ فقیر از سمت جهت وزش باد می‌چسد.
▣ بڕوانە بۆ پیتی «ف»: فەقیر لای باوە ئەتسێ.

**٨١ـ گەدا لە بەر تەماع، منالەکەی کوێر گەرەکە.**
○ گدا از روی طمع، می‌خواهد بچّه‌اش کور باشد.
● **واتە:** گەدای تەماعکار حەز بەوە ئەکا، ماڵ و منالی کوێر بن و سەروەتی پاشەکەوتی ئەو نەبینن و تەماعی تێ نەکەن.

**٨٢ـ گەرەکیە ماسی بگرێت و قولی تەر نەوێ!**
○ می‌خواهد، ماهی صید کند و پایش خیس نشود.
● **واتە:** هەموو کارێ، عەزیەتی هەیە و بێ عەزیەت بەرهەم بە دەس نایەت.

**٨٣ـ گەریە، دریە!**
○ ولگرد، بی حیا است.
● **واتە:** ئەوەی وا زۆر ئەم ماڵ و ئەو ماڵ ئەکا، بێ شەرمە.

**٨٤ـ گەز چە و جاوگ چە؟**

○ گز چه و کرباس چه ؟

● **واته:**من چی ئێژم وتۆچی ئێژی ؟

**۸۵ـ گەدا پاڵەوان خواس.**

○ گدا پهلوان خداست.

● **واته:** هەژار چونکە ماڵی دنیای نی‌یە، ئازاد و سەربەستە.

**۸۶ـ گەدای موعتەبەر، لە خوا بێ خەوەرا!**

○ گدای معتبر، از خدا بی‌خبر.

● **واته:** ئەو گەدایە وا بە دەوڵەت و سەروەتێک ئەگا، خوای خۆی لە بیر ئەچێتۆ.

**۸۷ـ گەماڵ زۆری بۆ بێرا، ئەونەی تانجی‌یەک رائەکا.**

○ سگ را تحت فشار قرار بده، به اندازه یک تازی می‌دود.

● **واته:** زۆر بۆ هەرگیانداری بێرن زیادتر لە توانایی خۆی‌کار ئەکا.

**۸۸ـ گەماڵ لە ترسا ئەوێ بە تانجی.**

○ سگ نر از ترس، تازی می‌شود.

● **واته:** لە ترسا،کاری زۆرتر لە تاقەت ئەکرێ.

**۸۹ـ گەنجت بە بار بێ، بە زەهر مار بێ.**

○ گنجت به بار باشد، زهر مارت شود.

● **واته:** لە بەختی خۆت بێ‌وەری بی.

**۹۰ـ گەنم ئەرێ، جۆ ئەرێ، گاڵە تسنە تویش ئەرێ ؟**

○ گندم آری، جو آری، ارزن چسّو تو هم آری ؟

● بە یەکێکی بێ‌قابل ئەوترێ‌کە گەرەکی بێ لە ناو جەماعەتێکدا خۆی نیشان بدات و پێی نەکەوێ.

**۹۱ـ گەنم وێڵ ئەکا، ئاوگاڵ ئەدا، ماین وێڵ ئەکا وکەر فاڵ ئەدا!**

○ گندمزار را ول می‌کند، ارزن را آبیاری می‌نماید، ماده اسب را ول می‌کند و خر

را به جفت گیری می‌دهد.

● **واته:** ئەوەی بە نرخە، بە فیڕۆی ئەدا و ئەوەی بێ‌نرخە، دەستی پێوە ئەگرێ.

**۹۲ـ گەورە ئاو ئەرژێنێ و بووچک پای تێ ئەخا.**

○ بزرگسال آب می‌ریزد و خردسال پا در آن می‌مالد.

● **واته:** گەورە هەر کارێ بکا، ئەبێ بە سەرمەشق بۆ بچووک.

**۹۳ـ گەورە کچ بە ماچێ حیز ناوێ!**

○ دختر بزرگسال با دادن یک بوسه هیز نمی‌شود.

● **واته:** یەکجار هەڵە کردن بۆ کەسێ کە هەر هەڵەی نەکردبێ قەیدی نی‌یە.

**۹۴ـ گەورەیی خەرجی گرانە.**

○ ادّعای بزرگی کردن هزینۀ زیاد بر می دارد.

● **واته:** دەعیەی گەورەیی کردن ئاسان نی‌یە.

**یا ئەڵێن:** گەورەیی خەرجی هەس.

**۹۵ـ گیا بە جێگەی سەختەو ئەمێنێتەو.**

○ گیاه در محل ناهموار باقی می‌ماند.

● **واته:** چت‌ومەك بە لای‌یەکێکی چروك و پیسکەوە هەر ئەمێنێتەوە.

**۹۶ـ گیا، لە سەر بنج خوەی سەوز ئەوێ.**

○ گیاه از روی ریشۀ خود می‌روید.

● **واته:** هەرچی کەسە لە سەر رەگ و ریشەی بنەماڵەی خۆی ئەڕوێ. ئەم پەندە بۆ مرۆڤی خانەدان ئەوترێ.

**یا ئەڵێن:** گیا، لە سەر بێخی خۆی دەڕوێ.

**۹۷ـ گێج ئەسکەنەرە.**

○ گیج اسکندر است.

● بە کارێکی قووڵ و پڕ خەتەر ئەوترێ.

**٩٨- گێجەنەی درگا، لە یان چاو بنیامەو بکەری، وەلێ هەوگ نەگەری!**

○ پاشنهٔ در روی چشم آدمی بچرخد، ولی هوو چلو چشم آدمی رفت و آمد نکند.

● **واتە:** دوور هەوو چاوی دیتنی یەکیان نی‌یە.

**٩٩- گیرفانم لە مالٌ خوا پاکترە!**

○ جیبم از خانهٔ خدا پاکتر است.

● **واتە:** زۆر نەدار و هەژارم و پارەم نی‌یە.

**١٠٠ گیرفانی بۆ هەلٌدووریگە!**

○ جیبش را برای آن دوخته است.

● **واتە:** بە تەمای کەوتووە.

**١٠١ گێسکەکەی هەیاس خاسە!**

○ بزغالهٔ هیاس خاص است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بەینێ چاخ بێ و بەینێ لەڕ.

⊡ **بروا بۆ پیتی «ت»:** تێژی گێسکەکەی هەیاس خاسە.

**١٠٢ گێسکێ نەخواردم، کاوڕێ دۆراندم!**

○ بزغالەای نخوردم، برّەای باختم.

● **واتە:** نە تەنیا چتێکم دەسگیر نەبوو، چتێکیشم لە دەس دا.

## ل ◘

۱ **لاشەم بە زۆر بکێشم، منەت ناکەس نەکێشم.**

○ بدنم را با زور بکشم، منّت ناکس نکشم.

● **واتە:** خۆت بخەرە عەزیەت و منەت کەس و ناکەس مەکێشە.

۲- **لاف لە غەریبی وگووز لە بیاوان!**

○ لاف در غریبی و گوز در بیابان.

● **واتە:** لاف لێدان لە غەریبی دا چونکە کەس نایناسێ و بە درۆی ناخەنەوە، عەیبی نی‌یە ؛ تڕ لێدانیش لە بیاوانا چونکە کەس گوێی لێ نی‌یە، قەیدی نی‌یە.

۳- **لای باوڕ نەکەر خوەت هیلاک مەکە.**

○ نزد شخص بی‌باور، خودت را خسته مکن.

● **واتە:** قسەکردن لەگەڵ کەسێکی بێباوەڕا، هیچ سوودی نی‌یە، کەوا بوو لەگەڵیا قسە مەکە.

۴- **لای تازە ڕاوکەر واسە،کۆنەڕاوکەر کوێرە!**

○ تازه شکارچی این گونه تصوّر می‌کند که کهنه شکارچی کور است.

● **واتە:** لاوی خاو و بێ تەجروبە وا ئەزانێ گەورەتر لەو چتێ نازانێ.

۵- **لای تیانەی ڕەشۆ دامەنیشە، با ڕەش نەویت.**

○ کنار دیگ سیاه منشین، تا سیاه نشوی.

● **واته:** لە گەڵ کەسانی بەدناوا، هەڵسەو دانیشە مە کە، با بەدناو نەوی.

**یا ئەڵێن:** لای دێزەی رەشۆ دامەنیشە، با رەش نەویت.

۶ـ **لای چاوە ساقەکەوە ئەیدات و لای چاوە کوێرەکەوە ئەیواتەو.**

○ از سمت چشم سالم می‌بخشد و از سمت چشم کور، پس می‌برد.

● **واته:** بەم دەس چتێکت پێ ئەداو بەو دەس ئەیواتۆ.

۷ـ **لای خییەدا چەور ئەوی، لای دێزەدا رەش ئەوی.**

○ در کنار خیک چرب می‌شوی، در کنار دیگ سیاه می‌شوی.

● **واته:** دانیشتن لە گەڵ کەسانێکی بەدناوا، بەدناوت ئە کا.

۸ـ **لای دز وایە، گشت کەس دزە!**

○ از نظر دزد، همه کس دزد است.معادل : (کافر همه را به کیش خود پندارد).

● **واته:** هەموو کەس لە چاوی خۆیەوە بۆ دنیا ئەڕوانێ.

۹ـ **لای کەر واسە، گشت کەس کاسە!**

○ کر فکّر می‌کند همه گیج‌اند.

● **واته:** هەموو کەس لە چاوی خۆیەوە بۆ دنیا ئەڕوانێ.

۱۰ـ **لای کەسێ کەسە، تیرێ تانە بەسە.**

○ نزد آن کس که کس است، یک تیر طعنه بس است.

● **واته:** مرۆڤی زانا لە تانەوتەشەرێکی بچووك زوو تێ ئە گاو خۆی ئەپارێزێ.

۱۱ـ **لایە لایەیش ئە کات و ئەیش گیرێ!**

○ هم لا یه لا یه می‌کند، هم گریه می‌کند.

● به یە کێك ئەوترێ کە مەزاجێکی دروستی نەبێ و هەر تاوێ لە سەر خۆیە ك بێ. هەم‌پەند بدا و هەم بە پێچەوانەی پەندە کە کار بکا.

۱۲ـ **لنگە کەوشێکی ها لە دیوانا!**

○ یک لنگه کفش در دیوان دارد.

● **واتە:** کەسێکی ها لە خزمەتی پاشا یا حکومەت دا و بەو بۆنەوە دەستی ئەڕوا.

۱۳- **لووت لە بەینا نەبوایە، چاو چاوی ئەخواردا**

○ اگربینی در بین نمی‌بود، چشم، چشم را می‌خورد.

● **واتە:** ئەگەر قانوون لە بەینا نەبێ خەڵکی بێ‌فەرهەنگ یەک ئەخون.

۱۴- **لووتی بگرە، گیانی دەر ئەچێ!**

○ بینی او را بگیر، می‌میرد.

● بە یەکێکی لاواز و بێ هێز ئەوترێ.

۱۵- **لووتی لێ ئەخورێ.**

○ بینیش برای آن کار می‌خارد.

● **واتە:** مەیلی ئەو کارەی هەیە.

۱۶- **لۆیەک لە خوەت دادرە.**

○ یک لایه از لباس خودت را پاره کن.

● **واتە:** لەم کارەدا کە بۆ من پێش هاتووە، خۆت بنەرە جێگەی من.

۱۷- **لە ئاسیاوا ریشم چەرمگ نەکردگە!**

○ در آسیاب ریشم را سفید نکرده‌ام.

● **واتە:** تەجروبەی ژیانم هەیە و عومرم بە فیڕۆ بە سەر نەبردووە.

۱۸- **لە ئاگر، خوەڵە کەوگ، ئەکەفێتەوا!**

○ از آتش، خاکستر تولید می‌شود.

● **واتە:** لە بنەماڵە و رەگەزێکی ماقووڵ و ناودار، مناڵی خراپیش هەڵئەکەوێ.

۱۹- **لە ئاگر نەهاتگ، دووکەڵ ئەکا!**

○ آتش روشن نشده، دود می‌کند.

● **واتە:** هێشتا هیچ نەبووە، جەنجاڵی کردووە.

**٢٠ـ له ئاسیاوا ماتڵ بووگەو له رێگەدا پەله پەلیه!**

○ در آسیاب معطّل مانده و در راه عجله می‌کند.

● **واته:** له‌جێگایه‌ کی‌ترا زه‌ره‌ریان لێ‌داوه و له‌م جێگادا قه‌ره‌بووی ئه‌ کاتۆ.

**٢١ـ له ئاو خور مه‌ترسه، له ئاو مه‌ن بترسه!**

○ از آبی کُه در حرکت است مترس، از آب راکد بترس.

● **واته:** له وه‌ی مه‌ترسه پڕ قیله و قاڵه، له‌وه بترسه وا فه‌قیر حاڵه.

**٢٢ـ له ئاو شه‌و مه‌نه پارێز ئه‌کا.**

○ از آب شب مانده، پرهیز می‌کند.

● به یه‌کێکی به‌ئیمان و ئه‌هلی باوه‌ڕ ئه‌وترێ که له نزیکی کردن به ماڵی حه‌رام خۆ بپارێزێ.

**٢٣ـ له ئاو لێڵ ماسی ئه‌گرێ!**

○ از آب گل آلود ماهی می‌گیرد.

● **واته:** له ده‌رفه‌تێ ئه‌گه‌ڕێ که به سوودی خۆی که‌ڵکی لێ وه‌رگرێ.

**٢٤ـ له ئه‌سپاو پڵاو، نانه‌شان و ئاوا!**

○ از اسباب پلو، صافی و آب.

● **واته:** بۆ ئه‌نجامی ئه‌و کاره هیچ ئامرازێکی بنه‌مایی حازر نی‌یه.

**٢٥ـ له ئه‌سپ داوه‌زێم، سوار که‌ر بووم!**

○ از اسب پیاده شدم، سوار خر شدم.

● به یه‌کێک ئه‌وترێ که مه‌قامێکی به‌رزی بووبێ و له ده‌ستی دابێ. یا پیاوێ که ژنێکی باشی بووبێ و له ده‌ستی دا بێ و ئێستا ژنێکی خراپی هێنابێ.

**٢٦ـ له با بێ یا له بۆران، له عومر زمسان که‌م ئه‌وێتۆ.**

○ باد بوزد یا بوران کند، از عمر زمستان کم می‌شود.

● **واته:** له هه‌ر حاڵدا، خاس یا خراپ، ئه‌م وه‌زعه به سه‌ر ئه‌چێ.

**۲۷ـ له بان بەرزی‌یەکا دانیشه، هەتکوو لا بوینی.**

○ بر فرازی بنشین که دو طرف را ببینی.

● **واته:** کارێ بکه چاوت له بەر و دوای کاره کەتەوه بێ.

**۲۸ـ له بان دایەنیەو، نوێژ بخوێنه!**

○ روی دامنش نماز بخوان.

● به ئافرەتێکی پاک و به ئیمان ئەوترێ.

**۲۹ـ له بان دوو پشکەڵەو باز ئەوا!**

○ از روی دو پشکل می‌پرد.

● به یەکێکی خۆبین و به فیز ئەوترێ.

**۳۰ـ له بان قەورێکەو بگیره، مردگی تیاوێت.**

○ روی قبری گریه کن، مرده در آن باشد.

● **واته:** بۆ چتێ هاوار بکه به عەقڵەوه نزیک بێ.

**۳۱ـ له بان گلێم ئەخەفت، به تورمه قسەی ئەکردا**

○ روی گلیم می‌خوابید، به هوای ترمه حرف می‌زد.

● به کەسێکی نەدار بەڵام فیز قۆز ئەوترێ.

**۳۲ـ له بەر خاتر، خاتران، ئەچمه سەر دین کافران.**

○ به خاطر خوبان، به دین کافران می‌گروم.

● **واته:** ئەگەر ئەم کاره به ئەستۆ ئەگرم، له بەر خاتری ئەو کەسەیه که خۆشم گەره که.

**۳۳ـ له بەر خاتر دڵ، ئاو ئەدات به گوڵ.**

○ به خاطر دل، گل را آبیاری می‌کند.

● **واته:** له بەر خۆشەویستی کەسێکی تر، ئەو کاره ئەکا.

**۳۴ـ له بەرەو باجی، له پشتەو قەیچی!**

○ روبرو باجی، پشت سر قیچی.

● بە یەکێکی دوو ڕوو یا بە ڕواڵەت دۆست و لە پشتە سەر دوژمن ئەوترێ.

**٣٥- لە بەرەو مەیموون، لە دواوە خاتوون!**

○ از روبرو چون میمون و از پشت سر چون خاتون.

● بە یەکێکی بە ڕواڵەت ناشیرین بەڵام لە پشت سەرەوە ڕێک و پێک ئەوترێ.

**٣٦- لە بەهار نەهاتگ، لە کەونەگرتگ!**

○ بهار نیامده و کبک نگرفته.

● بە کەسێک ئەوترێ کە بەڵێنێکی دوور و درێژ بدا.

**٣٧- لە بەین دوو چاوا، لووتی ئەرفان!**

○ در بین دو چشم، بینی را می‌ربود.

● بە یەکێکی زیرەک و لێهاتوو ئەوترێ.

**٣٨- لە بیاوانا کاڵە کۆنە، نعمەت خواس.**

○ در بیابان کفش کهنه نعمت خداست.

◘ **بڕوا بۆ پیتی «ت»:** تا کەوشە کۆنە لە بیاوانا نعمەت خواس.

**٣٩- لە پرێ ناوێتە کورێ!**

○ ناگهان دارای اعتبار نمی‌شود.

● **واتە:** کەس لە پڕ، هەڵ ناکەوێ.

**٤٠- لە پشت حەفت کێف ڕەش بێ.**

○ در پشت هفت کوه سیاه باشد.

● **واتە:** هەر بڕوات و گوم بێ.

**٤١- لە ترس گێرە، بووەسە وشترا!**

○ از ترس خرمن کوبی، شتر شده است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە ترسی ئەرکێکی گران، شۆن گومکێ بکا.

**۴۲- لە ترس مار، پاڵی دا بە ئاگرەوا!**

○ از ترس مار، به آتش پناه برد.

● **واتە:** لەترسی خەتەرێ وا رووی تێ کردووە،خۆی خستە ناو خەتەرێکی ترەوە.

**۴۳- لە ترە نەرێ، چووە تسە نەرێ!**

○ از گوزدان به چش دان رفت.

● **واتە:** لە جێگایەکی خراپەوە چووە بۆ جێگایەکی خراپتر.

**۴۴- لە تفەنگ خاڵی دووکەس ئەترسێ!**

○ از تفنگ خالی دو نفر می‌ترسند.

● **واتە:** ئەوەی وا تفەنگەکە ها بە دەسیۆ و خۆی ئەزانێ کە خاڵی‌یەو ئەوەیش وا لوولەی تفەنگەکەی تێ کراوە.

**۴۵- لە تەر ئەخوات و لە وشک ئەخەفێ!**

○ تر می‌خورد و در جای خشک می‌خوابد.

● بە یەکێکی تەمەڵ و مفت خۆر ئەوترێ.

**۴۶- لە تەک ئاوگەنیگا، هەڵ‌ئەکا!**

○ با آب گندیده می‌سازد.

● بە یەکێکی بەتاقەت و ئەهوەن ئەوترێ کە لەگەڵ هەموو کەسا بسازێ.

**۴۷- لە تەک ئەسڵان، هەر فەسڵان ؛ لە تەک نائەسڵان، هیچ فەسڵان.**

○ با افراد نجیب و اصیل چهار فصل زیستن، با افراد نااصل هیچ فصلی به سر نبردن.

● **واتە:** ئەگەر بۆ هەمیشە لەگەڵ مرۆڤی ئەسڵ و خانەدانا بی، زەرەر ناکەی ؛بەڵام لە گەڵ نائەسڵ و ناوەجاخا،ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بە سەربەری، تووشی زەرەر ئەبی.

**۴۸- لە تەک کوێرا نانت خوارد، خوا لە بەینا بوینە.**

○ اگر با کور غذا خوردی، خدا را در بین ببین.

● **واته:** ئەگەر بووی بە شەریکی کەسێکی هەژار و بێدەم و زوان، جوامێر بەو لە خۆت ببڕە بۆ ئەو.

**٤٩ـ لە تەک گورگا، گۆشت ئەخوا و لە تەک شوانا شمشاڵ ئەژەنێ!**

○ با گرگ گوشت می‌خورد و با چوپان نی می‌زند.

● بە یەکێکی ساختەچی و دوو روو ئەوترێ کە هەم بدا لە ناڵ و هەم بدا لە بزمار.

**٥٠ـ لە تەک گورگا گۆشت ئەخواو لە تەک مەرا شیوەن ئەکا!**

○ با گرگ گوشت می‌خورد و با گوسفند گریە می‌کند.

● بە یەکێکی دوو رو و ساختەچی ئەوترێ.

**٥١ـ لە تەک ماڵ یاقووبەگا، بزن ئەورنەوا!**

○ باخانۀ یعقوب بیگ، موی بزهایشان را می‌چینند.

● بە تەوس ئەوترێ بە یەکێک کە خۆی لێ گۆڕابێ و پێی عار بێ لە گەڵ خوارتر لە خۆیدا هەڵسە و دانیشە بکا.

**٥٢ـ لە تەک مەردان لە بن بەردان، لە تەک نامەردان لە هیچ هەردان.**

○ با مردان در کوه و کمر، با نامردان در هیچ جا.

▣ **بروانە بۆ پەندی ژمارە (٤٧):** لە تەک ئەسڵان ...

**٥٣ـ لە جێگەی ئەوە ساحێو ماڵ دز بگرێ، دز ساحێو ماڵی گرت!**

○ بە جای آن کە صاحب خانە دزد را دستگیر کند، دزد صاحب خانە را دستگیر نمود.

● **واتە:** کاری دنیا پێچەوانەیە ؛ دز، خاوەن ماڵە و خاون ماڵ، دز.

**٥٤ـ لە جێگەی خوەت دانیشە و کۆت و زەنجیر مەکێشە.**

○ در جای خودت بنشین و زیر غل و زنجیر مرو.

● **واتە:** بە کەمی خۆت قانع بەو مەچۆرە ژێر چەپۆکی زاڵم.

**٥٥ـ لە جێگەیەکا دانانیشێ، ئاو بچێتە ژێری!**

○ جایی نمی‌نشیند که آب به زیرش برود.

● به یه کێکی زیره‌ك ئەوترێ که خۆی نەخاته ناو زەرەرەوه.

**یا ئەڵێن:** له جێگەیەکا ناخەفێ، ئاو بچێته ژێری.

**٥٦- له جێگەیەکا دانیشه، هەڵت نەسێنن.**

○ در جایی بنشین، بلندت نکنند.

● **واته:** خۆ کەم بین بە، با قەدرت نەچێ.

**٥٧- له جێی شاوازان، کۆر کۆره وازان!**

○ در جای شهبازها، جوجه ربا پرواز می‌کند.

● **واته:** له جێگەی پیاوه خانەدان وماقوڵەکان، کەسانی ناوەجاخ دانیشتوون.

**٥٨- له چاڵ دەر هاتم، کەفتمه چاوانه!**

○ از چاله درآمدم، در چاه افتادم.

● **واته:** لەو کۆسپه نەجاتم بوو، کەوتمه ناو کۆسپێکی گەورەتر.

**٥٩- له چاو هەتیمەو، مەردم کراسی بۆ ئەبرن!**

○ از نظر یتیم، مردم برایش پیراهن می‌دوزند.

● **واته:** هەرکەس له رووی نیازی خۆیەوه له مەردم چاوەڕوانی ئه کا.

**٦٠- له چێشت مجەور ئەچێ!**

○ شبیه خوراک خادم مسجد است.

● **واته:** له هەموو چتێکی تێدایه.

◘ **بروانه بۆ پیتی «ئه»:** ئێژی چێشت مجەوره.

**٦١- له حەفت ئاسمانا، هەسارەیەکی نی یه.**

○ در هفت آسمان، ستاره‌ای ندارد.

● به یه کێکی هەژار و دەس‌تەنگ ئەوترێ.

**٦٢- له حەفت ئاوی داگه و قولی تەر نەوگه!**

○ به هفت آب زده است و پایش خیس نشده.

● به یه کێکی فێڵباز و ساختەچی ئەوترێ.

**۶۳ـ له حه یوه‌ت ئاو، پاڵم داگەسه ئاگره‌و!**

○ از ترس آب، به آتش تکیه زده‌ام.

● **واته:** له ترسی خه‌ته‌رێکی گه‌وره، به مه‌ترسی‌یه‌کی بچووکتر رازیم.

**یا ئه‌ڵێن:** له حه‌یوه‌ت ئاگرا، خوه‌ی داگەسه ده‌م ئاوه‌و.

**۶۴ـ له خواره‌و دانانیشێ و له ژووریشه‌و جێگه‌ی ناوێته‌و!**

○ پایین مجلس نمی‌نشیند و بالای مجلس نیز جایی برای او نیست.

● به یه کێکی خۆبین و فیزاوی ئه‌وترێ که ده‌ماری نه‌با خوارتر له که‌س دانیشێ.

**۶۵ـ له خوه‌ڵه که‌وان گه‌وره، خوه‌ڵ بکه‌ره سه‌رتا.**

○ از تودهٔ خاکستر بزرگ، خاک روی سرت بریز.

● **واته:** روو، له مرۆڤی گه‌وره بخه.

**یا ئه‌ڵێن:** له کۆ گای گه‌وره، خوه‌ڵ بکه‌ره سه‌رتا.

**۶۶ـ له خه‌یاڵ گه‌دا، ده‌وڵه‌مه‌ن گشت شه‌وێ پڵاو ئه‌خوا!**

○ گدا فکر می‌کند که ثروتمند همه شب پلو می‌خورد.

● به یه کێک ئه‌وترێ که بیرێکی هه‌ڵه‌ی سه‌باره‌ت به مه‌ردم ببێ.

**۶۷ـ له داخ باوه‌ژن چووم بۆ جه‌حانم ؛ وه‌ختێ لام کرده‌و، ها له لای شانم!**

○ به دلیل نفرت از نامادری به جهنم رفتم ؛ وقتی برگشتم، دیدم که در کنارم من ایستاده است.

● بێزاری له باوه‌ژن (زڕ دایک) یا هه‌ر که‌سێکی تر ده‌رئه‌بڕێ که زۆر قینت لێی بێ.

**۶۸ـ له داوێنه که‌ی ئه‌دڕێ و ئه‌یداته ناوشانی!**

○ از دامنش می‌برد و با آن شانه گاهش را وصله می‌کند.

● به ئافره‌تێکی ماڵدار و ده‌س و چاو پاک ئه‌وترێ که ئێبینی دوارۆژ بکا وهه‌ڵه‌خه‌رجی نه کا.

**۶۹ـ لە درگاوە دەری ئەکەن، لە کولاوانجەو ئێتەماڵەو!**

○ از در بیرونش می‌کنند، از روزنهٔ بام وارد خانه می‌شود.

● بە یەکێکی بێ‌حەیاو بێ شەرم ئەوترێ کە عەیبی پێ عەیب نەبێ.

**۷۰ـ لە دوای باران، کەپەنک ؟**

○ پس از باران کپک ؟

● **واتە:** دوای بە سەرچوونی ئەوکۆسپە، یارمەتی جێگە ناگرێ.

**۷۱ـ لە دوای تردان، قنگ قووچاندن!**

○ پس از تیز دادن، خود را کنترل نمودن!

● **واتە:** دوای ئابڕو چوون، بە خۆداهاتن و بیر کردنەوە بێ‌سەمەرە.

**۷۲ـ لە دوای ترێ، خەمشە برێ!**

○ پس از گوزیدن، خود را به نفهمی زدن.

● **واتە:** دوای رووداوێکی ناشیرین پەشیمانی و خۆ گێل کردن.

**۷۳ـ لە دوای کەرۆ بڕویت، ئەشێ بۆی تەرسەقول بچێ بە سەرتا.**

○ به دنبال خر راه بیفتی، باید بوی سرگین به مشامت بخورد.

● **واتە:** شوێن کەسێکی نەفام کەوتن، بۆ گەن هابە دوایۆ.

**۷۴ـ لە دەس گورگ دەرهاتم هەڵنک هەڵنک، کەفتمە دەس پڵنگ!**

○ از دست گرگ رها گشتم و اسیر پلنگ شدم.

● **واتە:** لە دەستی زاڵمێ نەجاتم بوو، بەڵام کەوتمە دەستی زاڵمێکی زۆردارتر.

**۷۵ـ لە دەما هار و لە لەشا بیمار!**

○ در سخن گفتن زیرک و در عمل بیمار.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بە قسە کردن زیرەک بێ و لە کردارا تەمەڵ.

**۷۶ـ لە دێیەکا مەلا نەو، بە کەڵەشێریان ئەوت بلقاسم!**

○ در دهی ملاّ نبود، به خروس می‌گفتند ابوالقاسم.

● **واته:** له جێگەیەکدا کە پیاوی کاراو جوامێر نەبێ، کەساتێکی خوێری وگەن بۆ خۆ نیشان دان مەیدان پەیدا ئەکەن.

**۷۷ـ لەر بێ و ماڵ خوەم بێ.**

○ لاغر باشد و مال خودم باشد.

● **واته:** هەرچی خراپیش بێ ئەگەر ماڵی خۆم بێ پێی رازیم.

**۷۸ـ له رۆن نیسکێ، له موو تیسکێ.**

○ از روغن به اندازهٔ یک عدس، از مو به اندازهٔ چند تار.

● **واته:** له هەرچتێ نەختێ بۆ پاشەکەوت بخەرە دواوە.

**۷۹ـ له روووەو هەی، له ژێرەو، دەی!**

○ در ظاهر منع می‌کند و در باطن تشویق می‌کند.

● به یەکێك ئەوترێ کە بە رواڵەت ناوجێ کەر بێ، بەڵام له ژێرەوە هاندەری شەڕە کە بێ.

**۸۰ـ له رووی خوەم، کورێکم نەو له شووی خوەم!**

○ به دلیل شرم و حیایی که دارم، پسری از شوهر خود ندارم.

● **واته:** زۆر کەس،بەهۆی شەرم‌وحەیای زۆرەوە تووشی کۆسپ وبەڵای ناڕەوا ئەبن.

**۸۱ـ له رەشی ئەکوژێ!**

○ هر خال سیاهی را مورد هدف قرار می‌دهد.

● به یەکێك ئەوترێ کە له ناحەق و بێ تێبینی به سەر خەڵکا بچێ و بکوژێ.

**۸۲ـ له ریشم ئەخەمە سەر سمێڵم!**

○ از ریشم بر می‌دارم و روی سبیلم می‌گذارم.

● **واته:** دەس به چێو ئەگرم و لەم لا ئەخەمە سەر ئەولا.

**۸۳ـ له زمسانا یەخی لێ ناسەنگێت!**

○ در زمستان یخ از او نمی‌شود خرید.

● بە یە کێکی زۆر گران فرۆش ئەوترێ.

**٨۴ـ لە زمسان شەوێ، لە پیران تەوێ!**

○ زمستان را شبی بس است و پیران‌راتبی.

● **واتە:** زمسان، لە شەوێکیش دا بێ هەر خۆی نیشان ئەدا و پیریش بە یاوێکی بچووك مەترسی مەرگی لێ ئە کرێ.

**یا ئەڵێن:** لە زمسان شەوێ، لە پیران تەوێ، لە بۆرە سوار هەوێ.

بۆرە سواری قنج و قیتیش بە هەو کردنێ دائە کەوێ.

**٨۵ـ لە زۆر ژیاوان مەپرسە، لە زۆر کراوان بپرسە.**

○ از آنهایی که زیاد زیسته‌اند مپرس، از آنهایی که مورد ظلم قرار گـرفته‌انـد بپرس.

● **واتە:** ئەوەی وازۆر ژیاوە لە گەڵ ڕۆژگاردا ڕێ کەوتووە و جێگەی پرس و جـۆ نی یە؛ بەڵام ئەوەی وا زۆری لێ کراوە سکاڵای ڕۆژگاری وابە لاوە و لێی بپرسە وقسەی بژنەوە.

**٨۶ـ لە ژێر ئەو کاسا، نیم کاسەیەک هەس!**

○ زیر آن کاسه، نیم کاسه‌ای هست.

● **واتە:** لە ژێر ئەو قسە یائەو مەوزووعەدا، فێڵ و فەرەزێک هەست ئە کرێ.

**٨٧ـ لە سایەی گوڵە گەنمێکۆ، سەد گوڵ مرۆر ئاو ئەخواتۆ.**

○ در سایه یک گل گندم، صد گل تلخک آب می‌خورد.

● **واتە:** لە سێبەری سەری کەسێکا سەد کەسی تر بە بەهرە ئە گەن.

**٨٨ـ لە سوار خاسی خوەی نی یە، ئەسپ هەڵی گرتگە!**

○ از سوار کاری خودش نیست، اسب او را با خود برده است.

● بە یە کێک ئەوترێ کە بێ ئەوەی خۆی ئیختیارێکی ببێ کەوتبێتە ناو کارێکەوە و خەڵکی وا بزانن خۆی کردوویەتی.

**٨٩ـ لە سەر ڕێگا مەخەفە، با خەو خراو نەوینی.**

○ در مسیر عمومی مخواب، تا خوابهای بد نبینی.

● **واته:** خۆت ئاوێتەی دەنگ و باسی خەڵك مەكە با تووشی كۆسپ نەبی.

**۹۰- لە سەر زک تێر هەڵئەخاتەو!**

○ با شکم سیر، جست و خیز می‌کند.

● **واته:** لە چاوی بێ نیازی خۆیەوە بۆ مەسەلە كە ئەڕوانێ.

**۹۱- لە سەر ماڵم، بەلە باڵم!**

○ به دلیل دفاع از مالم، مرا بزن.

● **واته:** من لە سەر مافی خۆم ئەڕۆم، تۆ بۆچی ئەبێ داخت بێ ؟

**۹۲- لە سێ چت خوەت لابە؛ سەگ هار، ژن سەڵیتە، دیوار شكسە!**

○ از سه چیز كناره بگیر: سگ هار، زن سلیطه، دیوار شکسته.

● **واته:** ئەو سێ چتە جێگەی مەترسین و خۆتیان لێ لادە.

**۹۳- لە سێوەر خوەی ئەترسێ!**

○ از سایۀ خودش می‌ترسد.

● بە یەكێك ئەوترێ كە لە چتێ زۆر بترسێ‌وهەرلە بیری ئەوەدا بێ خۆی بشارێتۆ.

**۹۴- لە شاخ مار و شیر مەلیچک هاله ماڵیا!**

○ از شاخ مار تا شیر گنجشک در خانه‌اش وجود دارد.

● بە ماڵێ ئەوترێ كە پڕ بێ لە خرت و پرت و چتی كۆنە و نوێ و بە دەردبخۆر و بە دەردنەخۆر.

**۹۵- لە شارێكا پیاگ نەو، بە كەڵەشێریان ئەوت بلْقاسم!**

○ در شهری مرد نبود، به خروس می‌گفتند ابوالقاسم.

◘ **وەكوو مەسیلەی ژمارە (۷۶)**

**۹۶- لە شەرا بەش ئاشتی و لە ئاشتیا بەش شەر بێڵانەو.**

○ در جنگ فكر آشتی و در آشتی فكر جنگ را داشته باش.

● **واتە:** ئەگەر لەگەڵ کەسێکدا شەڕت کرد، بیری دوا ڕۆژی ئاشتیت بەلاوە بێ با لەو ڕۆژەدا شەرمەزار نەبی. وە ئەگەر لەگەڵ کەسێکیشدا ئاشت بووی، هەرچی رازتـە بەلایەوە مەیەژە نەوەک ڕۆژێبەیتان بشێوێ و رازەکانت ئاشکرا بکا.

**٩٧- لە عەرشەو تا قورش، هیچ کەس بە دوێ خوەی نایەژێ تورش.**

○ از عرش تا قرش (کرسی) هیچ کس به دوغ خود نمی‌گوید ترش است.

● **واتە:** هیچ کەس ماڵی خۆی خراپ نادا لە قەڵەم.

**٩٨- لە عیسایان ئەدا و مووسا بە تاسەو ئەچووا!**

○ عیسی را می‌زدند و موسی داشت دق می‌کرد.

● **واتە:** زەرەر لە کەسێکی تر کەوتووە و یەکێکی تر هاوار ئەکا.

**٩٩- لە قنگڵاشکیان پرسی مەوتەنت کوێنەس؟ وتی با ئەزانێ!**

○ از خار بن پرسیدند وطنت کجاست؟ گفت باد می‌داند.

● بە یەکێکی عەبداڵ و ئاوارە ئەوترێ کە جێگە و ڕێگەیەکی نەبێ، تێیدا سەقام بگرێ.

**١٠٠- لە قنگەو لەغاوی ئەکا!**

○ از عقب دهنه بر سرش می‌گذارد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە قسەیەکی پێچەوانە حاڵی بووبێ یا کارێ بە پێچەوانە بکا.

**١٠١- لەقەی مانگا ئێشی نی‌یە.**

○ لگدزدن مادّه گاو درد ندارد.

● **واتە:** چونکە شیر ئەدا.

**١٠٢- لە قین هاوسا، قنگ مناڵ خوەی ئەدرێ!**

○ از خشم همسایه، کون بچّهٔ خود را پاره می‌کند.

● بە یەکێک ئەوترێ دەستی بە سەر غەریبەدا نەڕوا و بدا لە مناڵەکەی خۆی.

**١٠٣- لە کانی‌یەک ئاوت خواردەو کوچکی تێ‌مەخە.**

○ در چشمه‌ای که از آن آب نوشیدی سنگ مینداز.

● **واته:** جوابی پیاوەتی بەناپیاوی مەدەرەوە.

**١٠٤ـ لە گایەک، کێفێ دروس ئەکا.**

○ از کاهی، کوهی می‌سازد.

● **واتە:** لە قسەیەکی بچووک، مەسەلەیەکی گەورە دروس ئەکا.

**١٠٥ـ لە کەر شەیتان بێرە خوارۆ.**

○ از خر شیطان پیاده شو.

● **واتە:** ئەوەندە سەخت مەگرە.

**١٠٦ـ لە کەریان پرسی بۆکوێ ئەچی؟ وتی کوتەک ئەزانێ!**

○ از خر پرسیدند کجا می‌روی؟ گفت کتک می‌داند.

● بە یەکێکی ناحاڵی ئەوترێ کە مەگەر زۆر، حاڵی بکا.

**١٠٧ـ لە کیسەی خەلیفە ئەوەخشێت.**

○ از کیسۀ خلیفه می‌بخشد.

● **واتە:** پیاوەتی بە سەر ماڵی مەردمۆ ئەکا.

**١٠٨ـ لە گشت کاسەیەکا، کەوچکە!**

○ در هر کاسه‌ای، قاشق است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە هەموو قسە وکارێکی مەردما بێ‌جێگە دەخاڵەت بکاو خۆی تێ بکوتێ.

**١٠٩ـ لە گشت هەورێ باران ناوارێ.**

○ از هر ابری باران نمی‌بارد.

● **واتە:** لە هەر توورە بوونێک، شەڕ و شۆڕ هەڵ ناگرسێ.

**١١٠ـ لە گورێسی رەش و چەرمگ ئەسڵەمێتۆ!**

○ از طناب سیاه و سفید رم می‌کند.

● **واتە:** لە چتی نەناسراو پارێز ئەکا چونکە پێشتر چزراوە.

**١١١ـ لە گۆشت مەلێ، هەر یەکێ پەلێ.**

○ از گوشت پرنده‌ای، هر کدام یک تکّه.

● **واتە:** هەموو بە نیسبەتێکی بەرابەر لەو چتە هەڵگرن.

**١١٢ـ لە گون بەران، پەنێر دروس ئەکا!**

○ از بیضهٔ قوچ، پنیر درست می‌کند.

● بە یەکێکی زۆر تەڕدەست وزیرەك ئەوترێ کە بتوانێ کارێکی ناممکین بکا.

**١١٣ـ لە گوێچکەی گادا خەفتگە!**

○ در گوش گاو خوابیده است.

● **واتە:** بێ خەبەرە.

**١١۴ـ لە ماسی نێر شەرم ئەکا!**

○ از ماهی نر شرم می‌کند.

● بە تەوس ئەوترێ بە ئافرەتێ کە دەعیەی پاکی بکا.

**١١۵ـ لە ماڵا شێر و لە دەرۆ ڕێوی!**

○ در خانه شیر و در بیرون روباه.

● بە کەسێك ئەوترێ کە بە سەر ماڵ و منالی خۆیا زاڵ بێ، بەڵام بە غەریبە نەوێرێ.

**١١۶ـ لە ماڵ خوەیا نەیەتوانی پرپۆڵە دروس بکا، ئەچووە ماڵ مەردم ڕشتەی ئەوریەوا!**

○ در خانهٔ خودش نمی‌توانست اوماج بپزد، می‌رفت خانهٔ مردم رشته می‌برید.

● بە یەکێکی نەتوانکار ئەوترێ کە لە ماڵی خۆیا دەس بۆ ڕەش و سپی نەوا، بەڵام لە جێگای ترا قۆڵی لێ هەڵماڵێ و کار بۆ مەردم بکا.

**١١٧ـ لە ماڵ خوەی ناموراد، لە ماڵ مەردم شاموراد!**

○ در خانهٔ خودش ناکام، در خانهٔ مردم شادکام.

● بە یەکێك ئەوترێ کە لە ماڵی خۆیا بێ‌وەری بێ بەڵام لە ماڵی مەردما هەموو چتێ بە مورادی بێ.

**١١٨ـ له ماڵ زاوا دەنگ پەپوو، له ماڵ وەوی قاو و قوو!**

○ در خانهٔ داماد آوای جغد، در خانهٔ عروس قال و قیل.

● **واته:** بەرهەمی ئەم کاره به پێچەوانەی ئەوەیه که چاوەڕێ ئەکرێ.

**١١٩ـ له ماڵیاکوچکێ پەیا ناوێ سەر خوەتی پێ بشکنی!**

○ در خانه‌اش سنگی پیدا نمی‌شود، تا با آن سر خودت را بشکنی.

● به ماڵی کەسێکی هەژار و دەست تەنگ ئەوترێ.

**١٢٠ـ له ماین نەبووگه، ئاخور ئەوەسێ!**

○ مادیان ندارد، آخور می‌بندد.

● به کەسێک ئەوترێ که ئەسڵی نەبێ و بۆ فەرع هەوڵ بدا.

**١٢١ـ لەم عەرزه چونەرێ هەڵکەنه!**

○ از این زمین جغندری بکن.

● **واته:** له هیچ نەبوو داوای چی ئەکەی؟ یا: تا عەزیەت نه کێشی هیچ چتێ بەرهەم نایه.

**١٢٢ـ له من کرده و له شەماڵ برده!**

○ از من کار کردن و از باد شمال بردن.

● **واته:** من هەوڵ ئەدەم و جەمی ئەکەم، لەو لای لاوه لاوه بەڵایەکی بۆ ئەگەیەو له بەینی ئەبا. وەکوو کابرایەکی رژد که خۆی نایخوا و مناڵەکانی دەستی تێ ئەنێن و خەرجی ئەکەن.

**١٢٣ـ له مەر دۆشین هاتینه کەر دۆشین!**

○ از دوشیدن گوسفند به دوشیدن خر رسیدیم.

● **واته:** هەر چیمان بوو له دەستمان دا.

**١٢٤ـ لەمەوبەر کاور بازی بوو، ئیسه بەران بازی‌یه.**

○ پیش از این برّه بازی بود، حالا قوچ بازی است.

● **واته:** لەمەوبەر ئەزموونی ژیانمان کەم بوو نەمان ئەزانی لەگەڵ خەڵکدا چۆن موعامەله بکەین، ئێستا تەجروبەمان هەیه و ئەزانین چی بکەین.

**١٢٥ـ لە ناو ئەم مشتە موویەک هەڵکەنە!**

○ از کف این دست مویی بکن.

● **واتە:** هیچێکم لێ مومکین نابێ.

**١٢٦ـ لە ناوکوێرگەلا، مژومۆڵ چاو ساقە!**

○ در میان کورها، نیم کور، راهنما است.

● **واتە:** لە ناو جەماعەتێکی بەسیت دا، کەم زان، زۆر زان ئەدا لە قەڵەم.

**١٢٧ـ لە ناوگیرفانیەو پووک ئەنێ!**

○ از داخل جیبش پنجۀ نفرت به سوی او می‌گشاید.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە بەر خۆیەوە توورەیی خۆی سەبارەت بە کەسێ دەربڕێ.

**یا ئەڵێن:** لە گیرفانیەو پووکاوڵ ئەنێ.

**١٢٨ـ لە نۆکیسە قەرز مەکە، ئەگەر ئەیکەی خەرجی مەکە!**

○ از آدم نو کیسه قرض مکن، اگرقرض کردی خرجش مکن.

● **واتە:** مرۆڤی نۆکیسە و تازە پێداکەوتوو، هێشتا دەست و دڵی پیاوەتی نی‌یە و لە کاری پیاوانە و جوامێرانە کە خەرجی هەیە، زوو پەشمیان ئەبێتۆ، کەوا بوو دڵی پێ خۆش مەکە.

**١٢٩ـ لە نەتاشیاگ، ئەتاشێ!**

○ از نتراشیده، می تراشد.

● **واتە:** لە هیچ نەبوو، قسە دروس ئەکا.

**١٣٠ـ لەو جێگا ئاو هەس، خاک نی‌یە ؛ لەو جێگا خاک هەس، ئاو نی‌یە.**

○ آنجا که آب هست، خاک نیست ؛ آنجا که خاک هست، آب نیست.

● **واتە:** بۆ ئینسان هەموو نیعمەتەکان پێکەوە جۆر نابێ.

**١٣١ـ لەو جێگا وا ئاو هەس، تەیەموم باتڵە.**

○ آنجا که آب هست، تیمّم باطل است.

● **واتە:** ئەسڵ ببێ، فەرع جێگای نی‌یە.

**١٣٢ـ لە وڵاخ نەبووگ، ئاخوری هەڵئەبەست!**

○ الاغ نداشت و آخر می‌بست.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بە خەیاڵ بژی.

**١٣٣ـ لەو وەختەوە تۆ قسە ئەکەی،سی‌ودوو مێشم بەگون کەرەرەشەو ژماردگە!**

○ از وقتی که تو داری حرف می‌زنی، سی و دو مگس بر روی بیضهٔ خر سیاه شمردەام!

● **واتە:** گوێم‌بە لای قسە بێ‌نرخە کانی تۆوە نەبووە.

**١٣٤ـ لەوە بترسە وا ئێژێ ناخوەم!**

○ از آن کسی بترس که می‌گوید نمی خورم.

● **واتە:** ئەوەی وا خوڵکی ئەکەی بۆ نان خواردن و ئێژێ نان ناخۆم، جێگەی مەترسییە، چونکە هەر ئەونە پڕی دایە سەر سفرەکە، ئیتر تا ئاخر دەس هەڵناگرێ.

**١٣٥ـ لە وەخت راوا گووی تێ!**

○ در وقت شکار عنش می‌گیرد.

● بە یەکێکی وەخت نەناس ئەوترێ.

**١٣٦ـ لە وەخت کل و کار، عەمە بار ؛ لە وەخت چز و بز، عەمە دزا!**

○ در وقت کار، عمّه بیار ؛ در وقت پخت و پز، عمّه دزد.

● **واتـە:** وەختێ کارت پێم بێ، رێزم لێ ئەنێی ؛ وەختێ کە پێویست بکا خزمەتێکم بکەی، بە قسەی خراپ لە خۆت دوورم ئەخەیتۆ.

**١٣٧ـ لەو هەرگە هەر ئەم تۆزە هەڵئەسێ!**

○ از آن گِل همین گرد و خاک بلند می‌شود.

● **واتە:** لەو کەسە خراپە هەر مناڵی وا ئەکەوێتۆ.

**یا:** لەو کارە خراپە هەر بەرهەمی وا بە بار دێ.

**١٣٨ـ لە هۆجەنەی خوەی ئەتۆرێ!**

○ از بند تنبان خودش قهر می‌کند.

● **واته:** لە خۆی یا لە ماڵ و منالّی خۆی ئەتۆرێ.وەکوو تۆران لە بەنەخوێن کە ئەبێ بەهۆی ئەوەی کە کابرا گمیز بکابە خۆیا.

**۱۳۹ـ لە هەرچی کاسا، کەوچکە!**

○ در هر کاسه‌ای، قاشق است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە هەموو کارێکدا بێ‌جێگە دەخاڵەت بکا.

**۱۴۰ـ لە هەرکوێ ئاشە، کتک فەراشە!**

○ در هر جا آش وجود دارد، گربه فرّاش است.

● بە یەکێکی خوێڕی و زکەڕۆ ئەوترێ کە بۆ مڵ و مۆ سەر بکا بە ماڵانا.

**۱۴۱ـ لە هەرکوێ ئاشە، کەچەڵ فەراشە!**

○ در هر کجا آش است، کچل فرّاش است.

▣ **وەکوو مەسیلەی پێشوو.**

**۱۴۲ـ لە هەرگ ئەونە تۆز هەڵسێ، هەر خاسە.**

○ اگر از گِل آن اندازه گرد و خاک ایجاد شود، باز هم خوب است.

● **واته:** بەوەی کە لەو کەسە یا لەو جێگە دەستت کەوتووە، رازی بە ؛ چونکە ئەوەیش هەر زۆرە.

**۱۴۳ـ لە هەر لایەکەو بای بێت، بەو بارا شەن ئەکا!**

○ از هر طرف باد بیاید، از همان طرف شانه می‌کند.

● بە یەکێک ئەوترێ کە نان بە نرخی رۆژ بخوا.

**۱۴۴ـ لە هەر هەورێ باران ناوارێ.**

○ از هر ابری باران نمی‌بارد.

● **واتـه:** هەموو قیڕە و جەنجاڵێ جێگەی مەترسی نی‌یە. یا: لە هەر کەس چـاوەڕێی پیاوەتی ناکرێ.

**١٤٥ـ له هه‌وانه‌ی خاڵی،کووره ئه‌ده‌منێت!**

○ با انبان خالی کوره را می‌دمد.

● **واته:** به ده‌ستی خاڵی، ده‌عیه‌ی به‌خشین ئه کا.

**١٤٦ـ له هێسریان پرسی باوکت کی‌یه؟ وتی دایکم ماینه!**

○ از استر پرسیدند پدرت کیست؟ گفت مادرم مادیان است.

● به یه کێک ئه‌وترێ که له رووی هه‌ڵ نه‌یه‌ت ناوی باوکی خۆی بوا، به‌ڵام شانازی به دایکیه‌وه بکا.

**١٤٧ـ له هێلکه‌ی چه‌رمگ مامر ره‌ش و له مامر ره‌ش هێلکه‌ی چه‌رمگ په‌یا ئه‌وێ.**

○ از تخم مرغ سفید مرغ سیاه و از مرغ سیاه تخم مرغ سفید به وجود می‌آید.

● **واته:** دوور نی‌یه که له نیژادی پاک، نه‌ته‌وه‌ی خراپ و له مرۆڤی خراپ، مناڵی پاک بکه‌وێته‌وه.

**١٤٨ـ لیان پرسی خه‌ڵک کوێیت ؟ وتی هێشتا ژنم نه‌هاوردگه!**

○ از او پرسیدند اهل کجائی؟ گفت هنوز زن نگرفته‌ام.

● **واته:** پیاو خه‌ڵکی ئه‌و جێگه‌یه وا ژنی لێ ئه‌خوازێ.

**١٤٩ـ لێفه‌ی سواڵ به‌ر سه‌رما ناگرێ!**

○ لحاف گدائی جلو سرما را نمی‌گیرد.

● **واته:** چتی خه‌ڵک که به خێرات دابێتیان، خێری لێ نابێتۆ.

**١٥٠ـ لێنا ئاو هه‌س، مه‌له‌وان نی‌یه ؛ لێنه‌یشا مه‌له‌وان هه‌س، ئاو نی‌یه.**

○ آنجا که آب هست، ملوان نیست ؛ آنجا هم که ملوان هست، آب نیست.

● **واته:** هه‌موو نیعمه‌تێ پێکه‌وه بۆ مرۆڤ جۆر نابێ.

**۱ـ ماچێ بۆ گەورە کچ چەس ؟**

○ یک بوس برای دختر بالغ چیست ؟

● بە تەوس ئەوترێ، واتە: ئەو کارە خراپە یا ئەو هەڵەیە کە تۆ بە بچووکی ئەزانی، زۆریش بچووك نییە.

**۲ـ مار بە دەس مەردم بگرە!**

○ مار را با دست مردم بگیر.

سرِ مار را به دست دشمن بکوب که از إِحْدَی الْحُسْنَیینْ خالی نباشد.

(گلستان سعدی)

● **واتە:** ئەگەر ئەوکەسە دوژمن بێ، کە بە دەستی ئەو مار ئەگری، یەکێ لەم دوو ئاکامی خێرە دەسگیرت ئەبێ: یا مارە کە ئەکوژرێ یا ئەداتە دەستی دوژمنە کەتەوە، کە لە هەر حاڵدا بە سوودی تۆ تەواو ئەبێ.

**۳ـ مار بە زوان خوەش لەکون تێتە دەرۆ ( یا، دەرتێ)!**

○ مار با زبان خوش از سوراخ بیرون میآید.

● **واتە:** زمانی خۆش دوژمنیش نەرم ئەکا.

**۴ـ مار بیت و مرۆچە بتخوا!**

○ مار باشی و مورچه تو را بخورد.

● بە کەسێکی توانا و ئازا ئەوترێ کە بەختی لێ هەڵگەڕابێتۆ و یە کێکی بێ نرخ و هیچ و پورچ دەسی بە سەرا کێشا بێ.

۵ـ **مار تا دەسی لێنەوەشنی، وەزە ناکا.**

○ مار را تا اذیّت نکنی، نمی‌گزد.

● **واتە:** نزیکی زاڵم مەکەوە و سەر مەنێرە سەری با تووشی عەزیەتت نە کا.

۶ـ **مار تا مار نەخوا، ناوێ بە ئەژدیها.**

○ مار تا مار نخورد، اژدها نمی‌شود.

● **واتە:** زاڵمی خوێنمژ،دوای زوڵمێکی زۆر وە کوو ئەژدیهای لێ دێ و هارئەبێ.

۷ـ **مار خوەشی لە سیر نەئەهات، سیر لە بەر کوناکەیا سەوز ئەووا!**

○ مار از سیر خوشش نمی‌آمد، سیر جلو سوراخش سبز می‌شد.

● **واتە:** کەسێ لە کەسێ خۆشی نەیەت و ئەو کەسە ببێ بە مووی دەماخی و لە بەر چاوی دوور نە کەوێتۆ.

**یا ئەڵێن:** مار خوەشی لە پوونگە نەئەهات، ...

۸ـ **مار خوەی خاسە، توولە کەی خراوە!**

○ مار خودش خوب است، توله‌اش بد است.

● **واتە:** ئەو زاڵمە خۆی بە هەر حاڵ، نۆچە کانی وەزەیان زۆرترە.

۹ـ **مار سەری بێشێت، لە سەر ڕێگا ئەخەوێ.**

○ مار سرش درد بکند، بر سر راه می‌خوابد.

● **واتە:** زاڵم کە بەختی لێ هەڵگەڕێتۆ، بە دەستی خۆی قەبری خۆی ئە کەنێ.

۱۰ـ **مار کلک بریاگ، تۆڵە ئەسێنێ.**

○ مار دم بریده، انتقام می‌گیرد.

● **واتە:** لەدوژمنی زامدار مەترسی بکە.

۱۱ـ **مارە کەی شێخ ئۆمەرە!**

○ مار شیخ عمر است.

● بە یە کێک ئەوترێ کە چاکەت لەگەڵ کردبێ و ئەو بە خراپە جوابت بداتەوە. وەکوو مارەکەی شێخ ئۆمەر کە دوای خزمەتێکی زۆر هەڵ چوو بە گەردەنی شێخدا و پێوەی دا و کوشتی.

**۱۲ـ مارگەستە لەگوریس رەش و چەرمگ سڵ ئەکا!**

○ مار گزیده از طناب سیاه و سفید می ترسد.

● **واتە:** کەسێ کە جارێ لە شوێنێکەوە خەڵەتابێ، بۆ دوایی لەو جۆرە جێگانە ئەترسێ و دووربینی ئە کا.

**یا ئەڵێن:** مارانگاز لەگوریس رەش و چەرمگ ئەترسێ.

**۱۳ـ مار مار خوەریش هەس.**

○ مار مار خور نیز وجود دارد.

● **واتە:** دەس لە بان دسی زاڵمیشەوە هەیە.

**۱۴ـ مار هەرچی پێچ ئەخوات، ئاخری راس بەکونا ئەچێت.**

○ مار هر چه پیچ بخورد، در آخر راست در سوراخ فرومی‌رود.

● **واتە:** ناڕاست ئەبێ هەر راستەوەبێ.

**۱۵ـ ماری تێ زایگە.**

○ مار در آن کار زائیده.

● **واتە:** ئەو کارە تووشی گیر و کۆسپ بووە.

**۱۶ـ ماس نی‌یە بە لای دەمتا دیار بێ!**

○ ماست نیست که دور دهانت دیده شود.

● بە یە کێک ئەوترێ کە قسەیە کی کردبێ و ئێستا حاشای لێ بکا.

**۱۷ـ ماسی گەورە لە تافگەدا ئەگیرگێ.**

○ ماهی بزرگ در آبشار صید می‌شود.

● **واتە:** پلەو مەقامی بەرز بە زەحمەت بە دەس دێ.

**١٨ـ ماسی لە دەریا ئەوەخشێ!**

○ ماهی از دریا می‌بخشد.

● **واتە:** لە چتێ ئەبەخشێ کە نی‌یەتی.

**١٩ـ ماسی لە سەریەو بۆ ئەکا.**

○ ماهی از سر می‌گندد.

● **واتە:** کەسانی ناودار و بەرپرس، کۆمەڵی خۆیان لە بەین ئەبەن و ئەیدەن بە دەستی بێگانەوە.

**٢٠ـ ماسی هەر وەخت لە ئاو بیگری، تازەس.**

○ ماهی را هر وقت از آب بگیری، تازه است.

● **واتە:** بۆ ئەنجامی ئەو کارە، هەر وەختێ بێ، دێر نی‌یە.

**٢١ـ ماڵ بە ساحێو ماڵ حەرامە!**

○ مال برای صاحب مال حرام است.

● **واتە:** بۆ ئەبێ خاوەن ماڵ لە ماڵی خۆی بێوەری بێ ؟

**٢٢ـ ماڵ بە لایەکا ئەروێت و ئیمان بە هەزار لا.**

○ مال به یک طرف می‌رود و ایمان به هزار طرف.

● **واتە:** ماڵی دزراو، یەکێ بردوویەتی و شك بۆ هەزار کەس ئەچێ و لە ئاکامدا ئیمانی ماڵ دزراو بۆ ئەو شکانە کە بە هەڵەدا چووە ئەکەوێتە خەتەرەوە.

**٢٣ـ ماڵ بێ کەسی برمێ، بۆ برازاوای!**

○ خانه بی کسی خراب، برای ساق دوشش.

● **واتە:** ئەوەندە بێ کەسە، کەسێکی وا هیچ و پووچ یارمەتی ئەدا.

**٢٤ـ ماڵت ماڵ نەوێ و بازارت بازار بێ.**

○ مالت مال نباشد، اما بازارت بازار باشد.

● **واتە:** ئەگەر ماڵەکەت لە ماڵ نەچێ قەیدی نی‌یە، بەڵام بازاڕەکەت با لە بازاڕ بچێ.

**یا ئەڵێن:** ماڵم ماڵ نەوێ و بازاڕم بازاڕ وێ.

**٢٥- ماڵت نەرمێ شێڵانە کوت، بۆ بات!**

○ خانەات ویران شود زردآلو، برای بادت.

● بە یەکێکی بێ نرخ ئەوترێ کە بێ‌ئەوەی شیاوی ئەوەی بێ ژانەسەری بۆ خەڵکی درووس کردبێ.

**٢٦- ماڵ تەنیا، پاوشایی‌یە.**

○ ملک شخصی، پادشاهی است.

● **واتە:** کەسێ کە بێ شەریک خاوەنی چتێ بێ وەکور ئەوەیە بە تەنیا پاوشای وڵاتێ بێ.

**٢٧- ماڵ چەرمگ بۆ رۆژ رەش.**

○ثروت سفید برای روز سیاه.

● **واتە:** ئەمرۆ کە ئەتوانی پاشەکەوت بخە بۆ رۆژی تەنگانە.

**یا ئەڵێن:** ماڵ گەش بۆ رۆژ رەش.

**٢٨- ماڵ خۆ نەخۆر، بۆ چەکمە بۆر!**

○ مال خسیس، برای وارث قلدر.

● **واتە:** ماڵی مرۆڤی رژد ئەبێ میرات بەری مل قەوی بیخوا.

**یا ئەڵێن:** ماڵ نەخوەر، هین بخوەرە.

**٢٩- ماڵ خوەت قایم کە و سەگ هاوسا بە دز مەکە.**

○ مال خودت را پنهان کن و سگ همسایه رابه دزدی متّهم مکن.

● **واتە:** هۆشت بە ماڵی خۆتەوە بێ و لە کەس بەدگومان مەبە.

**٣٠- ماڵ خوەم بۆ خوەم، ماڵ خەڵکیش وەک هەڵوا ئەخوەم!**

○ مال خودم برای خودم، مال مردم را نیز چون حلوا می‌خورم.

● بە یەکێکی تەماعکار ئەوترێ کە چاوی بڕیبێتە ماڵی مەردم.

**٣١- ماڵ خەڵکان، تا لچ کەڵکان!**

○ مال مردم، تالب بام.

● **واته:** به ماڵی مەردم دڵ خۆش ناکرێ.

۳۲ـ **ماڵ سووتیاگ به ماڵ ئەوێ، زکەرۆ به ماڵ ناوێ.**

○ خانه خراب مجدداً صاحب خانه می‌شود، شکمو صاحب خانه نمی‌شود.

● **واته:** زکەڕۆ ئەسیری زکیەتی و هەرچی به دەس بێرێ خەرجی زکی ئەکا.

۳۳ـ **ماڵ شەوە کاول بێت وا نەتی بردەو.**

○ خانهٔ جن نوزادکش خراب باد که تو را نکشت.

● گاڵته یەلەبەینی دووکەسا، واته : خوا بت کوژێ.

۳۴ـ **ماڵ فرۆش شەوێ تێره و ماڵ سێن شەوێ برسی.**

○ آن که خانه می‌فروشد یک شب سیر است و آن که خانه مـی‌خرد یک شب گرسنه.

● **واته:** ماڵ فرۆش پاره کەی زوو له بەین ئەچێ، بەڵام ماڵ سێن پاره کەی پاشه کەوت خستووه.

۳۵ـ **ماڵ فره‌کوزان، ئاوی نی‌یه له‌گۆزان!**

○ در خانه‌ای که زن زیاد وجود دارد، آن خانه آب در کوزه ندارد.

● **واته:** ماڵێ که ژنی زۆری تێدابێ، سامانی نی‌یه و هەرکەس بۆ خۆیەتی.

۳۶ـ **ماڵ قەڵب سەر به ساحێوە.**

○ مال بد بیخ ریش صاحبش.

● **واته:** چتی خراپ ئەمێنێتۆ بۆ خاوەنه کەی.

۳۷ـ **ماڵ کەسێ بخۆ، یا زۆر قینی لێ بێت، یا زۆر خوەش!**

○ مال کسی را بخور یا بسیار بدش بیاید، یا بسیار خوشنود شود.

● **واته:** ئەوەی وا قینی دێ ماڵی بخۆی، بیخۆ با هەر قینی بێ. ئەوەیش وا خۆشی دێ، بێ دڵی مه که.

۳۸ـ **ماڵ له چاڵا بێت و ساحێوماڵ به دیاریەو بێت.**

○ مال در چاه باشد و صاحب مال در کنار آن.

● **واته:** ماڵ لە هەر حاڵدا ئەگەر خاوەنی بە دیاریۆ بێت، بۆ خاوەنەکەی جێگەی دڵ خۆشییە.

۳۹ـ **ماڵ، ماڵ منە و ماڵاوایی جەلیل!**

○ مال، مال من است و از جلیل تشکّر می‌کنند.

● **واتـە:** من عـەزیەتم کێشاوە و لەو رێگـەدا پـارەم خـەرج کـردووە کـە چـی لە کەسێکی ترماڵاوایی ئەکرێ.

۴۰ـ **ماڵ، ماڵ نەو، مێوانیشی لێ کەفت!**

○ خانه، خانه نبود مهمان نیز به آنجا آمد.

● به ماڵێکی رەش و رووت ئەوترێ کە میوانداری هەڵ نەگرێ.

**یا ئەڵێن:** ماڵ لە خوەیا نەو مێوانیشی لێ کەفت.

۴۱ـ **ماڵ مفتە، قازی مەراغەیش ئەیخوا!**

○ مال مفت را قاضی مراغه نیز می‌خورد.

● **واتە:** لە چتی موفت کەس خۆی لانادا.

۴۲ـ **ماڵ مەردان، لە بنە بەردان.**

○ مال مردان، در زیر سنگها.

● **واتە:** ئەوکەسە وا غیرەتی کار کردنی هەیە، لە بن بەردیش بێ نانی خۆی دەردێنێ.

۴۳ـ **ماڵ مەردم کیسە ئەدرێت!**

○ مال مردم، کیسه پاره‌می‌کند.

● **واتە:** کەس نابێ بە ماڵی مەردم دڵ خۆش بکا.

۴۴ـ **ماڵ مەزەنەی چاوە!**

○ موجودی مال می‌تواند میزان حدس و تعیین نرخ کالا از راه چشم باشد.

● **واتە:** مـرۆڤی سـەردەرچـوو بـە دیـتنی کـاڵایەک ئـەتوانـێ نـرخـی ئـەو چتەبەراوردبکا.

**۴۵- ماڵ ئەشەمەی ساحێو ماڵ ئەدات.**

○ خانه، بوی صاحب خانه را می‌دهد.

● **واته:** تەلسیری خاوەن ماڵ لە سەر چۆنیەتی ماڵ و منالی ئاشکرایە.

**۴۶- ماڵ نەگەییە هەوار، سەگ گەییە پای دار.**

○ بار و بنه به منزل نرسید، سگ به پای درخت رسید.

● به یه کێکی پاسوتاو ئەوترێ کە لە کارێکدا بەر لە هەموو کەس خۆی لێ کوتێ.

**۴۷- ماڵ هەزار ماڵی لێ ئەکەوێتەو.**

○ از خانه‌ای هزار خانه منشعب می‌شود.

● **واته:** لە بنەماڵەیەک هەزار ماڵ جیا ئەبێتۆ.

**۴۸- ماڵ یا بۆ غەرەز یا بۆ مەرەز.**

○ مال یا برای غرض یا برای مرض.

● **واته:** ماڵ و سەروەت لەو دوو ڕێگادا ئەبێ خەرج بکرێ.

**۴۹- ماڵی پر بوو لە رازیانە و خوەی بە دڵێشە مرد!**

○ خانه‌اش پر بود از رازیانه و خودش با دل درد مرد.

● به یه کێک ئەوترێ کە خۆی چتێکی حەیاتی بێ و کەڵکی ژیانی لێ وەر نەگرێ.

**یا ئەڵێن:** ماڵی پرە لە رازیانە و خوەی بە دڵێشە ئەمرێ.

**۵۰- مامان وەختێ فرە بێ، سەر مناڵەکە لار ئەوێ!**

○ ماما وقتی زیاد باشد، سر نوزاد کج می‌شود.

● **واته:** لە بەعزە کارێکدا ئەگەر چەن کەس بەرپرس بن، کارەکە خراپ ئەبێ.

**۵۱- مامر برسی خەرمان ئاو بریاگ لە خەوا ئەوینێ!**

○ مرغ گرسنه خرمن آب برده را در خواب می‌بیند.

● **واته:** هەر کەس ئەوەی لە خەوا ئەبینێ کە پێویستیەتی و دڵی هابەلایەوە.

**۵۲- مامر بێتە جۆش، دەنووک ئەداتە سەر کەڵەشێرا!**

○ اگر مرغ به جوش بیاید، با نوک بر سر خروس می‌کوبد.
● **واته:** مێ ئەگەر بێتە جۆش زۆر تیژیێ بۆ نێر.

**۵۳ـ مامر تا خوەی خوڵ نەکا بە سەر خوەیا، کەس خوڵ ناکا بە سەریا.**
○ مرغ تا خودش خاک بر سر خودش نریزد، کسی بر سرش خاک نمی‌ریزد.
● **واته:** هەر بەڵایەك بە سەر مرۆڤدا بێت، لە خۆیەوە دائەکەوێت.

**۵۴ـ مامر رەش هێلکەی چەرمگ ئەکا.**
○ مرغ سیاه تخم سفید می‌گذارد.
● **واته:** لەکەسێکی بە رواڵەت ناشیرین، منالّی جوان ئەکەوێتۆ یا: لەکەسێکی خراپ، منالّێکی چاك ئەکەوێتۆ.

**۵۵ـ مامر کەفتە سەرچۆپی، کەڵەشێر لە داخا تۆپی!**
○ مرغ چوپی را به دست گرفت، خروس از غصّه دق کرد.
● بە پیاوێك ئەوترێ کە ژنەکەی لە زەماوەنا بەلای غەریبەوە سەرچۆپی بگرێ و ئەو لە داخا دەری تێدا نەبێ.

**۵۶ـ مامر هێلکەیش ئەکات و رێقنەیش!**
○ مرغ هم تخم می‌گذارد، هم فضله می‌کند.
● **واته:** لە مرۆڤ هەم منالّی چاك ئەکەوێتۆ و هەم خراپ.

**۵۷ـ مامۆ ئەت دا بە ئاوا، خالّۆ ئەت گرێتەوا!**
○ عمو تو را به دست جریان آب می‌سپارد، دائی تو را از آب می‌گیرد.
● **واته:** مامە دوژمنتەو خالّۆ دۆستە.

**۵۸ـ مامە خەمە، کێفیێ خەمی هەر بۆکەمە.**
○ عمو غم خوار، کوهی‌غم برایش کم است.
● بە یەکێك ئەوترێ کە خەمی هەموو کەس بخوا.

**۵۹ـ مامەڵە نەکردگ، نە نەفع ئەوینیێ و نە زەرەر.**

○ آن که معامله نکرده است، سود و ضرری متوجّه او نیست.

● **واتە:** تاکەسێ نەکەوێتە ناوکار و مەشغەڵەوە تووشی کۆسپ نابێ.

**۶۰ـ مامەڵەو سەفەر تاقی کەرەوەن.**

○ معامله و سفر محک آزموناند.

● **واتە:** لە مامەڵەو سەفەردا ئەتوانی خەڵک بناسی.

**۶۱ـ مامە مامە، شایی و شیوەن دەسەوامە.**

○ عمو، شادی و شیون بده و بستان است.

● **واتە:** ئەگەر لە شایی و شیوەنی خەڵکدا بەشداری بکەی، ئەوانیش جوابت ئەدەنەوە.

**۶۲ـ مانگابە دزی کەڵ ئەگرێ و بە ئاشکرا ئەزێ.**

○ مادّه گاو مخفیانه جفتگیری می‌کند و آشکارا می‌زاید.

● **واتە:** بەعزە کارێ ئەگەرچی دوور لە چاوی مەردم ئەنجام ئەدرێ بەڵام لە ئاکامدا هەر ئاشکرا ئەبێ.

**۶۳ـ مانگا مرد و بریا دۆ.**

○ مادّه گاوِ مرد و دوغ قطع شد.

● **واتە:** ئەو خێرە وا لەو ڕێگەوە دەسگیرمان ئەبوو، بڕا.

**۶۴ـ مانگا نەزایگە، پەنێر ئەفرۆشێ!**

○ مادّه گاو نزائیده، پنیر می‌فروشد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بێ دەسمایە و لە هیچ نەبوو، موعامەلە بکا.

**۶۵ـ مانگ خوەی دیارە، چ هەوەجێ بە ئیشارە ؟**

○ ماه خودش پیداست و نیازی به اشاره نیست.

● **واتە:** چتێ کە خۆی ئاشکرایە، پێویست ناکا تۆ بێژی.

**۶۶ـ مانگ دیارە، حەوەجێی بە ئیشارە نی‌یە.**

○ ماه پیداست و احتیاجی به اشاره ندارد.

◙ وەکوو پەندی پێشوو.

**٦٧ـ مانگەشەو لە ئێوارەوە دیارە.**

○ ماه از اوّل غروب پیداست.

● **واتە:** چۆنیەتی هەرچتێ لە ئەوەڵەوە دیارە.

**٦٨ـ مای دۆخواکەت هاوردەوا!**

○ دوغینه را قوام آوردی.

● بە تەوس ئەوترێ، بە یەکێ کە جەزای پیاوەتی کەسێکی تری بە ناپیاوی دابێتۆ.

یانێ : ئافەرین باش جوابت دامۆ!

**٦٩ـ مردگ ئەسفەهان ناوەنە کاشان.**

○ مردۀ اصفهان را به کاشان نمی‌برند.

● **واتە:** هەرکەس پێوەندی بە جێگەیەکۆ هەیە و خێری ژیان و زەحمەتی مەرگی ئەبێ هەر بۆ ئەو جێگە بێ.

**٧٠ـ مردگت نەمرێت و پات لە شیوەنا، نەورگێت!**

○ مرده‌ات نمرده باشد و پایت از عزاداری قطع نشود.

● بە یەکێک ئەوترێ کە دایمە لە پرسە و شیوەنی خەڵکدا بێ.

**٧١ـ مردگ شۆر بە حەق خوەی گەیی، مردگ گۆر بە گۆرا!**

○ مرده شور به حق خود رسید، مرده گور به گور.

● **واتە:** هەرکەس ها لە بیری حەقی خۆیا و دوای ئەوە بە سەر هیچێکەوە کاری نی‌یە.

**یا ئەڵێن:** مردگ شۆر بە حەق خوەی بگەیە،...

**٧٢ـ مردگ مرد، شەیتان دەسی لێ هەڵئەگرێ.**

○ کسی که مرد، شیطان دست از سر او برمی‌دارد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە دوای مردنی کەسێ قسەی خراپ بەو مردووە بکا و بە وتنی ئەو پەندە، بەکینایە پێی بێژن کە تۆ لە شەیتان خراپتری.

**٧٣- مردگ مرد و با وەسیەتی بردا!**

○ مرده مرد و باد وصیّتش را برد.

● **واتە:** وەسیەتی ئەو مردووە بۆ میرات بەرە کانی بایەخی نی‌یە و عەمەلی پیٚ‌نا کەن.

**٧٤- مردن تیٚت و جاریٚکە، تانەی ناکەس گۆرەو شاریٚکە!**

○ مرگ می‌آید و یک بار است، اما طعنهٔ ناکس چون فشار قبر است.

● **واتە:** مەرگ ئەو عەزابەی نی‌یە کە تانە و تەشەری خەڵک هەیەتی.

**٧٥- مردن گەدا و عەیب دەوڵەمەن کەس پیٚ‌نازانیٚ!**

○ مردن گدا و عیب ثروتمند را کسی نمی‌فهمد.

● **واتە:** هەژار نانی نی‌یە تا پرسە کەر بیخواو یادی بکەن، لە نەتیجەدا کەس نازانیٚ کەی مردووە؟ دەوڵەمەنیش پارەی هەیە و عەیبە کانی بە پارە دائەپۆشریٚ.

**٧٦- مرۆچە چەس تا کەلەپاچەی چەبیٚ ؟**

○ مورچه چیست تا کلّه پاچه‌اش چه باشد ؟

● بە چتیٚکی بچووک ئەوتریٚ کە هیچ حیساب و کتیٚبیٚ لە سەری نە کریٚ.

**٧٧- مریشک بۆ شەویٚکیش بیٚت، جیٚگەی خوەی خوەش ئەکات.**

○ مرغ برای یک شب هم که شده جای استراحت خود را درست می‌کند.

● **واتە:** مرۆڤ نابیٚ لەم بارەوە لەو مریشکە کەمتر بیٚ.

**٧٨- مریشک هات لاسایی قاز بکاتەو، قنگی دریا!**

○ مرغ آمد تقلید غاز را در بیاورد، کونش پاره شد.

● بە یە کیٚ ئەوتریٚ کە بیٚ‌ئەوەی بتوانیٚ، وە کوو کەسیٚکی‌تر عەمەل بکا و لە ئاکامدا تیٚ‌بشکیٚ.

**٧٩- مزگت برمیٚ، میٚحراوە کەی هەر ئەمیٚنیٚ.**

○ مسجد خراب شود، محرابش باقی می‌ماند.

● **واتە:** کەسیٚ کە زووتر جوان و ریٚک و پیٚک بوو بیٚ، لە پیریش دا نیشانەیە کی ئەو جوانی‌یەی تیٚدا ئەبینریٚ.

**٨٠ـ مزگت دروس نەوگە، گەدا بەر درگای گرت!**

○ هنوز مسجد ساختە نشدە، گدا دم در را گرفتە است.

● **واتە:** بەر لە ئەوە کارێ بکرێ، میرات بەری بۆ راستەوە بوو.

**٨١ـ مژ و موڵ لە ناوکوێرگەلا چاو ساقە!**

○ نیم کور در میان کورها راهنما است.

◙ بڕوانە بۆ پیتی «ل»: لە ناو کوێرگەلا...

**٨٢ـ مس، مس چەتە ؟ یەک دەفعە بێژە مسەفا.**

○ چرا مص، مص می‌کنی؟ یکدفعە بگو مصطفی.

● **واتە:** چی لە دڵتایە، دەری خەو ئەوەندە مەیخەرەگەروو.

**٨٣ـ مشت نموونەی خەروارە.**

○ مشت نمونۀ خروار است.

● **واتە:** نەختێ لە چتێ، بۆ ناساندنی تەواوی ئەو چتە کیفایەتە.

**٨٤ـ مشک کوێر نان لە ماڵی دەرنایەرێ!**

○ موش کور نان از خانەاش بیرون نمی‌آورد.

● بە یەکێکی رژد و ماڵ خۆ نەخۆر ئەوترێ کە خێری بۆکەس نەبێ.

**٨٥ـ مشک لە ماڵیا جووچکەی چەور ناوێ!**

○ موش در خانۀ او دمش چرب نمی‌شود.

● بە یەکێکی رژد ئەوترێ کە لە ماڵیا خواردەمەنی چەور پەیدا نەبێ.

**٨٦ـ مشک نە ئەچوو بە کونا، گزگێکیشی ئەبەست بە جووچکەیەوا!**

○ موش در سوراخ نمی‌رفت، جارویی هم بە دمش می‌بست.

● بە کەسێک ئەوترێ کە خۆی لە جێگایە کدا رێگە نە کەن، کەسێکی تریش لە گەڵ خۆیا بیا.

**٨٧ـ مل لە چەقۆ ئەساوێ!**

○ گردن به چاقو می‌مالد.

● به یه کێکی شەڕ فرۆشی بێ‌حەیا و دەس‌تەنگ ئەوترێ که شەڕ فرۆشی بکات بۆ ئەوەی چتێکی لە کەسێ دەس کەوێ.

**٨٨ـ منالْ دەوڵەمەن سەور ئەکا تا لە ئاسیاو تێتەو، منالْ گەدا سەور ناکا تا لە تەنوور دەرتێ!**

○ بچّۀ آدم توانگر صبر می‌کند تا از آسیاب برگردد، بچّۀ آدم تهیدست صبر نمی‌کند تا از تنور درآید.

● **واتە:** دەوڵەمەن سەبری هەیە و بەدەوڵەت ئەگا هەژار سەبری نی‌یە و هەر بێوڵەتە.

**٨٩ـ منالْ کەمتر بدوێنە، ژینی دووری لێ مەسێنە.**

○به بچّه کمتر محبّت کن، تا در دوری تو از بین نرود.

● **واتە:** ئەگەر منالْت زۆرتر لە ئەندازە دواند، دڵت پێ ئەبەستێ و لە دووری تۆ ژیانی تاڵ ئەبێ.

**٩٠ـ منالْ مەلەوان لە ئاوا ئەخنکێ!**

○ فرزند شخص ملوان در آب غرق می‌شود.

● **واتە:** کەسێ لە کارێکدا شارەزابێ، ماڵ و منالْی ئەو لەو شارەزایی‌یە کەڵك وەر ناگرن.

**٩١ـ من ئاغە و تۆ ئاغە، کێ جێگەمان بۆ داخا ؟**

○ من خان و تو خان، کی رختخوابمان را پهن کند ؟

● به یه کێکی ژێردەسە ئەوترێ که ئەرکی سەرشانی خۆی لە بیر چوویێتۆولە ئەندازەی خۆی زیاتر پادا کێشێ.

**یا ئەڵێن:** من ئاغە و تۆ ئاغە، کێ کەرە کە بکاتە زاخە ؟

**٩٢ـ من ئێژم سیر، ئەو ئێژێ پیاز!**

○ من می گویم سیر، او می گوید پیاز.

● **واتە:** قسەمان یە ك ناگرێ و پێکەوە نامانکرێ.

٩٣- **من ئێژم نێرە، ئەو ئێژێ بیدۆشە!**

○ من می‌گویم نر است، او می‌گوید بدوش.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە کارێکدا باری ئینکار بگرێ.

٩٤- **من بۆ تۆ مردگ، تۆ من بە هیچ حەساو نەکردگ.**

○ من برای تو مرده، تو من را به هیچ حساب نکرده.

● **واتە:** من تۆم زۆر خۆش ئەوێ، بەڵام تۆ لە من ناپرسی.

٩٥- **من بەم باگەلە نالەرزم.**

○ من با این بادها نمی‌لرزم.

● **واتە:** ئەم نەوعە هەڕەشە و گوڕەشە من لە مەیدان دەرناکا.

٩٦- **من رازی بم بە نان جۆ، سەر خاقان پە قنگ خوسرۆ.**

○ من راضی باشم به نان جو، سرخاقان به کون خسرو.

● **واتە:** مرۆڤی قانیع، منەتی هیچ کەس ناکێشێ و سەری بەرزە.

٩٧- **من رازی و تۆ رازی، چ نیازە بە قازی ؟**

○ من راضی و تو راضی، چه نیازی است به قاضی ؟

● **واتە:** وەختێ کوڕ وکچ بە یەک رازی بن یا وەختێ دوو لایەنی شەڕ لە یەک خۆش بن، پێویستی بە مەحکەمەی قازی نی‌یە.

٩٨- **من ریشم گڕی گرتگە، ئەو ئێژێ بێرا سیگارەکەم رۆشن کەم!**

○ من ریشم آتش گرفته است، او می‌گوید آن آتش را بیاور سیگارم را روشن کنم.

● **واتە:** هەر کەس ها لە بیری قازانجی خۆیا و بیر لە زەرەری مەردم ناکاتۆ.

٩٩- **من کۆم کردەو بەکزەکز، ئەو هات بردی بە زۆر کوزا!**

○ من با تلاش جمع کردم، او آمد و بازور کُس آن رابرد.

● قسەی ژنێکە وا بە زەحمەت ماڵێکی نابێ بەیەکۆ و شووەکەی چووبێ ژنێکی تری خواستبێ و ئەو ژنە تەپی دابێتە سەر ماڵەکە و بووبێ بە خاوەنی ئەو دەسڕەنج و ماڵە.

**١٠٠ـ من که به ئاگر کەسێ گەش نەومەو، بۆچە بە دووکەڵی رەش بوومەو ؟**

○ من که به آتش کسی روشن نشوم، چرا باید به دود او سیاه بشوم ؟

● **واته:** من که لەو کەسە، خێرێکم نەدیوە، بۆچی ئەبێ دووکەڵی زەرەری رەشم بکاتۆ؟

**١٠١ـ من منم، تۆکێیت ؟**

○ من منم، تو کیستی؟

● به یه کێک ئەوترێ که خۆی وەکوو تۆ بدا له قەڵەم.

**١٠٢ـ من نیم وگەدایی، ئێرەنە کولیایی.**

○ وقتی که من گدایی بکنم، اینجا نه کلیایی.

● **واته:** سواڵ کردن له هەر کوێ بێ بۆ سواڵکەر، فەرقی نییە.

**١٠٣ـ موورگ بێ کونا چۆن دا ئەمێنێ؟ ئەیکەنە نگین رەونەق ئەسێنێ.**

○ خرزهٔ ناسفته چگونه معطل می‌ماند؟ آن را تبدیل به نگین انگشـترمی‌کنندو ارزش پیدا می‌کند.

● **واته:** ئەو ئافرەتەی وا دەستاژۆ نەبووە، وەکوو نگێنی ئەنگوسیله قەدرو حورمەت پەیدا ئەکا.

**١٠٤ـ موورگ هاوساماڵ، مەگەر بە شەوا بیکەیتە مل!**

○ خرزهٔ همسایه را مگر شب به گردن بیاویزی.

● **واته:** ماڵی مەردم یا ماڵی دزیەتی به ئاشکرا بەهرەی لێ وەر ناگیردرێ.

**١٠٥ـ مووسا بۆ تۆ چووە کێف توورا**

○ موسی برای تو به کوه طور رفت.

● **واته:** ئەو کارە بە سوودی تۆ تەواو بوو.

**١٠٦ـ موو لە ماس ئەکێشێ!**

○ مو از ماست می‌کشد.

● **واته:** زۆر بە هۆش و دەقیقە.

**یا ئەڵێن:** موو لە ماس جیا ئەکاتەو.

**١٠٧ـ موو لە زوانم دەرهات.**

○ مو بر زبانم روئید.

● **واتە:** ئەوەندە قسە و ئامۆژگاریم کرد، هیلاك بووم.

**١٠٨ـ موو لە ناو مشت دەرنایە.**

○ مو از کف دست نمی‌روید.

● **واتە:** چتێ لەو کەسە حاسڵ نابێ.

**١٠٩ـ مووی سەرم لە ئاسیاوا چەرمگ نەکردگە!**

○ موی سرم را در آسیاب سفید نکردە‌ام.

● **واتە:** دنیایە کم دیوە و تەجروبەی ژیانم هەیە.

**١١٠ـ موویەک لە ورچێ، هەر غەنیمەتە!**

○ مویی ار خرسی، غنیمت است.

● **واتە:** لەو کەسە، نەختێ خێریش دەس‌کەوێ هەر باشە.

**١١١ـ مەتیلێم تەشی ڕێس بێت، بە دارێکیش تەشی ئەڕێسێ!**

○ عمّەام دوک ریس باشد، با یک قطعە چوب نیز دوک می‌ریسد.

● **واتە:** کەسێ ئەهلی کارێ بێت بڕو بیانوو نایەڕێتۆ.

**١١٢ـ مەر بەرخ خوەی پاشێل ناکا.**

○ گوسفند برّۀ خود را زیر پا لە نمی‌کند.

● **واتە:** هیچ کەس قینی لە منالّی خۆی نی‌یە و زەرەری بۆ ڕەوا نابینێ.

**١١٣ـ مەردم برق ئەیانگرێت و ئێمە چراموشی!**

○ مردم را برق می‌گیرد و ما را چراغ موشی.

● **واتە:** بەختی ئێمە لە مەرگیشدا هەر شەڕە.

**١١٤ـ مەردم پارۆیان کرد، ئێمە شارۆی ئەکەین.**

○ مردم پارو کردند، ما ماندەها را جمع می‌کنیم.

● **واته:** مەردم هەموو نەختینەکانی ئەو چتەیان برد و ئێمەکەوتووینەتەکۆکردنەوەی پاشەرۆك و خەوش و خاڵەکەی.

**١١٥ـ مەردم تۆر ئەخا، ماسی ئەگرێ ؛ ئێمە تۆر ئەخەین، قورواق ئەگرین!**

○ مردم تور می‌اندازند، ماهی صید می‌کنند؛ ما تور می‌اندازیم، قورباغه نصیبمان می‌شود.

● **واته:** بەختی رەشی ئێمە لەگەڵ بەختی سەوزی خەڵکدا doورن لە یەك.

**١١٦ـ مەردم سەگی لێ ئەوەرێ و ئێمە کتک!**

○ مردم مورد حمله سگ قرار می‌گیرند و ما مورد حملهٔ گربه.

● **واته:** بەختی ئێمە ئەوەندە شەڕەکە دوژمنەکەیشمان، دوژمن نی‌یە.

**١١٧ـ مەرگ کەر زەماوەن سەگە!**

○ مرگ خر جشن و پایکوبی سگ است.

● **واته:** دوای مەرگی ئینسانی رژد و نەفام، میرات بەرانی شایی و پلەزیقان ئەکەن.

**١١٨ـ مەرگ لە تەک هاوساماڵا، جەژنە.**

○ مرگ با همسایه، عید است.

● **واته:** هەموو کارێ تەنانەت مەرگیش لەگەڵ هاوماڵدا خۆشە.

**١١٩ـ مەکری ژنان بارە خەران، خەرنەوەران چێش مەکەران ؟**

○ مکر زنهارا باید خر حمل کند، اگر خر آن‌را حمل نکند چه می‌توان کرد ؟

● **واته:** کەس لە مەکری ژنان تێناگاو ژمارەیش ناکرێ.

**١٢٠ـ مەگەر دایک کراس کەوگ مردگە ؟**

○ مگر مادر پیراهن آبی مرده است ؟

● **واته:** ئەمە نە، یەکێکی تر.

**١٢١ـ مەگەرگونی با لە خوم!**

○ مگر بیضه‌اش را نیل بگیرد.

● **واتە:** هیچ کارێکی پێ ناکرێ.

**۱۲۲ـ مەگەر هێلکەی دوو زەردێنەی بۆم کردگە ؟**

○ مگر تخم دو زرده برایم گذارده است ؟

● **واتە:** مەگەر کارێکی زۆر گرینگی بۆم کردووە تا رێزی لێ بگرم ؟

**۱۲۳ـ مەسی لە هەسی.**

○ مستی از داشتن میسر است.

● **واتە:** تا کەسێ نەیبێ ئەو خەرجە ناکا.

**۱۲۴ـ مەلاّ مفتە ناچێتە مێحراو!**

○ مُلاّ مفت به محراب نمی‌رود.

● **واتە:** ئەم کارەبە مفتە ناکرێ.

**یا ئەڵێن:** مەلا بە خۆڕایی ناچێتە مێحراو.

**۱۲۵ـ مەل مێوە خوەر دەنووکی لارە.**

○ پرندهٔ میوه‌خوار نوکش کج است.

● **واتە:** هەرواکە هەموو مەڵی میوە خۆر نی‌یە، هەموو کەسێکیش ناتوانێ ئەو کارە بکا.

**۱۲۶ـ مەلیچک پەلامار بنچک.**

○ گنجشک پناه به بوته.

● **واتە:** کەسێکی هەژار و بێدەسەڵات ناچار ئەبێ لە تەنگ و چەڵەمەی ژیاندا پەنا ببا بە پەناگایەکی بێ قابل.

**۱۲۷ـ مەلیچک رەنگ ئەکات و بە نرخ سەیرە ئەیفرۆشێ!**

○ گنجشک رنگ می‌کند و به نرخ سهره می‌فروشد.

● بە یەکێکی ساختەچی و فێڵباز ئەوترێ کە کڵاو بنێتە سەری مەردم.

**۱۲۸ـ مەلیچک کوێر، خوا هێلانەی بۆ ئەکا.**

○ گنجشک کور، خدابرایش لانه می‌سازد.

● **واته:** خوا مەخلوقی هەژار و زوێری خۆی یارمەتی ئەدا.

**۱۲۹ـ مەمشۆرە بەگواو، خاسیش مەکە بۆ سواوا**

○ مرا با آب آلوده مشور، خوبی هم برای احسان مکن.

● **واته:** لەلایەکەوە ئابرِوم ئەبەی و لەلایەکەوە چاکەم لەگەڵ ئەکەی، کەوابوو ئابرِوم مەبەو چاکەیشم لەگەڵ مەکە.

**۱۳۰ـ مەنازە بە بوون، مەگری بە نەبوون.**

○ به داشتن مناز و به نداشتن گریه‌مکن.

● **واته:** چونکە بورن و نەبورنی ماڵی دنیا بەقای نی‌یە و تا سەر نابێ.

**۱۳۱ـ مەن بە مەن خوەی، مەلیچک بە سەنگ خوەی.**

○ من با من توزین می‌شود و گنجشک نیز به اندازه وزن خودش.

● **واته:** هەموو چتێ بە پێوانەی خۆی حیسابی لە سەر ئەکرێ.

**۱۳۲ـ مەن پر بوو، شەرمی لە کەس نی‌یە.**

○ من که پر شد، از کسی شرم ندارد.

● **واته:** پێوانە کە پڕ بوو ئەڕێژێ.

**۱۳۳ـ مەویژە رەشە لە گیرفان، بەفرە چەرمەگ لە کۆڵان.**

○ مویز سیاه در جیب، برف سفید در کوچه.

● **واته:** رواڵەت نابێ بە مەزەنەی قەدر و ئەرزش، بەڵکوو چۆنیەتی زاتی مرۆڤ پێوانەی ئەرزشە.

**۱۳۴ـ مەویژە رەشە، ها لە گۆزە رەشا.**

○ مویز سیاه، در کوزهٔ سیاه است.

● **واته:** چتی بە نرخ و خۆش ها لە جێگای ناخۆشا.

**یا:** ئافرەتی جوان ها لە خانوی هەژاری دا.

**۱۳۵ـ مەیکوتە، جەوتە!**

○ نکوب، جفت بلوط است.

● **واتە:** ئەو کارە کە تۆ ئەیکەی، بێ نەتیجەیە.

**۱۳۶ـ مەیموون جوانە جلی کەی، تەماشای قاچ و قولی کەی!**

○ میمون خوش منظره است اگر بر تنش لباس بپوشانی و به پاها و ریختش نگاه کنی.

● بە تەوس ئەوترێ بە یەکێکی ناشیرین کە جل و بەرگێکی خاوێن بکرێتە بەری و جێگەی پێکەنین و گاڵتە بێ.

**۱۳۷ـ مەیمون لە خوەیا نەو، هاوڵەیشی دەرهاورد!**

○ میمون قیافەش کم خندەدار نبود، آبله هم درآورد.

● بە یەکێکی ناشیرین ئەوترێ کە بە هۆی پێش هاتێکی ترەوە ئەوەندەی‌تر ناشیرین بووبێ. یاکەسێ عەیبێکی بووبێ و عەیبێکی تریشی لێ زیادبووبێ.

**۱۳۸ـ مەیەژە بوومان، بێژە هەسمان.**

○ نگو داشتیم، بگو داریم.

● **واتە:** لەوەی کە بووتە قسە مەکە، بەڵکوو لەوەی قسە بکە وا ئێستە هەتە.

**۱۳۹ـ مێخ دوو حاچە بە زەویا ناچێ.**

○ میخ دو شاخه در زمین فرو نمی‌رود.

● **واتە:** کاری دوو بەرە کێ سەرناگرێ.

**۱۴۰ـ میراتی کەر هین کەمتیارە.**

○ ارث خر مال کفتار است.

● **واتە:** میراتی ئەو کەسە بێ نرخە بە کەسێکی بێ‌نرخ تر ئەگا.

**۱۴۱ـ مێمان بە رووی خانەخوێ نان ئەخوا.**

○ مهمان با توجّه به چگونگی برخورد صاحب خانه، غذا می‌خورد.

● **واتـە:** خانەخوێ هەرچۆن لە گەڵ میواندا رووانڕووبێ، میوان بەو جۆرە لە سـەر سفرەی ئەو ماڵەدا نان ئەخوا.

**١٤٢ـ مێمان، جەژن ساحێو ماڵە.**

○ مهمان، عید صاحب خانه است.

● **واتە:** میوان ئەگەر هاتە ماڵێك، میوانداری لێ ئەکرێو خاوەنماڵ بەوکارە خۆشحاڵە.

**١٤٣ـ مێمان کەر ساحێو ماڵە!**

○ مهمان خر صاحب خانه است.

● **واتە:** هەرچی خاوەن ماڵ بێژێ میوان گوێ رایەڵیەتی.

**١٤٤ـ میمی نەئەپەرمی بە خوەیا شوو بکا، داوای جیازی ئەکردا!**

○ عمّه در خود توان شوهر کردن نمی‌دید، جهیزیّه در خواست می‌کرد.

● بە یەکێك ئەوترێ نەتوانێ کارێ بکا و نەشتوانێ لە خێری ئەو کارە چاوپۆشی بکا.

بە جێگەی «میمی» ئەیش‌ڵێن: «مەتی»

**١٤٥ـ میمی نەئەتری، بە زۆر ئەیان تران!**

○ میمی نمی‌گوزید، با زور به آن کار وادارش می‌کردند.

● بە یەکێك ئەوترێ کە بە زۆر کارێکی ناشیرینی پێ بکەن.

**یا بە جێگەی «میمی» ئەڵێن:** «مەتی» ...

**١٤٦ـ مێوان خوەشی لە مێوان نە ئەهات، ساحێو ماڵ لە هەرتکیان.**

○ مهمان از مهمان خوشش نمی‌آمد، صاحب خانه از هر دو.

● مەبەست میوانی سەربارە.

**١٤٧ـ مێوان نان ناخوەی ؟**

○ مهمان نان نمی‌خوری ؟

● **واتە:** هەرواکە پرسیاری وا لە میوان ناکرێ،ئەنجامی ئەوکارەش پێویستەوجێگەی پرسیار نی‌یە.

**یا ئەڵێن:** مێوان نان ئەخوەی ؟

# ■ ن

۱- **ناپیاگماڵی بووبه کەعبە، سەری پیا مەکە.**

○ نامرد اگر خانه‌اش کعبه شد، آنجا مرو.

● **واتە:** نامەرد جێگەی باوەڕ نی‌یە.

۲- **ناتانێ مردگ بشۆرێ، قیرە قیری خستگەسە زینگ.**

○ نمی‌تواند مرده بشوید، زنده را به داد و فریاد انداخته است.

● بە یەکێکی نەتوانکار ئەوترێ کە بەو هۆیەوە دەور و بەری خۆی خستبێتە هاوار و عەزیەت.

**یا ئەڵێن.** نەیەتوانی مردگ بشۆرێ، تەقە تەقی خستووە زینگ.

۳- **ناخوون خوەت پشتت نەخورنێ، ناخوون کەس نایخورنێ.**

○ ناخن خودت پشتت را نخاراند، ناخن هیچ کس نمی‌خاراند.

● **واتە:** خۆت ئەبێ لە بیری خۆتابی.

۴- **نازانم، رەحەتی گیانم!**

○ نمی‌دانم، راحت جانم.

● **واتە:** لە کارێکدا کە ئاکامێکی پڕ عەزیەتی هەیە، خۆت پێوە مەکە و بێژە نازانم و رەحەت بە.

**٥ـ نازانێ هەڵپەرێ، ئێژێ حەوشەکەی لارە!**

○ نمی‌داند برقصد، می‌گوید حیاطش کج است.

● بە یەکێک ئەوترێ، کارێ نەزانێ و بیانووی پڕو پووچی بۆ بێنێتۆ.

**یا ئەڵێن:** نەیەزانی هەڵپەڕێ، ئەیوت حەوشەکەی لارە.

**٦ـ ناز دگەران هەر بە زوانە، ناز جگەران بە دڵ و گیانە.**

○ ناز دیگران زبانی است، ناز والدین از دل و جان است.

● **واتە:** غەریبە هەر بەزوان نازی منالی مەردم ئەدا، بەڵام نازی باوک ودایک بە دڵ وگیانە.

**٧ـ نازیان دا بە پیاز، پیاز دەسی کردە گازە گازا!**

○ پیاز را ناز کردند، شروع کرد به گاز تولید کردن.

● بە یەکێکی بێشەرم ئەوترێ کە لە پیاوەتی مەردم جەسوور ببێ و پای زیاتر دا کێشێ.

**٨ـ ناشی پڵاو خوەر، بەلاوە تیکە بۆ لووتی ئەوا!**

○ پلو خور ناشی، اول لقمه را به سوی بینیش می‌برد.

● **واتە:** ئەوەی لە کارێکدا شارەزا نەبێ، زوو هەڵە ئەکا و خۆی ئەناسێنێ.

**٩ـ ناشی سورناژەن، پف ئەکاتە سەرە گەورەکەیا!**

○ سرنازن ناشی، در دهانۀ بزرگ می‌دمد.

▣ وەکوو مەسیلەی پێشوو.

**١٠ـ ناعیلاجی سەر ئەکا بە ماڵ دوژمنا.**

○ ناچاربودن آدمی را به خانۀ دشمن می‌برد.

● **واتە:** ناچاری مرۆڤ منەت باری دوژمن ئەکا.

**١١ـ نامەتی وەک سەگ ئەوەرێ.**

○ نکبتش مثل سگ پارس می‌کند.

● بە یەکێکی بەد خۆ و قۆشمە ئەوترێ کە لەگەڵ کەسدا هەڵ نەکا.

**١٢ـ نان ئەخوات و نانێن ئەشکنێ.**

○ نان می‌خورد و ظرف نان را می‌شکند.

● بە یەکێکی بێ‌سفەت و سپڵە ئەوترێ.

**١٣ـ نان ئەو نانەسە، ئیمرۆ لە خوان وێت.**

○ نان آن است که امروز در سفره باشد.

● **واتە:** لەسەر ئەو چتە حیساب ئەکرێ کە ئەمڕۆ هەتە.

**١۴ـ نان بگیرگێ ئاو، ئاو بگیرگێ جاوا!**

○ نان در گلو گیر کند، آب ؛ آب گیر کند کفن.

● **واتە:** هەر چتێ لە قورووی مرۆڤ‌داگیر بکا، بە ئاو رەها ئەبێ بەڵام ئەگەر ئاو گیر بکا، مەرگ ها بە شوێنیۆ.

**یا ئەڵێن:** نان، ئاو؛ ئاو، جاو.

**١۵ـ نان بۆ خوەم و جۆ بۆ کەرەکەم.**

○ نان برای خودم و جو برای خرم.

● بە یەکێک ئەوترێ کە زیادتر لە ئەندازە تەماع‌کار بێ.

**١۶ـ نان بۆ نانەوا، گۆشت بۆ قەساو.**

○ نان برای نانوا، گوشت برای قصّاب.

● **واتە:** هەر کەس لە کارێکدا شارەزایە و کار ئەبێ بە ئەهلی خۆی‌راسپێردرێ.

**١٧ـ نان بەرە سەگ، مەیدە بە سپڵە.**

○ نان بده به سگ، مده به سفله.

● **واتە:** سەگ لە مرۆڤی سپڵە بە سفەت ترە.

**١٨ـ نان بەگوێچکە ئەجاوێ!**

○ نان با گوش می‌جود.

● بە یەکێکی گێل گەوج ئەوترێ.

**۱۹- نان بە مەزنەی رۆژ ئەخوا.**

○ نان به نرخ روز می‌خورد.

● به یه کێکی ساختەچی ئەوترێ کە لە هەر لایەکەوە بای بێ، بەو بارەدا شەن ئەکا.

**۲۰- نان بێ خوا ئەخوات و تر سۆڵ لێ‌ئات!**

○ نان بی نمک می‌خورد و گوز شور می‌زند.

● بە یەکێکی رووت و قووت بەڵام فیز قۆز و قسە زل ئەوترێ کە خۆی لێ‌گوم بووبێ.

**۲۱- نان پاڵەوان هەرکەس بیخوا، ئەشێ زۆران بگرێ!**

○ نان پهلوان را هر کس بخورد، باید کشتی بگیرد.

● **واتە:** لەگەڵ هەرکەسدا هەڵسە و دانیشەت کرد، ئەبێ بە خۆی ئەو عەمەل بکەی.

**۲۲- نان تا نەی‌جاوی، ناچێتە خوارەو.**

○ نان را تا نجوی، قورت داده نمی‌شود.

● **واتە:** هەموو کارێ زەحمەتی هەیە و بێ زەحمەت بە ئاکام ناگەیە.

**۲۳- نانت جۆیین بێ و خولقت گەنمین.**

○ نانت جوین باشد و اخلاقت گندمین.

● **واتە:** ئەگەر نان و خوانی باشت نی‌یە، قەیدی نی‌یە؛ بەڵام بەوشەرتە خولقت لەگەڵ میواندا باش بێ، قەرەبووی ئەو ناتەواوی‌یە ئەکاتۆ.

**۲۴- نان خوەی لەبەین دوو بەردا پەیا ئەکا.**

○ نان خودش را از بین دو سنگ به دست می‌آورد.

● بە یەکێکی ئازا و بە غیرەت ئەوترێ کە بۆ ژیانی خۆی و ماڵ و مناڵی هەوڵ بدا و نەوێستێ.

**۲۵- نانت گەنمین نی‌یە، خولقت گەنمین بێ.**

○ نانت گندمین نیست، اخلاقت گندمین باشد.

▣ وەکوو مەسیلەی ژمارە (۲۳)

**٢٦ـ نانت نی‌یە، زوانت بێ.**

○ نان نداری به مردم بدهی، زبان خوش داشته باش.

● **واتە:** نانت نی‌یە بیدەی بە مەردم، زوانت لەگەڵ مەردما خۆش بێ.

**٢٧ـ نان جۆ و گاڵ خوەمان، قەزای لە پڵاو سەدری سوڵتان.**

○ نان جو و ارزن خودمان، بلایش به جان پلو صدری سلطان.

● **واتە:** بە کەمی خۆمانەوە قەناعەت ئەکەین و بە سەربەرزی ئەژین و ژێـر مـنەتی سوڵتان ناچین.

**٢٨ـ نان خوەت لەبەر شاڵ خوەت.**

○ نان خودت زیر شال کمر خودت.

● **واتە:** بە خۆت دڵ ببەستە و هیوات بە هێزی خۆت بێ.

**٢٩ـ نان خوەم و کووزەڵەی کانی، مێوانی هەی مێوانی!**

○ نان خودم و تره‌تیزک آبی مهمانی هی مهمانی.

● **واتە:** ئەرك و دەست مایە لە خۆمانە و ناوی پیاوەتی کەسێکی تری لە سەرە.

**٣٠ـ نان رۆم ئەخوا و خەرج بە عەجەم ئەدا!**

○ نان روم را می‌خورد و خرج و باج به عجم می‌دهد.

● بە یەکێ ئەوترێ کە لە شوێنێکەوە یـا لە کـەسێکەوە خـێری دەس‌کـەوێ بـەڵام ئەو خزمەتی شوێنێکی تر یاکەسێکی تر بکا.

**٣١ـ نان رەق و دۆی تورش، ئەخوەی بخوە، ناخوەی چش!**

○ نان خشک و دوغ ترش، می‌خوری بخور، نمی‌خوری به درک.

● بە یەکێك ئەوترێ کە بە کەم و کزی ماڵێك رازی نەبێ و لە خواردەمەنی ئەو ماڵە بتۆرێ.

**٣٢ـ نان کۆماسی و پاس جرتاوا.**

○ نان کوماسی و پارس جرت آباد.

● **واتە:** خێری لە جێگەیەکۆ دەسگیر ئەبێ و لە جێگەیەکی‌تر پارێزداری ئەکا.

**یا ئەڵێن:** نان کونە ماسی ئەخوا و پاس جرتاوا ئەکا.

**٣٣ـ نان گەماڵێ ئەخوات و پاس توڵێ ئەکات.**

○ نان یک سگ نر را می‌خورد و به اندازهٔ یک توله سگ پارس می‌کند.

● بە یەکێکی زۆر خۆر و بێ‌هونەر ئەوترێ کە ئەوەندەی خەرجێ کە بۆی ئەکرێ، کار نەکا.

**٣٤ـ نان گەنمین، زک پۆڵاینی گەرەکە!**

○ نان گندم، شکم پولادین می‌خواهد.

هر نفسی حوصلهٔ ناز نیست        هر شکمی حاملهٔ راز نیست.

(نظامی)

● **واتە:** پیاوەتی و جوامێری کاری هەر کەس نی‌یە و کەسانی تەنگە جیقڵدان ناتوانن پایەگای پیاوەتی رابگرن.

**٣٥ـ نان گەیی بە ناوکی، پشتی هەڵکرد لە باوکی!**

○ نان به نافش رسید، از پدرش روی برگرداند.

● بە منالێ ئەوترێ کە گەورە بووبێ و دەسی گەیشتبێ بە دەمی خۆی و باوك و دایکی لە بیر چوو بێتۆ و روویانی لێ‌وەرگێڕابێ.

بە پێچەوانەی ئەو پەندە کە **ئەڵێ:** نان گەیی بە ناوکی، نۆکەری گرت بۆ باوکی.

**٣٦ـ نان گەیی بە ناوکی، نۆکەر ئەگرێ بۆ باوکی.**

○ نان به نافش رسید، برای پدرش نوکر اجیر می‌کند.

● بە منالێ ئەوترێ کە گەورە بووبێ و دەسی بە دەم خۆی گەیشتبێ و باوك و دایکی ئومێد پەیدا بکەن لە دەس‌رەنجی ئەو بحەسێنەوە.

**یا ئەڵێن:** نان ئەگەیە بە ناوکی، قلیان‌دار ئەگرێ بۆ باوکی.

**٣٧ـ نان لە دەم سەگ ئەرفنێ!**

○ نان از دهان سگ می‌رباید.

● بە یەکێکی زۆر برسی و کەم تاقەت ئەوترێ.

**۳۸- نان مووسایی بخوە و لە ماڵ مەسێحییا بخەفە.**

○ نان یهودی را بخور و در خانهٔ مسیحی بخواب.

● **واتە:** نانی موسایی (جوولەکە) پوختەو تەمیزە و ماڵی مەسێحی بۆ خەوتن ئەمنە.

**۳۹- نان مەردان لە سەر مەردان قەرزە.**

○ نان مردان وامی است بر گردن مردان.

● **واتە:** جوامێر، پیاوەتی مێردان لە بیر ناباتۆ.

**۴۰- نان مەرد، لە زک نامەردا نامێنێ.**

○ نان مرد، در شکم نامرد باقی نمی‌ماند.

● **واتە:** نامەرد، پیاوەتی مەردی لە بەر چاو نی‌یە.

**۴۱- نان و کەرەی مەلاژن، باریقەلای قێخاژن!**

○ نان و کرهٔ زنِ ملاّ، آفرین گرفتن زنِ کدخدا.

● **واتە:** یەکێ پیاوەتی ئەکا و بە ناوی کەسێکی‌ترەوە تەواو ئەبێ و دەس خۆشانەی لێ ئەکرێ.

**۴۲- نان ها بە لای گا پیرەوە.**

○ نان نزد گاو پیر است.

● **واتە:** گای پیر ئەزموونی شێف و وەردی هەیە و بۆ خاوەنی خۆی خێری داوەتۆ و جێگەی ڕێزە.

**۴۳- نان لە دەم سەگ ئەسێنێتۆ!**

○ نان از دهن سگ پس می‌گیرد.

● بە یەکێکی ڕژد و پیسکە ئەوترێ.

**۴۴- نان ناس و خوا نەناس!**

○ نان شناس و خدانشناس.

● بە منداڵی ماڵ ئەوترێ کە تەنیا تێر خواردن ئەناسێ.

**٤٥ـ نان، نان گەنمینە و دین، دین محەممەدە.**

○ نان، نان گندم است و دین، دین محمّد (ص).

● **واتە:** ئەو دوانە قەدر و بایەخیان هەیە.

**٤٦ـ نان و دۆ ئەخوا و بە ساون رەقی دەس ئەشۆرێ!**

○ نان و دوغ می‌خورد و با صابون مرغوب دست می‌شوید.

● بە یەکێکی نەدار بەڵام فیزقۆز ئەوترێ.

**یا ئەڵێن:** دانە برێشکە ئەخواو بە ساون رەقی دەس ئەشۆرێ.

**٤٧ـ نان هەرکەس بخوەی ئەشێ سەڵوات لە سەری بەی!**

○ نان هر کس را بخوری باید بر او صلوات بفرستی.

● **واتە:** ئەگەر لە کەسێ خێرێ یا پیاوەتی‌یەکت دی، ئەبێ قەدر ناس بی و ناوی ئەو کەسە بە چاکە بەری.

**٤٨ـ نانێکمان نەخواردگە بەو رۆنەو، دووبارە بچینە ئەو شۆنەو.**

○ نانی با آن روغن نخوردەایم، تا دوبارە بە آن محلّ برگردیم.

● **واتە:** خێرێکمان لەو کەسە یا لەو جێگە دەس‌نەکەوتووە تا دووبارە بچینەوە بۆ لای ئەو کەسە یا ئەو جێگە.

**٤٩ـ نانێکی خواردگە بەو رۆنەو، هەر ئەچێتە ئەو شۆنەو.**

○ نانی با آن روغن خوردە است و مجدداً بە همان محلّ برمی‌گردد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە جێگەیەکدا خێرێکی دەس کەوتبێ و دڵ لەو جێگە هەڵ نەکەنێ و هەر بڕواتۆ بۆ ئەو جێگە.

**٥٠ـ نانێ لە ماڵ خان دەرهات، دوو توڵ بە شۆنیەو بوو.**

○ نانی از منزل خان بیرون آمد، دو تولە بە دنبال آن بودند.

● **واتە:** خان بەخشیوەیەتی بەڵام دەس و پا، دەسی لێ هەڵنا گرن.

**٥١- نانی نەو پیازی ئەسەند.**

○ نان نداشت پیاز می‌خرید.

● **واتە:** ئەوەی کە پێویستی ژیانە نی‌یەتی، بە شوێن چتی ناپێویست‌دا ئەچێ.

**یا ئەڵێن:** نانی نەو بیخوات، پیازی ئەسەند ئیشتیهای باز بوێت.

**٥٢- نانی ها لە بەر شاڵیا.**

○ نانش در زیر شال کمرش است.

● **واتە:** خۆی ئەتوانێ خۆی بژینێ.

**٥٣- ناوجێکەر دڵی گوشادە.**

○ میانجی‌گر دلش باز است.

● **واتە:** ئەوەی ناوجێ ئەکا، خەمێکی نی‌یە کێ کوتەک ئەخوات و کێ کوتەک ئەوەشێنێ.

**٥٤- ناوزکی قۆرەی تێ، کەوشەکانی جیرەی تێ!**

○ شکمش قاروقور می‌کند و صدای تازگی کفشهایش نیز بلند است.

● بە یەکێکی زک برسی و داماو ئەوترێ کە هەر لە بیری جل و بەرگ و رەنگ و دەقی خۆیا بێ.

**٥٥- ناوزەوقی لە کەچەڵی خراوترە!**

○ تو ذوقی از کچلی بدتر است.

● **واتە:** لە رووبردنی مرۆڤ، دەردێکی گرانە.

**٥٦- ناوێ بە منەو بوو، نیام بە تۆوە، تاقەرەی قیامەت بسووتی پێەوە!**

○ اسمی که روی من بود، روی تو گذاشتم، که تا قام قیامت با آن بسوزی.

● **واتە:** ئەو ناوە ناخۆشە کە لە من نرا بوو، لە کۆڵ منۆ بوو، وە تۆ دوچاری بووی و ئەبێ پێوە بسووتی.

**٥٧- ناوێ گەورە و شارێ وێران!**

○ نامی بزرگ و شهری ویران.

● بە یەکێکی ناودار بەڵام پووچەڵ ئەوترێ.

٥٨ـ **ناوی هەس و ناوکی نی‌یە.**

○ اسم دارد و محتوا ندارد.

● بە یەکێک ئەوترێ ناودار بەڵام پووچەڵ.

٥٩ـ **نرخێکە و شاعەباس بریگیەسەو.**

○ نرخی است و شاه عباس تعیین کرده است.

● **واتە:** قیمەتی ئەم جنسە لەوەکەمتر نی‌یە.

٦٠ـ **نۆ پاچکە، نۆ نەفەری گەرەکە.**

○ نو پا گرفته، نُه نفر نیاز دارد.

● **واتە:** منالێ کە تازە پا ئەگرێ، پێویستی بە چەن کەس هەیە کە رای بگرن، وە ئەبێ زۆر هۆشیان بەلایەوە بێ.

٦١ـ **نۆکەر بێ خەڵات و بەرات، تاج سەرە.**

○ نوکر بدون خلعت و دستمزد، تاج سر است.

● **واتە:** خزمەتکاری بێ خەرج، جێگەی رێزە.

٦٢ـ **نۆکەر پاوشا، هاوشایی ئەکات.**

○ نوکر پادشاه، در شاهی مشارکت می‌کند.

● **واتە:** دەس‌وپای حاکم و فەرمان‌رەوا، دەم لەگەورەیی ئەدەن و خۆیان بە زل ئەدەن لە قەڵەم.

٦٣ـ **نوێژ خوێنی نوورینی، فرمان کەری شیرینی.**

○ نماز خوان باشی نورانی هستی، کار بکنی عزیز هستی.

● **واتە:** خواناس بەو زەحمەت کێش، تا خۆشەویست بی.

٦٤ـ **نە ئاگر بی، نە هاوار گۆران.**

○ نه آتش درخت بید، نه فریاد گوران.

● **واتە:** ئەو دوو چتە جێگەی باوەڕ نین؛ ئاگری دار بی زوو تەواو ئەبێ و هاواری گۆرانیش راست نی‌یە چونکە هانادەمە.

**۶۵- نە ئاگر و نە دوو، هیچی ناوێ بە شوو!**

○ نە آتش و نە دود، هیچکدام شوهر نمی‌شود.

● **واتە:** شوو بۆ ژن لە هەموو چت و لە هەموو کەسێ باشترە.

▣ بڕوانە بۆ پیتی «خ»: خوەشە ئاگر خوەشە دوو...

**۶۶- نە ئەسپ لە بەهارا هەڵئەبژێرگێت و نە ژن لە زەماوەنا.**

○ نە اسب در بهار انتخاب می‌شود و نە زن در عروسی.

● **واتە:** گەن ترین ئەسپیش لە بەهارا هەر دێ بە خۆیا و دیمەن پەیدا ئەکا و ناشیرین ترین ئافرەتیش لە زەماوەنا بە جل و بەرگی رەنگامە، هەر جوان ئەداتە چاو، کەوا بوو ئەو دوو چتە لەو دوو کاتەدا، هەڵ نابژێردرێن.

**۶۷- نە ئەم قاوەتوونە و نە ئەم مانگ بوونە!**

○ نە این ناهار و نە این خستگی.

● **واتە:** نە ئەو قاوەتوونە ئەخۆم و نە ئەو هیلاک بوونەش ئەکێشم.

قسەی ئەو کابرایە کە خوڵکیان کرد بۆ ماڵێ قاوەتوون بخوا، بەڵام ئـەوەنـدە کـاری بێگاریان پێ کرد تا لە شان و قۆڵیان خست. وە ئەویش لە ئەنجامدا ئەو پەندەی وت.

**۶۸- نە ئەونە شیرین بە بت خوەن، نە ئەونە تاڵ بە، تفت بکەنەو.**

○ نە آنقدر شیرین باش بخورندت، نە آن اندازە تلخ باش، تُفت کنند.

● **واتە:** حاڵەتێکی بەینابەینت بێ.

**۶۹- نە بکەفە شۆن زاڵم و نە شۆن قاترا**

○ دنبال ظالم و قاطر راە مرو.

● **واتە:** هەر دووی ئەوانە لەقە فڕێ ئەدەن ونزیکی کردنیان بۆ مرۆڤ جێگەی مەترسی‌یە.

**۷۰- نە بکەی، نە بخوەی، تەماشای سای گەردەنی کەی!**

○ کار نکنی و غذا نخوری و فقط بە سیما و گردنش نگاە کنی.

● بە یەکێکی زۆر جوان و ڕێك و پێك ئەوترێ کە هەر بۆ ئەوە باش بێ دانیشی و تەماشای کەی.

۷۱- **نە بۆکوێر هەڵپەرە و نە بۆ کەڕ گۆرانی بێژە.**

○ نە برای کور برقص و نە برای کر آواز بخوان.

● **واتە:** کوێر هەڵپەڕکێی تۆ نابینێ و کەڕیش گۆرانی تۆ ناژنەوێ، کەوا بوو بۆ ئەو دوو کەسە، ئەو دوو کارە مەکە.

۷۲- **نەبوونی سەر بە ماڵ نامەردۆ ئەنێ.**

○ تنگدستی آدم را مجبور می‌کند که به نامرد رو بیندازد.

● **واتە:** دەس تەنگی و هەژاری، مرۆڤ مەجبور ئەکا لە نامەرد روو بخا.

۷۳- **نە بە بەرخی، تێر شیرمان خوارد، نە بە کاوری، تێر گیامان خوارد.**

○ نە در زمان برّەبودن سیر شکم خود شیر خوردیم، نە در زمان بلوغ از گیاه سیر شدیم.

● **واتە:** هەر لە ئەوەڵی عومرمانەوە تا ئێستا خۆشیمان نەدیوە و رەحەت نە ژیاوین.

۷۴- **نە بەرگ بۆکوێر، نە خواردن بۆ تێر.**

○ نە لباس برای کور، نە خوراک برای سیر.

● **واتە:** کوێر خاس و خراپی جل و بەرگ نابینێ و قەدری نازانێ و تێریش، مەیلی خۆراکی نی‌یە.

۷۵- **نە بەکەنین زاڵم باوربکە، نە بە خوەشی زمسان!**

○ نە به خندهٔ ظالم باور داشته باش، نە به هوای خوش زمستان.

● **واتە:** هەر دووکیان لە ماوەیەکی کەمدا ئەگۆڕێن.

۷۶- **نە پای هەڵپەرکێم هەس، نە دەم پڵاوخواردن!**

○ نە پای رقصیدن دارم، نە دهان پلو خوردن.

● **واتە:** من نایەم بۆ ئەو زەماوەنە چونکە ئەهلی هەڵپەڕکێ و پڵاو خواردن نیم.

**٧٧- نە تر تانجی و نە گۆشت کەروێشک.**
○ نە گوز تازی و نە گوشت خرگوش.
● **واتە:** ئەو قەباحەتە قەبووڵ ناکەین و ئەو خێرەیشمان ناوێ وا لەو قەباحەتەوە دەسگیر ئەبێ. راوچی ئەبێ بۆی تری تانجی بچێ بە لووتیا تا گۆشتی کەروێشکی دەس کەوێ.

**٧٨- نە ترە دەنگی بێ و نە تسە بۆی بێ!**
○ نە گوز است صدا داشته باشد و نه چُس است بو داشته باشد.
● بە چتێ یا بە یەکێکی بێ کەڵک ئەوترێ.

**٧٩- نەجیب خەتا ناکا، نانەجیب وەفا ناکا.**
○ نجیب مرتکب خطا نمی‌شود، نانجیب وفادار نیست.
● **واتە:** مرۆڤی خانەدان کەمتر هەڵە ئەکا و ناوەجاخیش بڕوای پێ ناکرێ.

**٨٠- نە خوەم خواردم نە قۆناخم، سەگ گەل خواردیان بوو بە داخم!**
○ نه خودم خوردم نه اهل و خانوادهٔ من، سگها خوردند و داغ دلم شد.
● **واتە:** ماڵەکەم خۆم و ماڵ و مناڵم نەمان خوارد و غەریبە خواردی و بوو بە داخی دڵم.

**٨١- نەخوەشی پیر، وەسە رەشی قیر.**
○ ناخوشی پیر، مثل سیاهی قیر است.
● **واتە:** نەخۆشی پیر لێی نابێتۆ.

**٨٢- نەخوەشی جوان، وەسە تکەی بان.**
○ ناخوشی جوان، مثل چکهٔ بام است.
● **واتە:** نەخۆشی گەنج زوو لەبەین ئەچێ و نامێنێ.

**٨٣- نە دوورە و نە دیارە، ناوی کابەختیارە.**
○ نه دور است و نه پیدا، اسمش کاک بختیار است.
● بە یەکێکی بێ ناو و نیشان و بێ وجود ئەوترێ.

**۸۴ـ نه دەزگه بورگێ و نه دەرزییه بشکێ.**

○ نه ریسمان است که پاره شود و نه سوزن است که بشکند.

● به یه کێکی لەڕ و لاواز ئەوترێ.

**۸۵ـ نه دەم هاکردنم هەس، نه پای راکردن!**

○ نه دهان ها کردن دارم، نه پای در رفتن.

● **واته:** من له خۆما نابینم که بتوانم لەو کێشەدا هاوبەشی بکەم.

**۸۶ـ نه دینم هەس رەحمان بیوا و نه ماڵم هەس شەیتان بیوا.**

○ نه دین دارم رحمان ببرد، و نه مال دارم شیطان ببرد.

● **واته:** له دین و دنیا بێوەریم وهیچم نی‌یه له دەستی بدەم و بۆی داچەڵه کێم.

**یا ئەڵێن:** نه دینی هەس ... و نه ماڵی هەس ...

**۸۷ـ نەرمه بر و سفره درا!**

○ نرمه بُر است و سفره پاره کن.

● به یه کێکی زوان لووس و خۆ بەرۆبەر ئەوترێ که نەرمه نەرمه بۆ پێشەوه بێ و ئەوەی له سفرەدا بێ، بیخوا.

**۸۸ـ نه رێسیاگه و نه با دریاگه؛ جۆڵا شەقه شەقیەسی!**

○ نه ریسیده شده و نه تاب داده شده، جولاه از دستگاهش سر و صدا راه انداخته.

● به کەسێ ئەوترێ که هێشتا کارێ نه کرابێ، ئەو قوڵی لێ هەڵماڵیبێ.

**۸۹ـ نه ژن تەڵاق دریاگ و نه گای شاخ شکیاگ!**

○ نه زن طلاق داده شده و نه گاو شاخ شکسته.

● **واته:** ئەو دوو چته باوەڕیان پێ ناکرێ.

**۹۰ـ نه ژن نزیک له باوان، نه کونەی نزیک له ئاوان.**

○ نه زن نزدیک خانهٔ پدری، نه مشک نزدیک آب.

● **واته:** ژن ئەگەر ماڵی له نزیکی ماڵی باوکیەوه بێ، پەیتا پەیتا خۆی ئەکا به ماڵی باوکیا

وکونەی ئاویش ئەگەر لە نزیکی ئاوا بێ هەمیشە وشکەوکەس ئاوی تێ ناکا.
**یا ئەڵێن:** نە ژن نزیک لە باوان، نەگوێرە کە نزیک لە ئاوەدان.

**٩١- نە سەر پیازم و نە قنچک سیر.**
○ نە سر پیازم و نە ته سیر.
● **واتە:** من هیچ کارەم وکارێکم لە دەس نایە.
**یا ئەڵێن:** نە سەر سیر و نە قنچک پیاز.

**٩٢- نە سەر تربی و نە بن گەزەر.**
○ نە سر ترب هستی و نە ته زردک.
● **واتە:** تۆ چتێ نیت و حیسابت لە سەر ناکرێ.

**٩٣- نە سێخ بسووتێ، نە کەواو.**
○ نە سیخ بسوزد، نە کباب.
● **واتە:** لایەنی هەر دوو لە بەر چاو بگرە.

**٩٤- نە شەرع بە مەلا، نە عورف با ئاغە (خان).**
○ نە شرع بە ملاّ، نە عرف بە خان.
● **واتە:** مەلا لە شەرعا دەسی هەیە و ئاغەیش لە عورف و رەسمی رۆژا شارەزایە و تۆ لەو دوو بارەوە دەرەقەتی ئەوان نایی.

**٩٥- نە شێت بگێ، نە شێت بتگێ.**
○ نە تو بە دیوانە تجاوز کن، نە او بە تو تجاوز کند.
● **واتە:** لەگەڵ بنیادەمی شێت و نەفاما دەرمەکەوە.

**٩٦- نە شێت ژیر ئەوێ و نە حیز پیر ئەوێ!**
○ نە دیوانە عاقل میشود و نە هیز پیرمیشود.
● **واتە:** رەگی شێتی لە سەر مرۆڤی شێت دا هەر ئەمێنێتەوە و حیزیش چونکە مانای عەیبە نازانێ، پیری بەلایا نایە.

**۹۷ـ نەکردەکار، ناوا بار.**

○ نکرده کار، بار نمی‌برد.

● **واتە:** بنیادەمی تەمەڵ و نەتوانکار، هیچێکی لە دەست نایە.

**۹۸ـ نەکەرێ کەفتگە و نەکونەیەک دریاگە!**

○ نه خری سقط شده و نه مشکی سوراخ گشته.

● **واتە:** هیچ چتێ نەقەوماوە.

**۹۹ـ نەکەنین و نەگیریان، بە درۆ ناوێ.**

○ خنده و گریهٔ دروغکی ممکن نیست.

● **واتە:** پێ کەنین یاگیریانی درۆ،لە دڵەوە دەرنایە.

**۱۰۰ـ نەکەوش تەنگ، نە ماڵ پر لە جەنگ.**

○ نه کفش تنگ، نه خانهٔ پر از جنگ و دعوا.

تهی پای رفتن به از کفش تنگ بلای سفر به که در خانه‌جنگ

(سعدی)

● ماڵی پڕ لە شەڕ وەکو کەوشی تەنگ ئازار دەرە. کە وا بوو پای بێ پێڵاو لە کەوشی تەنگ و غەریبی لە ماڵی پڕ ئاژاوە باشترە.

**۱۰۱ـ نەگای شاخت شکیاوێ، نە ژنی تەڵاقت دریاوێ!**

○ نه گاو هستی که شاخت شکسته باشد، نه زن هستی که طلاقت داده باشند.

● **واتە:** بۆچی لە خۆتەوە نارەحەت و ئاڵۆزی، چیت لێ قەوماوە ؟

**۱۰۲ـ نەگبەت خوەی خاسە، قۆرتەکانی خراوە.**

○ نکبت خودش خوب است، پیچ و خم‌های آن بد است.

● **واتە:** شۆڵاوی بێ ئیقباڵی لەخۆی خراپترە.

**۱۰۳ـ نەگبەت وەختێ هات، دەڵەمە دیان ئەشکنێ!**

○ نکبت وقتی آمد، دَلَمه دندان می‌شکند.

● **واتە:** وەختێ کەسێ تووشی نەهات بێ، ژیانی ئاسایی‌شی لێ ئەبێ بە ژان.

**۱۰۴ـ نەگوڵ گەنمی دیگە و نە چەلچەڵەی ئاسیاو.**

○ نە گل گندم را دیدە و نە چغچغۀ آسیاب.

● بە کەسێکی گەنج ئەوترێ کە هێشتا سارد و گەرمی رۆژگاری نەچەشتبێ.

**۱۰۵ـ نەگەیگەسە ئاو، قول هەڵ ئەکا!**

○ بە آب نرسیدە، پاچەاش را بالا می‌کشد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە هیچ نەبوو، خۆی بۆ کارێ حازر کردبێ.

**یا ئەڵێن:** نەگەیگەسە ئاو، شواڵەکەی هەڵ کردگە (یا: قولی هەڵ کردگە)،نەگەیگەسە بگار، شواڵەکەی داکەند.

**۱۰۶ـ نەم خواردگە لەم ئاش وکاسە، تا دڵم بکا وەسواسە.**

○ از این آش و کاسە نخوردەام، تا دلم دچار وسوسە بشود.

● **واتە:** من دەستێکم لەو کارەدا نەبووە و ترسیشم نی‌یە.

**۱۰۷ـ نەم‌دیایەت دایکت، ئەمردم لە عەزرەت باوکت!**

○ اگر مادرت را نمی‌دیدم، از ترس پدرت می‌مردم.

● **واتە:** قسەی کوڕێکەو بە دڵخوازەکەی ئێژێ واتە: دایکت حەز ئەکا من و تۆ بە یەک بگەین، بەڵام باوکت توورەیە و لە وانەیە بم کوژێ.

**۱۰۸ـ نەوبەر بێسان، خەیار تاڵ!**

○ نوبر جالیز، خیار تلخ.

● بە کەسێکی تازە ئاشنا ئەوترێ کە لە سەرەتای ئاشنایەتی‌یەوە قسەی خراپ بێ بە دەمیا. یا بە چتێکی تازە پێک هاتوو ئەوترێ کە هەر لەو ئەوەڵەوە، خراپ نیشان بدا.

**۱۰۹ـ نەوس بگری مشتێکە، بەری بەی دەشتێکە.**

○ نفس را مهار کنی یک مشت است، رهایش کنی یک دشت است.

● **واتە:** بنیادەم ئەبێ بە سەر نەفسی خۆیا زاڵ بێ تا تووشی کۆسپی نەکا، چونکە نەفس هیچ وەخت تێر نابێ و ئەبێ بەری بگری.

**۱۱۰ـ نەو لەماڵیا مەرگە مووش، سمێڵی ئەیکرد لووشە لووش!**

○ در خانه‌اش مرگ موش پیدا نمی‌شد، سبیلش می‌لندید.

● بە یە کێکێ ئەوترێ کە لە ماڵیا هیچ چتێ پەیانەبێ و لە دەرەوە سمێڵی بـۆ بـابدا و لووشەی بێ.

**۱۱۱ـ نەیبی کورێکی بوو، کێر و گونی بری!**

○ شخص چیز ندیده دارای پسری شد، آلت تناسلی او را برید.

● بە یە کێکی چت نەدیو ئەوترێ کە چتێکی تازەی دەست کەوتبێ و بۆی جێگەی سەرنج بێ و دەستی تێ بباو نوقسانی بکا.

**۱۱۲ـ نیشانەی رۆژ لە بنە رۆژ دیارە.**

○ نشانۀ روز، از اول صبح پیداست.

● **واتە:** چۆنیەتی هەموو چتێ لەئەوڵەوە دیارە.

**یا ئەڵێن:** نەشەمەی رۆژ لە بنە رۆژ دیارە.

**۱۱۳ـ نێرە، بی‌دۆشە!**

○ نر است، بدوش.

● بە یە کێکی لامل ئەوترێ کە لە سەر قسەیە کی نە گونجاو پاواپگرێ.

**۱۱۴ـ لێرە کەر بە بارە تەنگسە و ئەگێ!**

○ نره الاّغ‌را با بار خار مورد تجاوز قرار می‌دهد.

● بە یە کێکی هەوەسباز و داوێن چەپەڵ ئەوترێ کە بە هیچەوە دانە کەوێ.

**۱۱۵ـ نێرە کەر بە گونا ئەناسێ!**

○ نرّه خر را با بیضه‌اش می‌شناسد.

● بە یە کێکی گەوج و کەم عەقڵ ئەوترێ.

**۱۱۶ـ لێرە کەر رەش چوو بۆ سەفەر، هاتەو بوو بە قاتر!**

○ نرّه‌خر سیاه به سفر رفت و برگشت و قاطر شد.

● بە تەوس ئەوترێ بە یە کێکی لە خۆ رازی کە چووبێ بۆ سەفەرێک و هاتبێتۆ و خۆی

لێ گۆڕابێ و وابزانێ بووە بە چتێ.

**۱۱۷ـ نێرەکەرێ ئەتۆپێ و هۆڵیکەرێ فال ئات!**

○ نرّه خری سقط می‌شود و کرّه خری را جفتگیری می‌دهد.

● بە کەسێک ئەوترێ کە چتێکی بەنرخی لە دەست دابێ و بە هیوای دوور و درێژی چتێکی تر بێ.

**۱۱۸ـ نێزە ئەوەڵ جێگەی بکەرەو، ئەو وەختە بیدزە!**

○ اول جای نیزه را جاسازی بکن، سپس آن را بدزد.

● **واتە:** ئەوەڵ بیر لە ئاکامی ئەو کارە بکەرۆ، ئانجا بیکە.

**۱۱۹ـ نیسک و نۆک و نوخەشەر، هێشتا نەوگی بە بەشەر!**

○ عدس و نخود و لپّه، هنوز آدم نشده‌ای.

● **واتە:** ئەو هەموو دەخڵ و دانەت خواردووە و هێشتا بەلای مرۆڤایەتیدا نە چوویت.

**۱۲۰ـ نیسکێنە، بسم‌اللّەی گەرەک نی‌یە.**

○ آش عدس، بسم‌اللّه نمی‌خواهد.

● **واتە:** بۆ چتی بێ نرخ، ناوی خوا نابرێ.

**۱۲۱ـ نیشانەی ئاو سەوزیە.**

○ نشانهٔ آب سبزی است.

● **واتە:** لە هەر لایەکا سەوزی ببێ، لەوێ ئاو هەیە.

**۱۲۲ـ نیشانەی تاریکەشەو هەر لە سەر ئێوارەوە دیارە.**

○ نشانهٔ شب تاریک از همان اوّل غروب پیداست.

● **واتە:** خراپی هەرکەسێ یا هەرکارێ، لە هەمان کاتی ئەوەڵدا دەرئەکەوێ.

**۱۲۳ـ نیشانەی مانگ سەر لە ئێوارە دیارە.**

○ نشانهٔ ماه از همان اوّل غروب پیداست.

● **واتە:** باشی هەرکارێ یا هەرکەسێ، لە هەمان کاتی ئەوەڵدا دەرئەکەوێ.

**۱۲۴ـ نی‌یه له ماڵیا شێو شه‌وێ، لووته‌وانه‌ی ته‌ڵای ئه‌وێ!**

○ شام شب در خانه‌اش نیست، گُل‌بینی طلائی می‌خواهد.

● به یه کێک ئه‌وترێ که بۆ شێوی شه‌و موحتاج بێ،به‌ڵام بیری به‌لای خشڵ و خاڵ بێ.

# ■ و

۱- **وارۆک هێلکه بکات، له وارۆکی ئه‌که‌فێت.**

○ جوجۀ بهاره تخم بگذارد، از جوجگی می‌افتد.

● **واته:** ئافره‌ت وه‌ختێ منالی بوو، ئه‌بێ به دایک و به‌ر پرسی ماڵ.

۲- **وام زانی ئه‌م گومه‌زه ئیمامزاده‌یه‌کی هاتیا!**

○ فکر کردم زیر این گنبد امام زاده‌ای هست.

● **واته:** وام زانی ئه‌م که‌سه چتێکی له ده‌س دێ، که‌چی وانی‌یه.

۳- **وتم چیت گه‌ره‌که؟ خورما یا کشمیش؟ وتی: خورمیش!**

○ گفتم چه می‌خواهی؟ خرما یا کشمش؟ گفت: خرمیش.

● **واته:** هه‌ر دووکیانم گه‌ره‌که. به‌که‌سێ ئه‌وترێ که نه‌توانێ له به‌ینی دوو چتا یه‌کێکیان هه‌ڵبژێرێ.

۴- **وتیان ئه‌ی شێت، بۆچه شێتی؟ وتی: بۆم ئه‌چه‌لێ.**

○ گفتند ای دیوانه، چرا دیوانه هستی؟ گفت: برایم می‌چلد.

● به یه‌کێک ئه‌وترێ که خۆی بدا له شێتی یا گه‌وجی، بۆ ئه‌وه‌ی هه‌رچی بکا، که‌س کاری پێوه نه‌بێ.

۵- **وتیان باڵوڵ زه‌ماوه‌نه، وتی: به من چه! وتیان: بۆ تۆ ژن تێرن، وتی: به تۆ چه!**

○ گفتند بهلول عروسی است، گفت: به من چه! گفتند عروسی تو است، گفت:

به تو چه!

● **واته:** له کارێکدا که پێوەندی به تۆوه نیيه دەخاڵەت مه که.

**۶ـ وتیان بالْوڵ ژن جوان شوو ئەکاته پیاگ پیر؟ وتی: بەڵێ بەوشەرته هاوسای جوانی بێت!**

○ گفتند بهلول آیا زن زیبا با مرد پیر ازدواج می‌کند؟ گفت: آری به شرطی که همسایهٔ جوان داشته باشد.

● **واته:** پیاوی پیر نابێ ژنی گەنج بخوازێ چونکه ژنه که هەر بیری ها به لای گەنجەوه.

**۷ـ وتیان بەراز، بۆچه رۆژ دەر ناکەفێ؟ وتی: لەبەر ئەوکارگەله که شەو کردگمه!**

○ به گُراز گفتند چرا در طول روز پیدایت نیست؟ گفت: به خاطر آن کارهایی که شب کرده‌ام.

● به کەسێ ئەوترێ که پێشینه یه کی باشی نەبێ و له رووی هەڵ نەیه بێته ناو مەردم.

**۸ـ وتیان بەراز هێلکه ئەکا. وتی: دەعبایه کی پیسه، کردی، کردی!**

○ گفتند گُراز تخم می‌گذارد. گفت: جانوری کثیف است، گذاشت، گذاشت.

● به یه کێکی زاڵم و پیس ئەوترێ که کاری نه گونجاو ونامومکین بکا.

**۹ـ وتیان به ران شوانه کەت بمرێ، وتی: خاوەنه که یشم بمرێ بێ ساحێو ناوم.**

○ به گلّهٔ گوسفندان گفتند چوپانت بمیرد، گفت صاحبم نیز بمیرد بی صاحب نمی‌مانم.

● **واته:** چتی به خێر و بەره کەت، هەموو کەس بۆ لای خۆی رائه کێشێ.

**۱۰ـ وتیان به رێوی شایەتت کێیه ؟ وتی: جوجکەم (کلکم)!**

○ به روباه گفتند شاهدت کیست ؟ گفت: دُمَمْ.

● به یه کێک ئەوترێ که کارێکی هەڵەی کردبێ و ئێستا بۆ بەرپەرچدانی هەڵه کەی، شایەت له قەوم و کەسی خوی بناسێنێ!

**۱۱ـ وتیان به کتک بۆچه گیان سەختی؟ وتی: نەتەوەی شێرم!**

○ به گربه گفتند چرا سخت جان هستی؟ گفت: از نژاد شیرم.

● به یه کێکی زیره ک ئەوترێ کە لە بنەماڵەیە کی زیره ک بێ.

**١٢ـ وتیان بە کتک گووت بۆ دەرمان ئەشێ، ئەچوو ئەیکردە ژێر خاکەو.**

○ به گربه گفتند عن تو خاصیت داروئی دارد، می‌رفت آن را زیر خاک پنهان می‌کرد.

● به یه کێکی بەخێڵ ئەوترێ کە حازر نەبێ هیچ خێرێکی بە کەس بگا.

**١٣ـ وتیان بە کیسەڵ برۆ بۆ زەماوەن، وتی: من نە دەم گۆشت خواردنم هەس و نە پای هەڵپەرکێ، پەس من‌تان بۆ کوچک کوانگ گەره کە!**

○ به لاک‌پشت گفتند برو عروسی، گفت: من نه دهان گوشت خوردن دارم و نه پای رقصیدن، پس مرا برای سنگ اجاق می‌خواهید.

● قسەی کەسێکە کە دەعوەت کردنی بۆ جێگەیە ک جێگەی مەترسی بێ.

**١٤ـ وتیان بە گورگ سۆزی نۆره رانته، دەسی کرد بە گیریان! وتیان بۆچە ئەگیری؟ وتی: ئەترسم ئەم خەوەر درۆ بێ!**

○ به گرگ گفتند فردا نوبت چوپانی توست، شروع کرد به گریه کردن، گفتند چرا گریه می‌کنی؟ گفت: می ترسم این خبر دروغ باشد.

● بە کەسێ ئەوترێ کە خەبەرێکی خۆشی دوور لە باوەڕی پێ بدەن کە ئەو تامەزرۆی بوو بێ.

**١٥ـ وتیان بە گوڵ چۆن ئەونە گەشی؟ وتی: باخەوانە کەم مەردە.**

○ به گل گفتند چه گونه است که این اندازه سرحال هستی؟ گفت: باغبانم مرد است.

● **واتە:** گەشە و شادمانی ماڵ‌ومناڵ لە سایەی سەری خاوەن‌ماڵەوە مومکین ئەبێ.

**١٦ـ وتیان بە هێسر باوکت کێیە؟ وتی: دایکم ماینە!**

○ از استر پرسیدند پدرت کیست؟ گفت: مادرم مادیان است.

● باوکی هێسر، کەرە؛ دایکی ماینە. جا ئەم مەسیلە بە کەسێ ئەوترێ کە لە ناو بردنی

باوکی شەرم بکا.

١٧ـ **وتیان ڕێوی چە خاسە؟ وتی: پێچەوکردن!**

○ بە روباە گفتند چە کاری خوب است؟ گفت: در رفتن.

● **واتە:** مرۆڤی زیرەک خۆی ناخاتە ناو دەردیسەرەوە.

١٨ـ **وتیان قرژانگ بۆچە بە دوو سەر ئەچی بە ڕێگا؟ وتی: جاهێڵی‌یە و چەم و خەم!**

○ گفتند خرچنگ چرا با دو سر راە می‌روی؟ گفت: جوانی است و چم و خم!

● بە یەکێکی قیت و هەرزەکار ئەوترێ کە کاری هەر هات و چووی دەروبان و ناو کۆڵانان بێ.

١٩ـ **وتیان قنگڵاشک مەسکەنت کوێنەس؟ وتی: با ئەزانێ!**

○ گفتند خاربُن مسکنت کجاست؟ گفت: باد می‌داند.

● بە یەکێکی ئاوارە و سەرگەردان ئەوترێ کە جێگە و ڕێگەیەکی مەعلوومی نەبێ و هەر وەختێ لە لایەک بێ.

٢٠ـ **وتیان کوێرە چەت گەرەکە؟ وتی: دوو چاو ساق.**

○ گفتند ای کور چە می‌خواهی؟ گفت: دو چشم سالم.

● وەختێ ئەوترێ کە کەسێ لە پڕ چتێکی دەس کەوێ کە تامەزرۆی بووبێ و ئەو دەس‌کەوتە بۆ ئەو زۆر جێگەی ناباوەڕی بێ.

٢١ـ **وتیان کەرەکوڵ دەعوەتی بۆ زەماوەن، وتی: کار من هەر بارکێشانە.**

○ گفتند خر دم بریدە بە عروسی دعوت شدەای، گفت: کار من بار کشیدن است.

● **واتە:** ئەو کەسەی وا ئەهلی زەحمەت و ڕەنج کێشانە، لە شایی و شیوەندا بەشی ئەو هەر زەحمەتە.

٢٢ـ **وتیان وشتر برات بووگە، وتی: بە من چە بار من هەر چل مەنە.**

○ گفتند شتر صاحب برادر شدەای، گفت: بە من چە بار من همان چهل من است.

● **واتە:** قەوم و کەس وەختێ بارێ لە سەر شانی مرۆڤ سووک نەکەنەوە، بوون و

نەبوونیان وەکوو یەکە.

**٢٣ـ وتیان وشتر بۆچە ملت درێژە؟ وتی: پێش بینی دوارۆژ ئەکەم!**

○ گفتند شتر چرا گردنت دراز است؟ گفت: آینده را پیش بینی می‌کنم.

● **واتە:** بیری دوا رۆژ لە هەر کارێکدا پێویستە.

**٢٤ـ وتی باوکم قێخایەک خاس بوو، وەلێ لیان نەئەژنەوت!**

○ گفت پدرم کدخدائی خوب بود ولی به حرفش گوش نمی‌کردند.

● **واتە:** پیاو چاکی لەگەڵ بەرپرس بوون و قسە لێ بیستن فەرقی زۆرە.

**٢٥ـ وتی گا زەرد، من قین و تۆ قین، بزانین ئاخری کاممان ئەپوەینەوا!**

○ گفت ای گاو زرد، من قهر و تو قهر، ببینیم عاقبت کدامما‌ن برنده می‌شویم!

● **واتە:** لە بەین قین کردنی دوو کەسا، ئەوەی هەژار بێ ئەیدۆڕێنێ.

**٢٦ـ ورچ لە کونای خوەیا دەنگ ناکا.**

○ خرس در لانهٔ خود به کسی حمله نمی‌کند.

● **واتە:** مرۆڤ ئەبێ لە ماڵی خۆیاکەمتر لە ورچ نەبێ و بۆ میوان رێز دانێ، ئەگەرچی خراپیشی پێ بێژێ.

**٢٧ـ وشتر بە بارە وگوم ئەوێ.**

○ شتر با بارش گُم می‌شود.

● بە جێگایەکی قەرەباڵغ ئەوترێ.

**٢٨ـ وشتر چەیە بە سەر عەلاقەبەنیەو ؟**

○ شتر چه کار دارد به علاقه‌بندی ؟

● **واتە:** هەر کارێ بە کەسێ سپێردراوە و لە غەیری ئەوەدا کارەکە خراپ ئەبێ.

**٢٩ـ وشتر لە خەیاڵێک و وشترەوان لە خەیاڵێ!**

○ شتر در خیالی و شتربان در خیالی.

● **واتە:** هەر کەس ها لە بیری کاری خۆیا.

**٣٠ـ وشتر و پلێکان ؟**

○ شتر و پلکان ؟

● **واته:** ئەو دوو چتە هیچ هۆیەکیان بە سەریەکەوە نی‌یە.

**٣١ـ وشتری گوم کردگە و بۆ هەوسارەکەی ئەگەڕێ!**

○ شتر گم کرده است و دنبال افسارش می‌گردد.

● بە یەکێکی عەقڵ سووك ئەوترێ کە چتێکی بە نرخی لە دەس‌دابێ و بۆ فەرعی ئەو چتە ئەسڵە بگەڕێ.

**٣٢ـ وڵات هەی هەیە و کۆسە بەڵمەریش.**

○ مملکت آشفته است و کوسه در فکر سامان دادن به ریش مصنوعی خود.

● بە کەسێکی بێ‌خەبەر ئەوترێ کە لە خراپترین حاڵەتدا کە بەڵایەك ڕووی‌دابێ لە میللەتێ، ئەو هەر لە بیری خۆیا بێ.

**٣٣ـ وڵاخ بە سەرا نەچێتە ماڵۆ، بە قنگا ئەیخەنە ماڵۆ!**

○ چهارپا با سر داخل طویله نرود، از جهت عکس هُل می‌دهند.

● **واته:** ئەو کارە ئەگەر بە مەیل و ڕەزا نەکرێ، بە زۆر پێی ئەکەن.

**٣٤ـ وەخت کل و کار ئەمان‌کەنە یار، وەخت چزو بز ئەمان کە نە دزا!**

○ وقت کار به دوستیمان می‌گیرند، وقت پخت و پز دزدمان می‌نامند.

● **واته:** تاکاریان پێمان بێ دۆستمانن؛هەرکەوتنە هەڵ گرتنی خێر و بێر لێمان دوور ئەکەونۆ و بەد ناویشمان ئەکەن.

**٣٥ـ وەختێ بەخت لار بێت، دەڵەمە دیان ئەشکنێت!**

○ وقتی بخت کج باشد، دلمه دندان می‌شکند.

● **واته:** بەخت ئەگەر هاوڕێ نەبوو، هەموو چتێ پێچەوانە ئەبێتۆ.

**٣٦ـ وەختێ دەس نادا نان و شلکێنە، شوکرکەو بیخوە حیمار خنکێنە.**

○ وقتی که نان روغنی دست نمی‌دهد، شکر کن و نان خشک خرخفه کن بخور.

● **واته:** وەختێ چتی باش دەست نادا، بەکەم قەناعەت بکە.

**۳۷- وەختێ روو بەیتەگەدا، ئەوێتە ساحێو ماڵ!**

○ اگر به گدا رو بدهی، صاحب خانه می‌شود.

● بەکەسێکی بێ نرخ ئەوترێ کە شیاوی رێز و ئێحتیرام نەبێ.

**۳۸- وەختێ ریش بوو بە ریشەو، ئەشێ شانەی بۆ هەڵگری.**

○ وقتی ریش درآمد، باید برای آن شانه برداری.

● **واتە:** وەختێ مروڤ کەوتە ناو موشکیلە و کارێکەوە ئەبێ خۆی دانێ بۆ بە ئەستۆ گرتنی زەحمەت و ئەرکی ئەو کارە.

**۳۹- وەختێ ناعیلاج بی، ئەشێ بە جوولەکە بێژی بە ریش موبارەکت قەسەم.**

○ وقتی ناچار شوی، باید به یهودی بگویی به ریش مبارکت قسم.

● **واتە:** ناعیلاجی مرۆڤ موحتاجی کەس وناکەس ئەکا.

**۴۰- وەرزێر مانگ و ساحێوکار نارازی!**

○ کارگر خسته و صاحب کار ناراضی.

● بەکەسێ ئەوترێ کە هەر سوودی خۆی لە بەرچاو بێ و رەنج و عەزیەتی کەسی بە لاوەگرینگ نەبێ.

**۴۱- وەسە ئاسیاو ئاوکەفتگ.**

○ مثل آسیاب آب افتاده است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە بە هۆی رووداوێکەوە لە پڕ بێ دەنگ بووبێ.

**۴۲- وەسە بەچکەم پێ‌گەیکە تێر زک خوەمم نەخواردگە!**

○ از وقتی که بچّه‌ام به مرحلۀ خوردن رسیده، خودم سیر نشده‌ام.

● قسەی ئەو باوک و دایکەیە، کە هەرچی خواردەمەنی‌یان دەس‌کەوێ لە خۆیانی بگرنەوەو بیدەن بە مناڵەکانیان.

**۴۳- وەسە پەنج رۆژەی تار، لە سەر هیچ حەساوێ نی‌یە.**

○ مثل پنج روزۀ تار است، جزو هیچ حسابی نیست.

● پەنج رۆژەی تار، حەسابی رۆژ و مانگ ژمێری کۆنەکە بەو حیسابە هەر مانگ ۳۰

رۆژ بوو وە هەر ساڵ ئەبوو بە ۳٦٠ رۆژ و پێنج رۆژی دوایی زیادی ئەهات و نە لە سەر ساڵی کۆن بوو، نە لە سەر ساڵی تازەو بەو پێنج رۆژەیان ئەوت پەنج رۆژەی تار.
جا دوای ئەوە حەکیم عومەر خەییامی نیشابوری لە قەرنی ۵ی هـجریدا (۴۳۹ - ۵۱۷هـ) تەقویمی جەلالی بە ناوی جەلال الدّینی مەلەکشای سەلجوقی‌یەوە دروس کرد و بە پێی حیسابی خەییام، ٦ مانگی ئەوەڵی ساڵ بووبە هەر مانگ ۳۱ رۆژ و ۵ مانگی دوایی بووبە هەر مانگ ۳ رۆژ و مانگی ئاخری ساڵیش واتە «رەشەمە» یا «اسفند»ی فارسی بووبە ۲۹ رۆژ و هەر چوار ساڵ جارێ لەو وردە دەقیقە و سەعاتانە کە زیادی دێ،رەشەمە ئەبێ بە ۳ رۆژ. وە ئەو ساڵە کە رەشەمە (اسفند) ۳ رۆژە، پێی ئێژن ساڵی « کەبیسە».
« کەبیسە» لە « کەبس» گیراوە، واتە: پڕ کردنەوەی چاڵ لە خۆڵ، جا یانێ بەو دەقیقە و سەعاتانە چاڵی ساڵە کە پڕ ئەکەنۆو رەشەمە (اسفند) لە ساڵی کەبیسەدا ئەبێ بە ۳٠ رۆژ.
ئێستا لەسەر ئەو باوەڕی قەدیمە بە کەسێ کە لە سەر هیچ حیسابێ نەبێ ئێژن :وەسە پەنج رۆژەی تار.

۴۴- **وەسە تانجی‌یەکەی قورووک، لە وەخت راواگووی تێ!**
○ مثل تازی قروک است، به هنگام شکار عَنَش می‌گیرد.
● بە یەکێکی وەخت نەناس ئەوترێ.

۴۵- **وەسە تر بن گۆم!**
○ به گوز ته ژرف آب می‌ماند.
● بە دەنگێکی گوم ئەوترێ.

۴٦- **وەسە ترێشتە، هەر بەرەو خوەی ئەی‌تاشێ.**
○ به تیشه شبیه است، به طرف خودش می‌تراشد.
● **واتە:** هەر واله بیری سوودی خۆیا.

۴۷- **وەسە تەڵای ناو خاک.**
○ به طلای خاکی می‌ماند.
● **واتە:** زۆر بەنرخە.

**٤٨- وەسە دەوڵ بان ملە.**

○ بە دهل بالای گردنە می‌ماند.

● بە یە کێکی دەم نەوێساو ئەوترێ کە هەر ئەونە خەبەرێکی دەس کەوێ، فوو بکا بە سوڕنادا و هەموو کەسی تێ گەیەنێ.

**٤٩- وەسە سایلەی ساردۆ بووگ.**

○ بە کاچی سرد شدە می‌ماند.

● بە یە کێکی بێ تام ئەوترێ.

**٥٠- وەسە سپێی گەنم، بیخەرە قورگ ئاسیاوا، ساق تێتە دەرۆا**

○ بە شپش گندم می‌ماند، بیندازش گلوی آسیاب، سالم بیرون می‌آید.

● بە یە کێکی گیان سەخت و بێ عار ئەوترێ کە بە هیچ چەشنێ لە روو نەچێ. وە هەر چی دەری‌کەی هەر بێتۆ.

**٥١- وەسە ڤالۆرەی پایز بابردگ!**

○ مثل خار ساق باد بردۀ پاییز است.

● بە یە کێکی لاواز و نەخۆش و ئاوارە ئەوترێ.

**٥٢- وەسە کتک، حەفت گیانی هەس!**

○ مثل گربە هفت جان دارد.

● بە یە کێکی گیان سەخت ئەوترێ.

**٥٣- وەسە کفتەی بەرکوڵ.**

○ مثل کوفتۀ پیش پخت است.

● بە منالێ یابە یە کێکی خۆشەویس ئەوترێ.

**٥٤- وەسە کۆتەڵ قەناری.**

○ بە کُتل گندم قناری شبیە است.

● **واتە:** هەر خێر ئەداتۆ.

**قەناری:** نەوعێ گەنمە وە کوو گەنمە بەهارە کە هەرچی کۆتەڵە کەی بکوتی، هەر گەنمی

پێوەبێ.

**٥٥ـ وەسە کورد دۆنەدیک!**

○ بە کُرد دوغ ندیده می‌ماند.

● **واتە:** بۆ ئەو چتە زۆر تامەزرۆیە.

**٥٦ـ وەسە کوردەکەی لە هەر دوو جەژن بووگ!**

○ بە کُرد از هر دو عید محروم، می‌ماند.

● **واتە:** هەم لەم‌لا بووە و هەم لەو لایش.

ـحیکایەتی ئەوکوردەیەکە لەم دێ هەڵسا چوو بۆ ئەو دێیەکەی تر جەژن بکا، گەیشتە ئەوێ، جەژنیان تەواوکردبوو تا هاتۆ بۆ ئەم لا، ئەمانیش جەژنیان کردبوو.

**٥٧ـ وەسە کەر دێزگ، حەز ئەکا بە تۆپین خوەی و زەرەر خاوەنەکەی!**

○ بە خر دیز می‌ماند، بە سقط شدن خود راضی است بە شرطی کە صاحبش دچار ضرر شود.

● بە یەکێکی قۆشمە ئەوترێ کە تەنانەت بە مەرگی خۆی رازی بێ، بەو شەرتە بە مەرگی ئەو زەرەر لە کەسێکی تر بکەوێ.

**٥٨ـ وەسە کەر ناو جۆگەلە.**

○ بە خر وسط جوی شبیە است.

● **واتە:** وەکوو کەری ناو جۆگەلە، لە هە دوو لا ئەخوا.

**٥٩ـ وەسە کەڵەشێر ناوەخت.**

○ بە خروس ناوقت می‌ماند.

● بە یەکێکی وەخت نەناس ئەوترێ کە قسەی بێ جێگە بکا.

**٦٠ـ وەسە گاکەی مامۆ حاجی، لە گێرەی خوەیانا ئەخەوێ و لە گێرەی مەردما سەرپەرە!**

○ مثل گاو عمو حاجی است، در خرمن کوبی خودشان می‌خوابد و در خرمن کوبی مردم سر دستۀ گاوها است.

● بە یەکێک ئەوتری کە کاری ماڵی خۆیان نەکا، بەڵام بۆ کاری مەردم ئازا بێ.

٦١ـ **وەسە گوو، هەتا چیلکەی تێخەی، هەر بۆ ئەداتەو.**

○ بە گُه شبیه است، هرچه آن را به هم بزنی بو می‌دهد.

● بە کارێک یا قسەیەکی خراپ ئەوترێ کە هەرچی لە سەری بڕۆی خراپتری لێ هەڵسێ.

٦٢ـ **وەسە ماربێ ئیجازە.**

○ بە مار رام نانشدنی می‌ماند.

● بە یەکێکی یاخی و دەس‌نەپارێز ئەوترێ.

٦٣ـ **وەسە مامر ئاسیاوان.**

○ بە مرغ آسیابان می‌ماند.

● بە یەکێکی بێ‌شەرم و روودار ئەوترێ کە هەرچی دەری‌کەن، دەس‌هەڵگر نەبێ و هەر بێتۆ.

٦٤ـ **وەسە مانگا زەرد، شیر ئەدات و لەقەیەکی لێ ئەدات و ئەیرژنێ.**

○ بە مادّه گاو زرد شبیه است، شیر می‌دهد و لگدی می‌زند و آن را می‌ریزد.

● بە یەکێک ئەوترێ خێرێ بدات و بە دەستی خۆیشی لەبەینی ببا.

٦٥ـ **وەسە نۆک لای رێگە.**

○ بە نخود کنار جاده می‌ماند.

● **واتە:** وەکو نۆکی لای رێگە وایە، هەرکەس هەڵ‌ئەسێ، دەستێکی بۆ ئەبا و دەمێکی لێ ئەدا.

٦٦ـ **وەسە نیسک، بەرو پشتی بۆ نی‌یە.**

○ مثل عدس است، پشت و رویش یکسان است.

● بە کەسێکی دوو روو، ئەوترێ.

٦٧ـ **وەک پیرەژن دۆ رژیاگ، هەر بۆڵەی تێ.**

○ مثل پیرزنی که دوغش ریخته باشد، هی غرولند می‌کند.
● به یه‌کێکی نق و نۆقکەر ئەوترێ.

۶۸ـ **وەک دایک وەوی سەر جەنجاڵە.**
○ مثل مادر عروس، سرش شلوغ است.
● دایکی بووک چونکه کچ ئەدا به شوو سەری جەنجاڵە.

۶۹ـ **وەک کاسەی چەور هیچێ ناگرێتە خوەی.**
○ مانند کاسهٔ چرب هیچ چیز به خود نمی‌گیرد.
● به یه‌کێکی بێ‌حەیا ئەوترێ که هیچ قسەیه‌کی خراپی پێ عەیب نەبێ و بیساوێ به خۆیا.

۷۰ـ **وەک کەو سەر ئەکاتە ژێر بەفرا، وا ئەزانێ کەس پێ نازانێ!**
○ مثل کبک سر به زیر برف فرو می‌برد و فکر می‌کند کسی او را نمی‌بیند.
● به یه‌کێک ئەوترێ هەڵەیه‌ک بکا و خۆی بدا له گێلی‌و وابزانێ کەس بەو هەڵەیه نازانێ.

۷۱ـ **وەمە گولۆڵە موو، ماڵ باوکم ئەم‌داتە شوو!**
○ مثل گلوله‌ی مو هستم، ثروت پدرم مرا شوهر می‌دهد.
● ئەمە قسەی قەیرە کچێکە وا به سەروەتی باوکی دڵی خۆشە بیدا به شوو.

۷۲ـ **وەنە سەگ و سەرگوێلک.**
○ مثل سگ و سرگین‌گاه‌اند.
● به دوو کەسی بێ‌نرخ ئەوترێ که هەمیشە پێکەوە بن.

۷۳ـ **وەنە سیر و مار.**
○ چون سیر و ماراند.
● **واتە:** خۆشیان له‌یه‌ک نایە.

۷۴ـ **وەنە کارد و پەنێر.**

○ مثل کارد و پنیراند.

● **واتە:** ئەو دوو کەسە زۆر بەینیان ناخۆشە.

**٧٥ـ وەوی گەییە ناو دالان، خەسوو وەک ورچ ئەی‌نالان!**

○ عروس به دالان خانه رسید، مادر شوهر مثل خرس می‌نالید.

● **واتە:** خەسوو لە هاتنی بووک نارەحەتە.

**٧٦ـ وەوی لە تەک تۆمە، خەسوو بژنەوە!**

○ عروس روی سخنم با تُست، مادر شوهر بشنو.

● لە گەڵ کەسێکدا قسە بکەن و مەبەست ئەوە بێ یەکێکی تر تێ بگەیەنن.

**٧٧ـ وەوی لە ماڵ خەزوورانا ئەشێ چل کوا خوا بخوات.**

○ عروس در خانهٔ پدر داماد باید چهل توده نمک بخورد.

● **واتە:** بووک ئەبێ لە ماڵی خەزوورانا تەحەممولی ببێ.

**٧٨ـ وەوی یەک‌مان هاورد بێ بار و بنە، کوتەکی هەڵگرتگە ئێژێ ماڵ منە!**

○ عروسی بدون بار و بنه آورده‌ایم، کتک برداشته و می‌گوید مال من است.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە دوورۆ هاتبێ و هیچی نەبووبێ و ئێستالەو جێگادا دەعیەی هەموو چتێ بکا.

**٧٩ـ وەوی یەکە دەنگی نی‌یە، ئەو هاو رەنگی نی‌یە!**

○ عروس صدائی ندارد، او هم رنگ ندارد.

● بە کەسێ ئەوترێ کە لە ناو کۆمەڵێکدا گیری کردبێ و هاودەنگی نەبێ و کش و مات دانیشتبێ.

**٨٠ـ وەوی یەکەی تەپڵە کۆنە! ئەمە ئەوەڵتە، ئاخرت چۆنە ؟**

○ عروس کلاه به سر! این اوّل کار توست تا آخر کارت چگونه باشد ؟

● بە بووکێکی نەتوان کار و خاو و خلیچک ئەوترێ.

تەپڵەک: تاس‌کڵاوی ژنانە. / تەپڵە کۆن: تاس‌کڵاوی کۆن.

**٨١- وەوی یەکەی ماڵ مەتی، سەروپا پەتی!**

○ عروس درآمده از خانۀ عمّه، سر و پا برهنه.

● **واتە:** مەتی (میمک، پوور، خوشکی باوک یا خوشکی دایک) بووکێکی بە سەر و پای پەتی رێخستووە.

**٨٢- وەیتە کەو خۆ خوەر، ئەدەیتە کوشت نەفەر نەفەر!**

○ به کبک خود خور می‌مانی، همقطاران را یکی‌یکی به کشتن می‌دهی.

● **واتە:** هەر وا کە کەوی ناوقەفەس ئەبەن بۆ راو و لە کێوا ئەخوێنێ و کەوی کێوی بە دەنگییەوە دێ و ئەکەوێتە ناوی داوەکە یا ئەیکوژن، تۆیش بووگی بەو کەوە بەندی‌یەوە،هاوزمان و هاو ولاتی‌یەکانی خۆت ئەخەیتە داوی دوژمنی میللەتەکەت بۆ ئەوەی خۆت چەن رۆژێ زیاتر بەڵام بە سەرشۆڕی بژیت.

## ■ هـ

١- **ها بێ و هوو بێ، ناوی شوو بێ!**

○ ها باشد یا هو باشد، نامش شوی باشد.

● **واته:** هەرچی بێ هەر شوو بێ.

٢- **هات چاوی برەشێ، کوێری کردا**

○ آمد چشمش را سرمه بکشد، کورش کرد.

● **واته:** هات کارێکی باش بکا، خراپتری کرد.

**یا ئەڵێن:** هات لووتی بسڕێ، چاوی دەرهاورد.

٣- **هاتم سەواو بکەم، کەواو بووم!**

○ آمدم ثواب کنم، کباب شدم.

● **واته:** هاتم خاسی بکەم، خراپیش بووم.

٤- **هازاگۆ و هازا مەیان!**

○ این گوی و این میدان.

● **واته:** ئەگەر دەعیەیەکت هەیە فەرموو خۆت نیشان بدە.

**٥- هازی چەس تا بازی چە بێت ؟**

○ توان و نیرویش چقدر است تا پریدنش چە باشد ؟

● بە کەسێکی بێ وجوود و بێ نرخ ئەوترێ،کە چارەڕێنەکرێ بتوانێ کارێ بکا.

**٦- هالاوێ خوەشترە لە پلاوێ.**

○ حرارتی از پلو خوشتر است.

● **واتە:** لە زمیساناگەرمای ئاگر لە هەموو چتێ خۆشترە.

**٧- هالە ئەروانێ بە هەنگورا و مەزە ئەگرێ.**

○ غورە بە انگور می‌نگرد و مزّە می‌گیرد.

● **واتە:** شەخسي بەدخۆ لە ئینسانی خۆش خۆ دەرس ئەگرێ و باش ئەبێ.

**٨- هالە رۆیی هەنگور ما، روو رەشي بۆ باخەوان ما.**

○ غورە رفت و انگور باقي ماند، روسیاهي براي باغبان ماند.

● **واتە:** قۆرە تەواو بوو، هەنگور پێ گەیشت و باخەوان ئەبێ گۆشتي خۆي تاڵ بکا و لە باخ پارێزداری بکا.

**٩- هاوساگان بکەن یاري، تا من بکەم شووداري!**

○ همسایەها یاری کنند، تا من شوهرداري کنم.

● قسەی ئافرەتێکە و داواي یارمەتی ئەکا بۆ شووەکەي تا ئەویش بتوانێ ماڵداري بۆ بکا.

**یا ئەڵێن:** هەموو تان بکەن یاری تا من بکەم ماڵداری.

**١٠- هاوسا لە هاوسا ئەگرێ سەراسا.**

○ همسایە از همسایە سردرد می‌گیرد.

● **واتە:** هاوسێ لە هاوسێی خراپ تووشی دەردی‌سەر ئەبێ.

**۱۱ـ هاوسای خاسم بوێ، کەنیشکم شوو ئەکا.**

○ همسایه خوب داشته باشم، دخترم شوهر می‌کند.

● **واته:** هاوسای باش، خراپی هاوسای خۆی نایەژێ.

**۱۲ـ هاوسای نزیک لە برای دوور خاسترە.**

○ همسایه نزدیک از برادر دور بهتر است.

● **واته:** هاوسای نزیك لە تەنگانەدا زووتر لە قەوم و کەسی دوور، دێ بە هـاواری مرۆڤەوە.

**۱۳ـ هۆ بکەی لە کێف، جواوت ئەداتەو.**

○ در کوه هو بکنی جوابت می‌دهد.

● **واته:** ئەم دنیا هەروەکوو کێوە و عەمەلی ئێمەیش وەکوو ئەو دەنگەیە والە کێو سەری ئەدەین، چی بێژین هەر ئەوە ئەبیستین؛ چی بکەین هەر عەینی ئەوە لەگەڵمانا ئەکرێ.

**۱۴ـ هۆرمان خواردگە و هەوانەمان ماگە.**

○ مُحتوای جوال را خورده‌ایم و انبانه باقی مانده است.

● **واته:** زۆرتری پاشەکەوتەکەمان خواردووە و کەمی ماوەتەوە.

**۱۵ـ هۆش ماڵ خوەت بێت و سەگ هاوسا ماڵ بە دز مەکە.**

○ از مال خودت مواظبت بکن و سگ همسایه رابه دزدی متّهم مکن.

● **واته:** ئەگەر تۆ هۆشت بە ماڵی خۆتەوە بێ، ئیتر پێویست ناکا، بە سەر خەڵکدا بچیت و ئاژاوە بۆ خۆت سازکەیت.

**۱۶ـ هۆ هۆی هەس و کۆکۆی نی‌یە.**

○ هو هو دارد و کوکو ندارد.

● بە یەکێك ئەوترێ کە هەر قسەی ببێ و عەمەلی نەبێ.

**۱۷ـ هەپاسە! لە دیواخانان چ باسە ؟**

○ عباس! از خانه‌های اعیان چه خبر؟

● بە تەوس بە یەکێکی پاسووتاو ئەوترێ کە سەر بکا بە هەرچی ماڵدا.

**١٨ـ هەتا جۆزەردان، سەد پاشاگەردان.**

○ تا فرارسیدن فصل درو، صد پادشاه جابەجا می‌شود.

● **واتە:** کێ ئەزانێ تا کاتێکی تر چی پێش دێ‌و دنیاتووشی چ تاڵ‌وگۆڕێ ئەبێ ؟

**١٩ـ هەتا چەرمەکە سەگ نەیخواردگە.**

○ تا چرم را سگ نخورده است.

● **واتە:** تاکار لەکار نەترازاوە، دەس‌بەکار بەو بەری ئەو مەترسی‌یە بگرە.

**٢٠ـ هەتیم ئەگیریا بۆ بەشی کەم بوو، ئەویشە سەگە رەش بردی و لە دەس چوو.**

○ یتیم گریه می‌کرد زیرا سهمش کم بود،آن راهم سگ سـیاه ربـود و از دست رفت.

● **واتە:** چاوچنۆکی ئەبێ بە هۆی لەبین چوونی ئەوەیش وا هەیە.

**٢١ـ هەر ئەنگووسێ بورگێ، خوێن خوەی لێ‌تێت.**

○ هر انگشتی بریده شود، خون آن انگشت می‌ریزد.

● **واتە:** هەرکەس لە بارێکەوە تووشی دەرد و زەرەرێ ببێ، ئەو دەردە ئێشی تایبەتی خۆی هەیە. وەکوو ئەوەی کە منالێ بمرێ،بۆباوک‌و دایکی ئێشێکی تـایبەتی هـەیە ئەگەرچی بیست منالی تریشیان ببێ.

**٢٢ـ هەر ئەوەسە لە بەریا، لە ماڵەو هەرگ ئەکاتە سەریا!**

○ همان است که به تن دارد، در خانه گِل بر سر خود می‌ریزد.

● بە یەکێکی دەس‌تەنگ و هەژار ئەوترێ کە لە ماڵەوە هیچی نەبێ و لە دەرەوە بە زللە روومەتی خۆی سوور بکاتەوە.

**٢٣ـ هەر بۆ لای خوەی ئەیتاشێ!**

○ هی به سوی خودش می‌تراشد.

● **واتە:** هەر سوودی خۆی لەبەرچاو ئەگرێ.

**٢٤- هەر بەرەوخوارە، بەرەوژوورەیەکی هەس.**

○ هر سرازیری، سربالایی دارد.

● **واتە:** هەر شکستێ، سەرکەوتنێ هابە شوێنیەوە.

**٢٥- هەر بەرزەوبوونێک، نزمەوبوونێک هابە شۆنیەو.**

○ هر ترّقی، تنزّلی در پی دارد.

● **واتە:** بە سەرکەوتنی خۆت، بایی هەوا مەبە و بیری نوکوولی دوا رۆژ بکەرۆ.

**٢٦- هەر بەرەوژوورە، بەرەوخوارەیەکی هەس.**

○ هر سربالائی، سرازیریی دارد.

● **واتە:** هەر سەرکەوتنێ، شکستێ هابە شوێنیەوە.

**٢٧- هەر پەنج قامک (ئەنگووس) وەک یەک نین.**

○ هر پنج انگشت مثل هم نیستند.

● **واتە:** هەموو کەس وەکوو یەک نین و نابێ لە هەموو کەس وەکوو یەک چاوەڕوانی بکرێ.

**٢٨- هەرچەرم ئەدات لە زاخ و زاخ ئەدات لە چەرم.**

○ هی چرم به زاج می‌زند و زاج به چرم.

● بە یەکێک ئەوترێ کە لە کارێکدا هەر ئەم‌دەس و ئەودەس بکا.

**٢٩- هەرچەن بارم لارە، وەلێ بیرم راسە.**

○ هر چند بارم کج است، ولی اندیشه‌ام درست است.

● **واتە:** ئەگەرچی هەژار و دەست تەنگم، بەڵام تێبینی و عەقڵم هەیە.

**٣٠- هەرچەن پیرە، هەر کۆنە بەگیرە.**

○ هر چند پیر است، باز هم کهنه دوام دارد.

● **واتە:** ئەم چتە ئەگەرچی کۆنەیە، بەڵام لە چتە تازە کە بە دەوام‌ترە.

**٣١- هەرچی ئەخوەی بە شەو تاریک، رەنگت زەردە و قولت باریک!**

○ هر چه در شب تاریک می‌خوری، بازهم رنگت زرد است و پاهایت باریک.
● **واته:** هەرچی بە خۆتا ئەگەیت، هیچ سوودی نی‌یە و چاخ نابیتۆ.
یا: زۆر خواردنی شەو باش نی‌یە.

**٣٢- هەرچی بکێڵی، هەر ئەوە درەو ئەکەی.**
○ هر چه بکاری، همان را درو می‌کنی.
● **واته:** هەر چۆن لەگەڵ مەردما رەفتار بکەی هەروا لەگەڵتا رەفتار ئەکەن.

**٣٣- هەرچی تازەس پەسەن خەڵکە!**
○ هر چه تازه است پسند مردم است.
● **واته:** هەرچی باشە بە ناوی خەڵکەوە تەواوی ئەکەن.

**٣٤- هەرچیت بۆم نارد بە کاسە، ئەمجار بیکە پشت کاسە!**
○ هر چه در کاسه برایم فرستادی، این بار برپشت کاسه بریز.
● **واته:** هەر پیاوەتی‌یەکت تا ئێستا لەگەڵم کردووە، لەمەوبەدوا مەیکە. مانای ئەوەیە هیچ خاسی‌یەکت لەگەڵ من نەکردووە.

**٣٥- هەرچی چتە فەرزە، شایی و شیوەن قەرزە.**
○ همه چیز فرض است، شادی و شیون قرض است.
● **واته:** هەموو چتێ بە جێگەی خۆی گرینگ و بەرچاوە، بەڵام شایی و شیوەن وەکوو قەرز ئەکەوێتە سەرشانی مرۆڤ و ئەبێ بیداتەوە.

**٣٦- هەرچی چتە لە باریکیا ئەورگێت، بەڵام زوڵم لە قەویەتیا.**
○ همه چیز اگر نازک شود، پاره می‌شود؛ اما ظلم اگر قوی شود، پاره خواهد شد.
● **واته:** زاڵم با هەر زوڵم بکا تا پێوانەکەی پڕ ئەبێ،ئەو وەختە قڵم ئەبێتەوە.

**٣٧- هەرچی چەقەو ناکولێ، بیەنە باجی ماکولێ!**
○ هرچه رگ و پی است و نمی‌پزد، به باجی ماکولی بدهید.
● بە تەوس یەکێ سەبارەت بە خۆی ئێژێ، کاتێ کە هەرچی چتی خراپە بیدەن بەو.
واته: هەرچی خراپە بۆ ئەبێ بیدەن بە من؟

**٣٨ـ هەرچی راوێژ بکەی، ئەوێتە کاوێژ!**

○ هرچه تدبیر بکنی، نشخوار تلّقی می‌شود.

● **واتە:** هەرچی تەدبیر بکەی، قسەی بێ‌جێگە بە حیساب دێ.

**٣٩ـ هەرچی کرژت ئەکەمەو، هەر خاوی.**

○ هر چه می‌خواهم پختەات بکنم، باز هم خام هستی.

● **واتە:** هەرچی هەوڵ ئەدەم باش بی، هەر خراپ ئەبی.

**٤٠ـ هەرچێکم رێست بووبە خوری!**

○ هرچه رشتم، پشم شد.

● **واتە:** هەرچی زەحمەتم کێشابوو، بە هیچ دەرچوو.

**٤١ـ هەرچی کەسە عەرز نەرمی پێ ئەکێڵگێ.**

○ هر کس می‌تواند زمین نرم را شخم بزند.

● **واتە:** کاری ئاسان بۆ هەموو کەس ئەنجام ئەدرێ، گرینگ ئەوەیە کەسێ کاری سەخت بەئەستۆ بگرێ و ئەنجامی بدا.

**٤٢ـ هەرچی گا بیکا، گا نایخوا.**

○ هر چه گاو به عمل بیاورد، گاو نمی‌خورد.

● **واتە:** دەسڕەنجی کەسێک هەر خۆی نایخوا، بەڵکوو کەسانی تریش لەو دەسڕەنجە بەهرە ئەگرن. وەکوو باوک و دایک کە بۆئاسایشی منالّەکانیان زەحمەت ئەکێشن.

**یا ئەڵێن:** هەرچی گا بیکێڵێ گا نایخوا.

**٤٣ـ هەرچی گەنە بۆ فەقێ حەسەنە!**

○ هرچه گند است برای فقی حسن است

● **واتە:** چتە خراپەکان ئەبێ هەر نەسیبی یەکێکی تایبەت بێ!

**٤٤ـ هەرچی لە کاسا بێت، بە کەوچک دەرتێت.**

○ هر چه در کاسه باشد، با قاشق درمی‌آید.

● **واتە:** تۆبەهەر زوانێ لە گەڵ خەڵکدا قسە بکەی ـ خاس یا خراپ ـ هەروا لە گەڵتا

قسه ئه کەن.

**یا ئەڵێن:** هەرچی لە دێزا، بێت بە کەوچک دەرتێت.

۴۵ـ **هەرچی لە مشکە، هەوانە درینە!**

○ هرچه از موش است، انبان سوراخ می‌کند.

● **واتە:** لە کەسێکی ناوەجاخ و بەدخۆ، هەر کرداری خراپ چاوەڕێ ئە کرێ.

**یا ئەڵێن:** هەرچی لە مشکە جەواڵ ئەدڕێت.

۴۶ـ **هەرچی مرۆچە بە ساڵی جەمی کرد، وشتر بە قەپێ خواردی!**

○ هرچه مورچه در یک سال جمع کرد، شتر با یک لقمه خورد.

● **واتە:** ئاکامی زەحمەتی عومرێکی مرۆڤی هەژار، لە لایەن زاڵمەوە بە کاتێ لەبەین ئەچێ.

۴۷ـ **هەرچییەکت هەس مەیخەرە کەشتییەک.**

○ هر چه داری در یک کشتی قرار مده.

● **واتە:** هەموو سەروەتە کەت لە کەسێکدا بە کار مەبە، نەوەک لەو کەسبەدا تووشی زەرەر ببی و هیچت بۆ نەمێنێتۆ، بەڵکوو بیخەرە چەن کەسبەوە،ئەم نەیگرت ئەو.

۴۸ـ **هەر حەق کفن بگەیەت بە من، مردگ گۆربەگۆر!**

○ پول کفن به من برسد، مرده گوربه گور.

● **واتە:** هەرکەس هالە بیری سوودی خۆیا.

۴۹ـ **هەر خوا، خواس و دنیا کاس.**

○ خدا، خدااست و دنیا کاه است.

● **واتە:** هەر خوا پایەدارە و دنیا ناپایەدار.

۵۰ـ **هەر دارێ سەمەری فرە بێ، سەری هالە خوارۆ.**

○ هر درختی پُر ثمر باشد، سرش روبه پایین است.

● **واتە:** مرۆڤی زانا و ژیر، خاکەسار و خۆکەم بینە.

**٥١- هەر دارێ نەرم بێ کرم ئەیخوا.**

○ هر درختی نرم باشد، کرم آن را می‌خورد.

● **واتە:** ئەگەر مرۆڤ زیاتر لە ئەندازە، خۆش ئەخلاق بێ، سوار سەری ئەبن.

**٥٢- هەر دۆڵێکیان بە بایەک سپاردگە.**

○ هر دره‌ای را به بادی سپرده‌اند.

● **واتە:** هەرکەس ئەبێ بەرپرسی کارێ بێ کە لەو کارەدا شارەزایە.

**٥٣- هەر دوو پای کردگەسە ناو کەوشێکا!**

○ هر دو پایش را در یک لنگه کفش فروکرده است.

● **واتە:** لە سەر ئەو قسە یا ئەو کارە سوور وێستاوە.

**٥٤- هەر دەردێ، دەوایەکی هەس.**

○ هر دردی دارویی دارد.

● **واتە:** هەر کارەساتێکی خراپ، رێگە چارەیەکی تایبەتی خۆی هەیە.

**٥٥- هەر دەوەنێ ئەوێ بە دار.**

○ هر بُتّه‌ای درخت می‌شود.

● **واتە:** هەر منالێ گەورە ئەبێ.

**٥٦- هەر دیانێکی بە ساڵێ دەرهاتگە!**

○ هر دندانش به یک سال درآمده است.

● بە بەکێکی رژد و ماڵ خۆ نەخۆر ئەوترێ.

**٥٧- هەر رۆژ با و بۆرانە، کەچەڵ سەرە شۆرانە!**

○ هر روزی که باد و بوران باشد، کچل سرش را می‌شوید.

● بە یەکێکی وەخت نەناس ئەوترێ.

**٥٨- هەر رۆشنایی‌یەک سێوەرێ ئەخا.**

○ هر نوری، سایه‌ای می‌اندازد.

● **واته:** مرۆڤی جوامێر سێبەری هەیە و کەسانی موحتاج لەو سێبەرەدا ئەحەسێنەوە.

**٥٩ـ هەر رێگەیەکیان بە رێبوارێک سپاردگە.**

○ هر راهی را به رهروی سپرده‌اند.

● **واته:** بە هەر کەسێ کارێک راسپێردراوە.

**٦٠ـ هەر زاڵمێ زەواڵێکی بۆ هەس.**

○ هر ظالمی زوالی دارد.

● **واته:** زاڵم تا سەر ناتوانێ بە زوڵمی خۆی درێژەبداتو لەئاکامدا نابوود ئەبێ.

**٦١ـ هەرزان بایی، بێ مەڵامەت نی‌یە!**

○ چیز ارزان، بی علّت نیست.

● **واته:** چتی هەرزان هۆیەکی تێدایە، هەرواکە چتی گران بێ حیکمەت نی‌یە.

**٦٢ـ هەرزە بە خەیاڵ ماڵ نەمەبۆ، هەورێشم وە پۆی دەوار نەمەبۆ، لەلای نـۆ کیسە تامڵ نەمەبۆ.**

○ هرزه با خیال صاحب مال نمی‌شود، ابریشم پود چادر نمی‌شود، نزد نو کیسه معطل ماندن بی سود است.

● **واتـه:** کەس بە خەیاڵ نابێ بە خاوەن ماڵ، چتی بە نرخ نابێ بدرێ بە پـۆی چـتی بێ‌نرخدا، نۆکیسەش پیاوەتی لە دەس نایە.

**٦٣ـ هەرزە چەنەیان خستە ناو ئاگر جەحانم، وتی دارەکەی تەرە!**

○ یاوه‌گو را در آتش جهنم انداختند، گفت هیزمش‌تر است.

● **واته:** زۆر وێژ لە هیچ کاتێکدا لە زۆر وێژی ناکەوێ.

**٦٤ـ هەر سیر بخوات و سورنا بژەنێ!**

○ بگذار سیر بخورد و سُرنا بزند.

● **واته:** با هەر بە قسەی بێ‌جێگە خۆی هیلاک کا.

**٦٥ـ هەرکوچکێ لە ئاسمانەو دائەکەفێت، ئەدات بە تەوق سەر منا!**

○ هر سنگی از آسمان سقوط کند، بر سر من فرو می‌افتد.

● **واتە:** هەر بەڵایەك پێش دێ، بۆ منە.

**٦٦ـ هەرکوێنە ئاشە، کەچەڵ فەراشە.**

○ هر کجا آش است، کچل فرّاش است.

● بە یە کێك ئەوترێ کە بۆ خواردن سەر بکا بە هەموو درگایە کدا و خۆی لەو جێگادا بە کار کردن سەر قاڵ بکا.

**٦٧ـ هەرکە ئێژێ برویشە، تۆ بانی داپۆشە.**

○ هر کس می‌گوید بلغور است، تو روی آن را بپوشان.

● **واتە:** هەرکەس لەو بارەوە قسە ئەکا، تۆ قسە مەکە.

**٦٨ـ هەرکە ئێژێ گاڵ، تۆ بخزە ماڵ.**

○ هر کس می‌گوید ارزن، تو به خانه برو.

● **واتە:** هەرکەس لەو بارەوە قسە ئەکا، تۆ قسە مەکە.

**٦٩ـ هەرکە ئێژێ گەنم، تۆ بپەنم.**

○ هر کس می‌گوید گندم، تو خفه شو.

● **واتە:** هەرکە لەو بارەوە قسە ئەکا، تۆ قسە مەکە.

**٧٠ـ هەرکە بتاشێ سەر لە سێ شەمە، سەرش مەبرا بە داس و قەمە!**

○ هرکس سه شنبه سرش را بتراشد، سرش با داس و قمه بریده می‌شود.

● **واتە:** سێ شەمە سەر مەتاشە. بۆچی ؟!

**٧١ـ هەرکە بە تەمای خاڵۆو مامۆ بێ، ئێوارە بێ نان سۆزی بێ دۆ بێ!**

○ هرکس به انتظار دائی و عمو باشد، غروب بدون نان و فردا بدون دوغ خواهد بود.

● **واتە:** بە تەمای مەردم دانیشتن، یانێ هەمیشە دەس تەنگ و موحتاج بوون.

**٧٢ـ هەرکە بە تەمای مەشەیی شاوان بێت، دایم زک برسی دڵ بیاوان بێت!**

○ هرکس به انتظار مشهدی شعبان بماند، باید همواره شکم گرسنه و بی حال باشد.

● **واته:** به تەمای خەڵك دەس لە کار و هەوڵدان مەکێشە.

**٧٣ـ هەرکە بە تەمای هاوسا ماڵی بێ، کوانگی خامۆش هۆری خاڵی بێ.**

○ هرکس به انتظار همسایه باشد، اجاقش خاموش جوالش خالی خواهد بود.

● **واته:** بە کەس پشت مەبەسە، غەیری غیرەتی خۆت.

**٧٤ـ هەرکە پیری نی‌یە، پیرێ بسێنێ.**

○ هرکه پیر ندارد، پیری خریداری کند.

● **واته:** پیر بۆ ماڵ وەکوو گەنجێکی نایابە، ماڵی بێ پیر بێ پشتیوانە.

**٧٥ـ هەرکە ترسیا، نەخلیسکیا.**

○ هر که ترسید، نلغزید.

● **واته:** هەرکە دووربینی بکاو زوو بۆ هەرچی کارە تێوە نەچێ، کەمتر تووشی هەڵە ئەبێ.

**٧٦ـ هەرکە تۆریا، بەشی خوریا.**

○ هرکس قهر کرد، سهمش خورده شد.

● **واته:** کەسێ بتۆرێ بەشی ئەخورێ.

**٧٧ـ هەرکەس ئەکا، کاڵە بروێش، تۆ جلێ بە سەر خوەتا بکێش.**

○ هر کس بلغور می‌سازد، تو چیزی روی سرت بکش.

● **واته:** چونکە تۆ ناتوانی کار بکەی وەختی کار کردنی خەڵك خۆت بشارەوە با ئابڕووت نەچێ و شەرمەزار نەبی.

یا: لە خەڵك عەیب مەگرە، چونکە خۆت بێ‌عەیب نیت.

**٧٨ـ هەرکەس بزنێکی هەس، خەمێکی هەس.**

○ هر کس بزی دارد، غمی دارد.

● **واته:** هەرکە بە ئەنازەی خۆی خەمی هەیە، لە کەم، کەم و لە زۆر، زۆر.

**٧٩ـ هەرکەس بە ئەنازەی هاوباز خوەی.**

○ هر کس به اندازه همباز خودش.

● **واته:** هەرکەس بە ئەنازەی هاوهێز و هاوتوانی خۆی.

**٨٠ـ هەرکە بە مەویژێ نەزانێ، بە کەویژێ نازانێ.**

○ هرکس قدر شناس یک دانه مویز نباشد، قدرشناس یک ظرف مویز نیز نخواهد بود.

● **واته:** هەرکەس بە کەم نەزانێ بە زۆریش هەر نازانێ.

**٨١ـ هەرکەس بەرز بفرێ، نزم ئەنیشێ.**

○ هر کس بلند پروازی کند، سرنگون می‌شود.

● کەسێکی خۆبین و بەرزەفڕ، زوو تووشی کۆسپ ئەبێ.

**٨٢ـ هەرکەس بەر کەوت، سەر کەوت.**

○ هرکس جلو افتاد، پیش برده است.

● **واته:** لە هەوڵی ژیاندا، ئەوەی زۆرتر تێ‌بکۆشێ، سەرکەوتووتر ئەبێ.

**٨٣ـ هەرکەس پەر تاوسی گەرە کە، ئەشێ جەور هیندوستانیشی بۆ بکێشێ.**

○ هر کس پر طاووس می‌خواهد، باید جور هندوستان را نیز بکشد.

● **واته:** کەسێ ئەگەر ئەیەوێ بە چتێکی دڵخوازی خۆی بگا، ئەبێ عەزیەتی بەدەس هێنانیشی بە ئەستۆ بگرێ.

**٨٤ـ هەرکەس تاکەوشێکی لە دیوانا بێت، تری پێوە لێ ئەدات.**

○ هر کس لنگه کفشی در دیوان داشته باشد، به آن فیس و افاده می‌فروشد.

● **واته:** کەسێ خزمێکی لە دەربار‌دا بێ، پێوەی ئەنازێ و خۆی پێوە هەڵئەکێشێ.

**٨٥ـ هەرکەس چاڵ بۆ یەکێ هەڵکەنێ، خوەی تێ‌ئەکەفێ.**

○ هر کس برای دیگری چاه بکند، خودش در آن می‌افتد.

● **واته:** ئاکامی خراپەکردن، ریشی خاوەنی ئەگرێتۆ.

**٨٦ـ هەرکەس چووە شارکوێران، ئەشێ دەس بگرێ بە بان چاویەو.**

○ هرکس به شهر کوران برود، باید روی چشمش دست بگذارد.

● **واتە:** ئەگەر گەرەکتە رسوا نەبی، هاوڕەنگی جەماعەت بە.

**٨٧ـ هەرکەس سمێڵی سوور بێت، هەمزاغا نیيە.**

○ هرکس سبیلش سرخ باشد، حمزه آقا نیست.

● **واتە:** لە یەك چوونی رواڵەتی دوو چت، نەتبا بە هەڵەدا.

**یا ئەڵێن:** هەرچی سمێڵ سوورە، هەمزاغا نیيە. هەر سمێڵ سوورێ هەمزاغا نیيە.

**٨٨ـ هەرکەس سەرەن بکا، هێڵەکی ئەکەن.**

○ هرکس مردم را بپالاید، او را ریزتر می‌پالایند.

● **واتە:** هەرکەس، مەردم بدا لە بەردی ئەزموون و لە بارەی خەڵکەوە بدوێ، خەڵکیش ئەیدەن لە هێڵەکی ئەزموون و ورد تریش لە بارەیەوە ئەدون.

سەرەن: هێڵەکی زبر بێژە.

**٨٩ـ هەرکەس شەش گرەم نانی خواردوێ،ئەشێ گرەمێ عەقڵی بوێت.**

○ هر کس شش گرم نان خورده باشد، باید یک گرم عقل داشته باشد.

● **واتە:** لە مرۆڤ چاوەڕوانی عەقڵ و تێ گەیشتن ئەکرێ.

**٩٠ـ هەرکەس کاڵەک ئەخوا، ئەشێ لە پای لەرزیشیا دانیشێ.**

○ هرکس خربزه می‌خورد، باید پای لرزش هم بنشیند.

● **واتە:** هەرکەس دەس بە کارێکەوە ئەدات ئەبێ چۆنیەتی ئاکامی ئەو کارەیش بە ئەستۆ بگرێ.

**٩١ـ هەرکەس کوێر نانە،کوێر ئیمانە.**

○ هرکس خسیس است، ایمانش ضعیف است.

● **واتە:** مرۆڤی چرووك و رژد، ئیمانی سسە.

**٩٢ـ هەرکەس کەر بێ، ئەوکۆپانە!**

○ هرکس خر باشد، او پالان است.

● بە یەکێکی زیرەک ئەوترێ کەلە هەر هەلێ بە سوودی خۆی کەڵک وەرگرێ.

**٩٣- هەرکەس کەرە، ئێمە کۆپانین!**

○ هرکس خر است، ما پالان هستیم.

● **واتە:** هەرکەس ئەبێ بە بەرپرس با بێ، ئێمە کارمان نی‌یە و بەهرەی خۆمانی لێ وەر ئەگرین.

**٩٤- هەرکە گورگ نەوێ، سەگ گەل ئەیخوەن.**

○ هرکس گرگ نباشد، سگها او را می‌خورند.

● **واتە:** لە ناو کۆمەڵی بەسیت و بێ فەرهەنگ‌دا ئەگەر کەسێ دڕ نەبێ بەشی لەخورێ.

**٩٥- هەرکەس گوێز لە هەوانەی خوەی ئەژمێرێ.**

○ هرکس گردو از انبانهٔ خود می‌شمارد.

● **واتە:** هەرکەس لە روانگەی خۆیەوە بۆ مەردم ئەڕوانێ.

**٩٦- هەرکەس گوێزی لە هەوانە بێت خوەی ئەژینێ.**

○ هرکس گردو در انبانه داشته باشد، خود را اداره می‌کند.

● **واتە:** هەرکەس هەوڵێکی دابێ، خۆی ئەژینێ.

**٩٧- هەرکەس لە خوەی بگرێتەو، خوایش لەوی ئەگرێتەو.**

○ هرکس مال خود را از خود دریغ کند، خدا نیز از او پس خواهد گرفت.

● **واتە:** مرۆڤی رژد و ماڵ خۆنەخۆر، خوا لێی ئەگرێتۆ.

**٩٨- هەرکەس لەکراس خوەیا پیاگە.**

○ هرکس در پیراهن خودش مرد است.

● **واتە:** هەرکەس بۆ خۆی رێز و ئیحتیرامێکی هەیە و نابێ بە چاوی سووکی‌یەوە بۆ کەس بڕوانی.

**٩٩- هەرکەس لە ماڵا نەوێ، ژنەکەی ئانە شوو!**

○ هرکس در خانه نباشد، زنش را شوهر می‌دهند.

● واتە: پیاوێ کە نە کەوێتە ماڵ، بۆ ژنەکەی قسە دروس ئەکەن.

**١٠٠ـ ھەرکەس ھەڵئەسا پلەی ئەگا، بلەیش ھەڵئەسا، خولەی ئەگا!**

○ هرکس بلند می‌شد به «بله» (ابراهیم) تجاوز می‌کرد، بله نیز می‌رفت و به «خوله» (محمود) تجاوز می‌کرد.

● واتە: ھەموو کەس بەو کەسە ئیرەو ئەو کەسەیش بە یەکێکی فەقیرتر لە خۆی ئیرە.

**١٠١ـ ھەرکەسێ کردی بێگانە بە خوێش، کردی بە سەریا خوەڵ بە دەسی وێش،**

○ هر کسی با بیگانه خویشاوندی کرد، با دست خود بر سر خود خاک ریخته است.

● واتە: بێگانە جێگای باوەڕ نی‌یە و لەگەڵیا پێوەندی مەکە.

**١٠٢ـ ھەرکەسێ کەسە، قسەیەکی بەسە.**

○ هر کسی کس است، او را حرفی بس است.

● واتە: مرۆڤی زانا و تێگەیشتوو بە ئیشارەیەک تێ ئەگا.

**١٠٣ـ ھەرکە فرەگەریا، یاکۆڵ تێرێتەو یا زۆڵ!**

○ کسی که زیاد این طرف وآن طرف برود، یا کوله بار می‌آورد یا حرامزاده.

● واتە: مرۆڤی زۆرگەڕیە یا بار تێرێتۆ یا سووکی و رسوایی.

**١٠٤ـ ھەرکەلێ سەختە پرۆ بیگرە!**

○ هر گردنه‌ای سخت است، برو بگیر.

● واتە: چیت لە دەس دێ دەرحەقی من بیکە و لە ناپیاوی درێغ مەگە.

**١٠٥ـ ھەرکە ھاتگە لەم بەرەو بەرەو، کوتێکی داگەسە باجی گەوھەرەو!**

○ هر کسی از اینجا عبور کرده است، دستی به باجی گوهر رسانده است.

● بە یەکێکی فەقیرۆ کە ئەوترێ کە ھەرکە ھەڵسێ روویەکی لێ بخاو بەبێگاری یەگی بکێشێ.

**١٠٦ـ هەرگ نم دریاگ، ئاوێکی بەسە.**

○ گِل نم داده را آبی بس است.

● **واتە:** ئەو کەسە کە قسەت پێ کردووە، ئیتر بەسیەتی و لە سەری مەڕۆ.

**١٠٧ـ هەرگولێ بۆیەکی هەس.**

○ هر گُلی بویی دارد.

● **واتە:** هەر کەس نەوعە خۆیەکی تایبەتی هەیەو هەموو کەس وەك یەك نین.

**١٠٨ـ هەرگوێرەکە، ئەوێتە گا.**

○ گوساله گاو می‌شود.

● **واتە:** منالّ رۆژێ گەورە ئەبێ، کەوا بوو نابێ بە چاوی سووکی‌یەوە بۆ منالّی ئەمرۆ بڕوانی.

**١٠٩ـ هەرگ هەسە، بە هەتکوو دەسە!**

○ گِل غلیظ با هر دو دست.

● **واتە:** تورِ بە سەرمان بۆ ئەم کارەساتە وا بۆمان پێش هاتووە.

**١١٠ـ هەر لە عەرش هەتا قورش، کەس بە دۆی خوەی نایەژێ تورش.**

○ از عرش تا کرسی، هیچ کس به دوغ خود نمی‌گوید ترش.

● **واتە:** هیچ کەس مآلی خۆی قەلّب نادا لە قەلّەم.

**١١١ـ هەر مەلێ مێوە خوەر بێ، مێوە بە دارەو نامێنێ.**

○ هر پرنده‌ای میوه‌خوار باشد، میوه روی درخت نمی‌ماند.

● **واتە:** هەر کەس ئەهلی ئەو کارە نی‌یە.

**١١٢ـ هەر نمامە، ئەوێ بە دار.**

○ هر نهالی، درخت می‌شود.

● **واتە:** هەر منالّێ گەورە ئەبێ.

**١١٣ـ هەر نەهاتی، وەختێ هاتی، وەک دمەلّ دەرهاتی!**

○ نیامدی، وقتی آمدی، چون دمل درآمدی.

● **واته:** هەر نەهاتی بۆ لای من، وەختێکیش هاتی زۆر ناوەخت و بێ جێگە هاتی.

**١١٤ـ هەر وەخت کەر بە پەیـنجەدا سـەرکەفت، وەوی و خـەسوویش سـازیان تێت!**

○ هر وقت خر از نردبان بالا رفت، عروس و مادر شوهر نیز سـازگاری پـیدا می‌کنند.

● بە رای من قسەیەکی تەواو دروس نی‌یە.

**١١٥ـ هەر وەسە ئاگر ژێر کا.**

○ به آتش زیر کاه می‌ماند.

○ بە یەکێکی فێڵباز و دغەڵ و شەڕ هەڵگرسێنەر ئەوترێ کە بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ شەڕ و ئاژاوە لەبەینی خەڵکا چاخ بکا.

**١١٦ـ هەر وەسە گوڵۆڵە موو، دەوڵەت باوکی دایە شوو.**

○ به گلولهٔ مو شبیه است، ثروت پدری او را شوهر داد.

● **واته:** کچی پیاوی دەوڵەمەن ئەگەرچی ناشیرینیش بێ، بە هۆی سەروەتی باوکیەوە، هەر شووی بۆ پەیدا ئەبێ.

**١١٧ـ هەرەشە نیمەی مەردییە.**

○ تهدید نصف مردانگی است.

● **واته:** هەر، شەڕ کردن پێویست نی‌یە، بەڵکوو بەعەزە جارێ هەڕەشە کردن، جێگەی شەڕ ئەگرێتۆ.

**١١٨ـ هەر هێڵێ لارە خەتای گا سوورە.**

○ هر خط شخمی که کج باشد، تقصیر گاو سرخ است.

● **واته:** هەر هەڵەیەک روو ئەدا ئەخرێتە ئەستۆی یەکێکی تایبەتی‌یەوە.

**یا ئەڵێن:** هەر هێڵێ چەفتە، کار گا زەردە.

**١١٩ـ هەزار تەڵەی بە کلک تەقاندگە!**

○ هزار تله را با دُم خنثی کرده است.

● به یه‌کێکی فێڵباز ئه‌وترێ، که خۆی نه‌خاته‌گیری هیچ داوێ.

**١٢٠ـ هەزار حەکیم ئەونەی دەردەدارێ نازانێ.**

○ هزار پزشک به اندازۀ یک مریض نمی‌داند.

● **واته:** دەردەدار ئەزانێ کوێی ئێشێ.

**١٢١ـ هەزار دۆس و یەک دوژمن.**

○ هزار دوست و یک دشمن.

● **واته:** دوژمن یه‌کێکیشی هه‌ر زۆره، هه‌رواکه دۆس، هه‌زاریشی که‌مه.

**١٢٢ـ هەزار سووزن گاوەسنگێکی تیا ناوێت.**

○ هزار سوزن، گاو آهنی نمی‌شود.

● **واته:** هەزار ئەولادی خوێڕی بە باوکێکی ئازا و لێ‌هاتوو نابێ.

**یا ئەڵێن:** هەزار سووزن بەگاوەسنگێ ناوێت.

**١٢٣ـ هەزار فاتیحە بە ئەنگووسێ هەڵوا ناوێ.**

○ هزار فاتحه، یک انگشت حلوا نمی‌شود.

● **واته:** تێر کردنی زکی برسی پێویسته نه‌ک دۆعا خوێندن بۆ ئه‌و.

**١٢٤ـ هەزار فیتم، بە فیتێکت!**

○ هەزار سوتم، به یک سوتت.

● به یه‌کێکی فێڵباز و ساخته‌چی ئه‌وترێ، که تۆ له ئاستی ئه‌و ده‌ر نه‌یی.

**١٢٥ـ هەزار قول‌وەاللە بە کەوچکێ دۆخوا ناوێ!**

○ هزار قل هوالله قاشقی دوغینه نمی‌شود.

● **واته:** من ئه‌مڕۆ برسیمه و پێویستم به نانه، که‌چی تۆ خه‌ریکی دۆعـای خـێرم بـۆ ئه‌که‌ی!

**١٢٦ـ هەزار کەڵەشێر نەخوێنێ، هەر رۆژ ئەوێتەو.**

● هزار بار خروس نیز نخواند، صبح فرا خواهد رسید.

● **واتە:** بە قسەی من و تۆ رەوتی سروشت ناشێوێ.مەبەست ئەوەیە تۆیش نەیەژی ئەو کارە هەر ئەنجام ئەبێ.

**١٢٧ـ هەزار گوناح و یەک تۆبە.**

○ هزار گناه و یک توبه.

● **واتە:** هەرچی خەتام کردووە لێی پەشیمانم و داوای لێبووردن ئەکەم.

**١٢٨ـ هەزاری بمرێ لە باوان، کلەی نابرگێ لە چاوان!**

○ هزار نفر از خانوادۀ پدریش بمیرد، سرمه از چشمش پاک نمی‌شود.

● بە ژنێکی دڵ تەڕ و بێعار ئەوترێ کە لە هیچ کاتێکدا لە رەنگ و ڕۆن و ئارایشی خۆی نەکەوێ.

**١٢٩ـ هەست درێغ مەکە، نی‌یەست قەرز مەکە.**

○ داری دریغ مکن، نداری قرض مکن.

● **واتە:** لە کاتی دەس‌ڕۆیشتنا، لە خۆت درێغت نەبێ و پیاوەتیش بکە، لە نەبوونیشت دا خۆت مەخە ناو قەرز و فەرزەوە و بە کەم قەناعەت بکە.

**١٣٠ـ هەشت لە مشت، نەک نۆی لە پشت.**

○ هشت در مشت، نه نُه در پشت.

● **واتە:** کەم و نەخت، باشترە لە زۆر و قەرز.

**١٣١ـ هەڵپەرکێ نازانێ و ئێژێ حەوشەکەی لارە!**

○ رقص بلد نیست و می‌گوید حیاطش ناهموار است.

◘ **بروانە بۆ پیتی «ن»:** نازانێ هەڵپەڕێ و ...

**١٣٢ـ هەڵوا بۆ گەرمیت، بۆ نەرمیت، بۆ شیرینیت، بۆ چەوریت!**

○ حلوا با این ویژگیهایت: گرمی، نرمی، شیرینی، چربی.

● بە یەکێکی سازگار و نەرم خۆ و خۆش خولق ئەوترێ.

مانای تەوسیش ئەدا بۆ کەسێکی فەقیرۆکەو هەژار.

**١٣٣ـ هەڵوا خوەر پای تاوت.**

○ حلوا خور پای تابوت.

● بە کەسێ ئەوترێ کە لە مەرگی یەکێ شاد بێ بۆ ئەوەی چتێکی دەس کەوێ.

**١٣٤ـ هەڵوا، هەڵوا دەم شیرین!**

○ حلوا، حلوا، دهن شیرین.

● **واتە:** بە وتنی هەڵوا، دەم شیرین نابێ.

**١٣٥ـ هەڵۆ بیشسووتێ، ناچێتە سێوەر هێلانەی قاڵاو!**

○ عقاب اگر هم از گرما بسوزد، به زیر سایهٔ لانه کلاغ پناه نمی‌برد.

● **واتە:** مرۆڤی ئازا و بەغیرەت ئەگەر بیشمرێ، پەنا بۆ لای نامەرد نابا.

**١٣٦ـ هەلووک و دار هەلووکن.**

○ به دو قطعه چوب کوچک و بزرگ بازی الک دولک شبیه‌اند.

● بە دوو کەسی باڵابەرزو کورتەباڵا ئەوترێ کە لە پەنای یەکەوە ڕێستابێتن و نەکەونە یەکێ.

**١٣٧ـ هەم خوای گەرەکە و هەم خورما!**

○ هم خدا را می‌خواهد و هم خرما.

● بە یەکێک ئەوترێ هەم دینی گەرەک بێ و هەم دنیا.

**یا:** لە هەر دوو چتێک کە باسی لێ ئەکەن گەرەکی بێ.

**١٣٨ـ هەمزە بە هەواس‌یەو چە ؟ ترێشتە بە تەور داس‌یەو چە ؟**

○ حمزه به عبّاس و تیشه به تبر داس چه ارتباطی دارد ؟

● **واتە:** ئەو دوو قسە یا ئەو دوو کەسە هیچ پێوەندی‌یەکیان بە یەکۆ نی‌یە.

**١٣٩ـ هەم شوکر بە کەفەن دز بەرگ.**

○ شکر به کفن دزد قبلی.

▣ **بروانە بۆ پیتی «ش»:** شوکر بە کەفەن دز بەرگ.

**۱۴۰ـ هەم لە ناڵ ئەدات، هەم لە بزمارا!**

○ هم به نعل می‌زند، هم به میخ.

● بە یەکێکی ساختەچی ئەوترێ کە بە هەر دوو بارا قسە بکا.

**۱۴۱ـ هەموو ڕێگەیەک بۆ بانە ئەچێ!**

○ همهٔ راهها به بانه ختم می‌شود.

● **واتە:** هەموو ئەو قسانە یا ئەوکارانە بە یەک نەتیجە ئەگا.

**۱۴۲ـ هەمیشە خوەر لە پشت هەورەو نامێنێتەو.**

○ همیشه آفتاب در پشت ابر نمی‌ماند.

● **واتە:** حەقیقەت بۆ هەمیشە گوم نابێ.

**۱۴۳ـ هەنگور چاو ئەورێ لە هەنگور، ئاو ئەگرێ.**

○ انگور به انگور می‌نگرد، آب می‌گیرد.

● **واتە:** مرۆڤ لە مرۆڤ دەرس وئەزموونی ژیان وەرئەگرێ وگەشە ئەسێنێ.

**۱۴۴ـ هەنی دا ژێر باڵی!**

○ هندوانه زیر بغلش گذاشت.

● **واتە:** بە درۆ بە شاخ و باڵیا هات بۆ ئەوەی فریوی بدا.

**۱۴۵ـ هەواڵیان برد بۆ میران ؛کارەکەر،کارەکەری ئەگیران!**

○ خبر دادند به میران ؛ کلفت، کلفتی برای خود اجیر می‌کرد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە خۆی بۆ کەسێ کار بکاو کەسێکی‌تر بگرێ کارەکانی ئەو ئەنجام بدا.

**۱۴۶ـ هەورامی کۆڵ خۆ خوەرا!**

○ اورامیی که از کوله بار خودش می‌خورد.

● بە یەکێک ئەوترێ کە دەست بکا بە خواردنی ئەو خواردەمەنی‌یە وا خۆی بە دیاری بۆ کەسێک یا بۆ ماڵێکی هاوردبێ.

**۱۴۷ـ هەورت بویٚ وەلیٚ بارانت نەویٚ.**

○ ابر داشته باش ولی باران نداشته باش.

● **واته:** خۆت تووڕە کە بەڵام بارانی زەرەر و عەزیەت مەڕیژە بە سەر خەڵکدا.

**۱۴۸ـ هەور سوور بارانی دوور.**

○ ابر سرخ بارانش دور است.

● **واته:** هەر واکە لە هەوری سوور خێرا باران نابارێ لە کەسێکی زۆر تـووڕەیش، چاوەڕێی خێرێکی زوو مەبە.

**۱۴۹ـ هەوەڵ بەخت و تیکەی نەخت.**

○ اوّل بخت و لقمهٔ نقد.

● **واته:** بەختی ئەوەڵ لە دەس مەدە.

**۱۵۰ـ هەوەڵ جێگەی رم بوینە، ئەوسا رم بچەقنە.**

○ اوّل جای تیر را ببین، آن گاه تیر را بنشان.

● **واته:** هەر کارێ ئەکەی، تێبینی دوایی بکە.

**۱۵۱ـ هەو هەوسوار گەل چەی کرد، تا شڵپەی پیرەژن چە بکا!**

○ هَو هَو سواران چه کار کرد، تا سر و صدای پیرزن بخواهد کاری کند.

● **واته:** لە جێگەیەکدا مرۆڤە ئازاکان کارێکیان لە دەس نەهات، ئیتر نەتوانکارەکان چیان پێ ئەکرێ ؟

**۱۵۲ـ هەوە، هەوە جوان ئەکا ؛ هێوەرژن، هێوەرژن زۆر زان ئەکا.**

○ هَوو، هَوو را جوان می‌کند ؛ زن برادر شوهر، زن بردار شوهر را دانا می‌کند.

● **واته:** هەوە لە رقی هەوە خۆی ئارایش ئەکا و دەس تێرێ بە خۆیا و هێوەرژنیش بەکرداری خۆی هێوەرژن هان ئەدا بۆ تێ گەیشتن و خێرایی.

**۱۵۳ـ هەویر هەڵ نەهاتگ، نانی فەتیرەس.**

○ خمیر ور نیامده، نانش فطیر است.

● **واته:** هەموو ئاکامێکی دڵخواز، سەبر و تەحەممولی گەرەکە.

**١٥۴ـ هەی هەی دوای گورگە!**

○ هی هی پس از گرگ است.

● **واتە:** دوای رووداوە کە، هاوار کردن بێ سوودە.

**١٥٥ - هیچ کەس لە پرێ ناوێتە کورێ.**

○ هیچ کس ناگهان کس نمی‌شود.

● **واتە:** گەیشتن بە ئامانج، زەحمەت و زەمانی ئەوێ.

**١٥۶ـ هیچ کەس نایەژێ خالۆکەرت بە چەنێ ؟**

○ هیچ کەس نمی‌گوید دائی خرت به چند ؟

● **واتە:** کەس نرخی بۆ دانانێ وگوێی پێ نادەن و لێی ناپرسن.

**١٥٧ـ هێشتا لە دەمی بۆی شیر تێ.**

○ هنوز از دهانش بوی شیر می‌آید.

● به یەکێکی خاو و بێ تەجروبە ئەوترێ.

**١٥٨ـ هێشتا منالی و هێلانە نشین، نەت‌داگە سای باڵ زەوینە و زەوین.**

○ هنوز بچهٔ لانه نشین هستی و بالت را بر سر زمینها نگسترانیده‌ای.

● **واتە:** تۆ منالی و بێ تەجروبە و دنیات نەدیوە.

**١٥٩ـ هێلانە مەشێونە با هێلانەت نەشێوێ.**

○ لانه خراب مکن تا لانه‌ات خراب نشود.

● **واتە:** ماڵی مەردم مەشێوێنە،با ماڵت نەشێوێ. ئازارت بـۆ کـەس نـەبێ بـاتووشی تۆڵەوئازاری رۆژگار نەبی.

**١۶٠ـ هیلکە بە ژێر باڵ ئەورژنێ!**

○ تخم مرغ را با حرارت زیر بغل می‌پزد.

● به یەکێکی گەنج و بە هێز ئەوترێ.

**١۶١ـ هێلکە دز ئەوێتە وشتر دزا**

○ تخم مرغ دزد شتر دزد می‌شود.

● **واتە:** ئەو کەسە چتی بچووک ئەدزێ، کەم کەم فێر ئەبێت و چتی گەورەیش ئەدزێ.

**١٦٢ـ هێلکە لە قەل ئەدزێ.**

○ تخم مرغ از کلاغ می‌دزد.

● بە یەکێکی چاوبەس و زیرەک ئەوترێ.

**١٦٣ـ هێلکە و رۆن دروس کەی بۆ کەر گوێچکەی تێ ئەنێ!**

○نیمرو برای خر درست کنی، گوشش را در آن می‌نهد.

● **واتە:** قەدری هەر چتێ، ئەهلی خۆی ئەیزانێ.

**١٦٤ـ هێلکە و رێقنە بران.**

○ تخم مرغ و فُضله برادرند.

● **واتە:** لە باوک و دایکێ مومکینە دوو منالّی خاس و خراپ بکەونەوە.

**١٦٥ـ هێلکەی ئیمرۆ لە جوجەڵەی سۆزی خاسترە.**

○ تخم مرغ امروز از جوجهٔ فردا بهتر است.

● **واتە:** نەخت ئەگەرچی کەمیش بێ، باشترە لە قەرزی زۆربەلاّم دوور.

**١٦٦ـ هێلکەی بۆ خەڵکە و رێقنەی بۆ خوەمان!**

○ تخم مرغش برای مردم است و فُضله‌اش برای خودمان.

● بە کەسێک ئەوترێ کە خێر و بێرەکەی بۆ بێگانە بێ و ناخۆشی و عەزیەتەکەی بۆ میللەتەکەی خۆی. وەکوو ئەوکەسانە وا لە وڵاتی خۆیان دەرئەچن بۆ وڵاتی بێگانە و ئەگەر کارێکیان لەدەس بێ ئەیکەن بۆ غەریبەکان، بەڵام کاتێ کە ئەمرن مەیتەکەیان تێرنەوە بۆ کۆنە هەوار!

**١٦٧ـ هیلکەی قازە و بازکردگیە!**

○ تخم غاز است و باز آن را گذارده است.

● بە تەوس ئەوترێ بە یەکێکی بەدەعیە کە لە بنەماڵەیەکی بێ‌ناو و نیشان بێ بەڵام خۆی لێ گۆڕابێ.

**١٦٨ـ هێڵ لار ها لە قنگ گا پیرا.**

○ خط کج شخم، در سمت گاو پیر است.

● **واتە:** هەڵەی کۆمەڵ لە چاوی پیرانی ئەوگەلەوە ئەبینرێ.

**یا ئەڵێن:** هێڵ لار ها لە ژێر سەرگای پیرا.

**١٦٩ـ هین خودم بۆ خودم، هین خەڵکیش وەک هەڵوا ئەخودم!**

○ مال خودم برای خودم، مال مردم را نیز مثل حلوا می‌خورم.

● بە یەکێکی زۆردار ئەوترێ کە ماڵی مەردم وەکوو هەڵوا بخوا.

**١٧٠ـ هینەکەی تۆ جلێ لە بانی، هینەکەی من دنیا پێ زانی!**

○ مال تو روپوشی بر آن، مال من را همه کس فهمید.

● **واتە:** عەیبی تۆ ئەبێ نادیار بێ، بەڵام عەیبی من هەموو کەس پێی بزانێ.

# ■ ی

۱ـ **یا بە هیمەت یا بە قیمەت.**

○ یا بە همّت یا بە قیمت.

● **واتە:** ئەو چتەمان یا بە پیاوەتی پێ بدە یا بابەتی ئەوە پارەمان لێ بسێنە و پێمان بدە.

۲ـ **یا پرسا وە، یا داناوە.**

○ یا بپرس یا دانا باش.

● **واتە:** ئەگەر چتێ نازانی بپرسە و ئەگەر ناپرسی، ئەبێ خۆت زانای ئەوکارە بی.

۳ـ **یا خوا ئەم دەس موحتاج ئەو دەس نەوێ.**

○ خدا کند این دست محتاج آن دست نشود.

● **واتە:** موحتاج بوون بە نزیکترین کەسیش بۆ مرۆڤ هەر دەردێکی گرانە.

۴ـ **یا خوا گەوج فێر هەڵپەرکێ نەوێت!**

○ خدا نکند احمق رقصیدن را یاد نگیرد.

● **واتە:** ئیتر دەس هەڵگر نی‌یە.

**٥- یا خوا هەر خوەش بێ دەنگی دلێران، رێوی راو نەکا لە جێگەی شێران.**

○ خدایا آوای دلیران همیشه خوش باد و روباه در جایگاه شیران شکار نکناد.

● **واتە:** ئومێدەوارین پیاوانی پیاو هەر خۆش بن و ناپیاو لە جێگەی ئەوانا سەر راس نەکاتۆ.

**٦- یا خوا هیچ کەس گولولەی نەکەفێتە لێژی.**

○ خدا کند هیچ کس گلوله‌اش به سرازیری نیفتد.

● **واتە:** ئەگەر کەسێ بەختی لێ هەڵگەڕێتۆ، هیچ کەس دیانی خێری پێدا نانێ.

**٧- یار باقی و سوحبەت باقی.**

○ یار باقی و صحبت باقی.

● **واتە:** عومرێ ببێ، بە یەک ئەگەین و پێکەوە قسەمان ئەبێ.

**٨- یا رۆمی رۆمی، یا زەنگی زەنگی.**

○ یا رومی رومی، یا زنگی زنگی.

● **واتە:** پیاوانە عەمەل بکە ؛ یا ئەم باری بە یا ئەو باری.

**٩- یارۆ نانی نەو بیخوا، پیازی ئەسەند!**

○ یارو نان نداشت بخورد، پیاز می‌خرید.

● بە یەکێک ئەوترێ کە پێویستی ژیانی نەبێ و بە چتی ناپێویستەوە خۆی خەریک بکا.

**١٠- یاسین بە گوێچکەی کەرا خوەندنە!**

○ یاسین به گوش خر خواندن است.

● **واتە:** ئەو قسە لە گەڵ ئەو کەسەدا بێ سوودە بیکەی چونکە حاڵی نابێ و خۆت هیلاک ئەکەی.

**١١- یا فێرم مەکە، یا فێرم ئەکەی تێرم کە.**

○ یا عادتم مده، و اگر عادتم می‌دهی سیرم کن.

● **واتە:** یا کەسێ بە چتێ عادەت مەدە، یا ئەگەر عادەتت دا، ئەبێ بە تەواوی لەو چتە بێ نیازی کەی.

**١٢ـ یا کاڵ تێ یا پەموو.**

○ یا ارزن می‌روید یا پنبه.

● **واته:** ئەو کارە یا ئەو قسە بکە، یاخاس ئەبێ یا خراپ.

**١٣ـ یا مەرد بە، یا لە پەنای مەردا بە.**

○ یا مرد باش، یا در پناه مرد باش.

● **واته:** یا خۆت مەرد بە، یا لە پەنای مەردانا بەسەر بەرە و فێری پیاوەتی بە.

**١٤ـ یەخ‌بەنان و سایەقە، شێر عەنتەری لایەقە!**

○ یخ بندان و آسمان صاف، شیر عنتر را می‌طلبد.

● **واته:** هەوا زۆر ساردە و عەرزیش یەخی بەستووە و کوڕی گەرە کە لەم وەختەدا بێتە دەرەوە و بە سەر ئەم عەرزەدا بڕوا.

**١٥ـ یەخ زمسانی لێ ناسێنگێ!**

○ یخ زمستان را نمی‌توان از او خرید.

● بە یەکێکی رژد و قیرسیچم ئەوترێ کەهیچ لەدەسی دەرنەیە.

**١٦ـ یەخە چاکی، پەشیمانی تێری.**

○ یقه چاکی، پشیمانی به دنبال دارد.

● **واته:** ئاکامی لات بازی و قەرەچناخی پەشیمانی‌یە.

**١٧ـ یەز دوورە، گەز نزیکە.**

○ یزد دور است، گز نزدیک است.

● **واته:** ئەر دەعیە وا ئەیکەی، فەرموو ئیسباتی بکە.

قسەی ئەوکابرا خۆهەڵکێشەیەکە لە جێگەیەکدا ئەیوت من لە شاری یەزدا دەگەز بازم داوەا یەکێ لێی هەڵپەڕی و وتی: کاکە یەز دوورە، گەز نزیکە. فەرموو نیشانی بدە بزانین چۆن دە گەز باز ئەبەی ؟

**١٨ـ یەک بین، چەقڵ چاو دوژمنین ؛ تەک بین، هەڵوای خواردنین.**

○ یکی باشیم، چون خاری در چشم دشمن هستیم ؛ منفرد باشیم‌حلوای

خوردنی خواهیم بود.

● **واته:** یەك بین و لە جیاوازی و دوژمنی دەس هەڵگرین با دوژمن زەفەرمان پێ نەبا.

**١٩ـ یەکێ ئەنەوێ لە پاشی، یەکێ ئەکێشێ تاکڵاشی!**

○ یکی از عقب او را می‌کشد و یکی لنگه گیوه‌ی وی را می‌کشد.

● **واتە:** هەر کە بە جۆرێ ئەیکێشن و زۆریان بۆ هاوردووە.

**٢٠ـ یەکێ، بە دوو ناوێ.**

○ یکی، دو تا نمی‌شود.

● **واتە:** یەك هەر یەکەو دوویش هەر دوو وە.

**٢١ـ یەکێ بێژە و دوان بژنەوە.**

○ یکی بگو دو تا بشنو.

● **واتە:** دوو ئەوەندەی ئەوە قسە ئەکەی، ئەبێ بژنەوی. هەر بۆ ئەوە زمانێکیان پێت داوە و دوو گوێ.

**٢٢ـ یەکێ چاڵ بکەنێ بۆ مەردم، خوەی تێ ئەکەفێ.**

○ کسی کە برای مردم چاە بکند، خودش در آن می‌افتد.

● **واتە:** هەر خراپەیەك بکەی، دووکەڵی چاوی خۆت ئەچێ.

**٢٣ـ یەکێ کەمە، دوان خەمە، سیان خاترجەمە.**

○ یکی کم است، دو تا غم است، سە تا خاطر جمع است.

● **واتە:** ئەگەر یەکێ بێ و بمرێ، دەردێکی گرانە؛ ئەگەر دوو بێ و یەکێکیان بمرێ ئەو مناڵەکەی تر بێ رەفیق ئەکەوێ و خەمێکی گەورەیە؛ ئەگەر سێ بن ئیتر خەمی لەبەین‌چوونی یەکێکیان ئەوەندە نی‌یە. ئەگەرچی وتوویانە: **هەرئە نگووسێ بورگێ، خوێن خوەی لێ تێ.**

**٢٤ـ یەکێکیان پێ نە ئەدا، داوای دوانی ئەکرد!**

○ یک دانە بە او نمی‌دادند، دو تا می‌خواست.

● به یه کێکی ته‌ماعکار و بێشه‌رم ئه‌وترێ که‌ده‌س هه‌ڵگرنه‌بێ.

**٢٥- یه‌کێکیان رێگه نه‌ئه‌دا ناو ئاوایی، هه‌واڵ ماڵ قێخای ئه‌پرسی!**

○ کسی را به ده راه نمی‌دادند، آدرس خانۀ کدخدا را می‌پرسید.

● به یه کێک ئه‌وترێ که له باسێکدا یا له جێگه‌یه کدا لێی نه‌پرسن و بایه‌خی پێ نه‌ده‌ن بەڵام ئه‌و له ناوه‌رۆکی باسه که قسه بکا.

**٢٦- یه‌کێ له شار ئه‌هاتۆ، له یه‌کێتر هه‌واڵ شاری ئه‌پرسی!**

○ کسی از شهر می‌آمد، از یکی دیگر خبر شهر را می‌پرسید.

● به یه کێکی بێ خه‌به‌ر و هیچ لێحاڵی نه‌بوو ئه‌وترێ.

**٢٧- یه‌کێ له شامۆ، یه‌کێ له شیراز ؛ خواکارێ ئه‌کاو ئه‌بن به‌هاوراز.**

○ یکی از شام، یکی از شیراز ؛ خدا کاری می‌کند و همراز می‌شوند.

● **واته:** که‌س نازانێ چاره‌نووس چۆنی نووسیوه، ژن و مێردێ ئه که‌ونه یه ک و ئه‌بن به هاوسه‌ر که هه‌رکامیان هی وڵاتێکن.

**٢٨- یه‌کێ ماڵی له شیشه بێ، کوچک ناگرێته ماڵ مه‌ردم.**

○ کسی که خانه‌اش شیشه‌ای باشد، سنگ به سوی خانۀ مردم پرتاب نمی‌کند.

● **واته:** که‌سێ که خۆی کچ و ژنی ببێ، به چاوی خه‌یانه‌ت بۆ ناموسی مه‌ردم ناڕوانێ.

**٢٩- یه‌کێ نه‌یه‌توانی مردگ بشۆرێ، خنه‌خنی خستووه زینگ!**

○ یکی نمی‌توانست مرده بشوید، زنده را به هِن هِن انداخته بود.

● به یه کێ ئه‌وترێ که نه‌توانێ کارێ بکا و ده‌وروبه‌ری خستبێته عه‌زیه‌ت.

پەند و قسەی پێشینیان:
- یادگاری پێشینانمانە، کە وەکوو گوارەیەک لە گوێماندایە و پێی ئەژین.
- لاپەڕەیە کە لە ناسنامەی مێژووی فەرهەنگی نەتەوە کەمان لەم جیهانە بەرینە دا.
- قسەی راستە قینە و لە کانگای دڵەوە هەڵقوڵیوە و لە دڵدا جێگە ئە گرێ.
- حەڵقەی پێوەندی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێ یە.
- چێژ و پاشبە ندی وتە کانمانە.
- دیاری یە بۆ کورد و کوردستان.

علی رُخزادی

# GWARA-I KORDAWARI

Kurdish Proverbs
By: Dr. Ali Rokhzadi

ISBN 964-06-1707-5
9 789640 617076

انتشارات کردستان
سنندج، پاساژ عزتی
تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲